# فێرست

**بابەت** **ژمارەی لاپەرە**

## پێشەکی:

الله بەشێوەیەک زەوی دروستکردووە کە نیعمەتەکانی بەشی سەرجەم مرۆڤەکان دەکات بەڵام داخی گرانم جیهانی سەرمایەداری ناهێڵن گشت مرۆڤەکان سوودمەند بن لەو هەموو نازو نیعمەتە،

یەکێک لە پلانە گڵاوەکانی سیستمی جیهانی کەلە ئێستادا ئەمریکا سەرۆکاری دەکات بریتییە لە کەمکردنەوە ڕێژەی دانیشتوانی زەوی وپاشان سنوردارکردنی.

بۆ ئەم کارەشیان ڕێگای جۆراوجۆر دەگرنەبەر:

هەڵگیرسانی جەنگ یەکێکە لەپلانە گڵاوەکانیان ، دیارە ئەمە هۆیەکی باشە بۆ کوشتن وتیاچونی خەڵکێکی زۆر ،هاوڕێ لەگەڵ ئاوارەبون وسەرلێشێوان و تێکچونی لانەی خێزان وبەمەش خێزان توانای زیادکردنی نامێنێت..

پلانی کرۆنا یەکێکی تر بو لەپلانەکانیان ، ئەوان وایاندانابوو بەم ڤایرۆسە نیوەی مرۆڤەکان قڕ دەکەن ، دەیان ڕاپۆرت باس لە گەشەسەندنی ئەو ڤایرۆسە دەکەن لە تاقیگەو پاشان بڵاو کردنەوەی ، ئەم ڤایرۆسەش نزیکەی چەند ملیۆنێکی لەمرۆڤایەتی کەمکردەوە ،بێگومان ئەم ڤایرۆسەش کۆتا ڤایرۆسی کوشندەش نابێت و هی تری بەدوادا دێت.

بانگەشەی جێندەر و ها و ڕەگەز بازی پلانێکی تری سیستمی جیهانییەو مەترسیدارترینیانە چونکە بڵاوبونەوەی جێندەر ڕێک یەکسانە بە هەڵوەشانەوەی خێزان و دواجاریش نەمانی لەدایک بون و ئیتر گەشەکردنی دانیشتوان سنوردار دەبێ تا ئاستی نەمان و تیاچوون.

**هەریەک لەم ڕێگایانەی گرتویانەتە بەر هاوڕێ یە لەگەڵ بەگەڕخستنی سەرمایەیەک دواتر بەدەستهێنانی داهاتێکی زۆر ،دەیان وسەدان کارگەی چەک لەم جەنگانە بازاڕیان گەرمە ، بە ملیاران دۆلار بەدەستهاتووە لە ئەو ڤاکسینەی دروستیان کردووە ، باسی بەدەستهێنانی پارە لەباسی سێکس ڕونە لای هەمومان کە ڕێژەیەکی خەیاڵییەو بە سەدان ملیۆن کچ و ئافرەتیان کردووەتە کۆیلەی مۆدێرنەو بازرگانی پێدەکەن.**

**کەواتە ئەم سیستمە جیهانییە هەم لەخەمی بەدەستهێنای پارەیەو هەمیش لەخەمی کەمکردنەوەی مرۆڤایەتییە تا ئەوەی سەرمایە بەش بکا..**

**ئێستا دەپرسین ئایا ئەو نیعمەت و ڕزقەی سەر زەوی بەس نییە بۆ تەواوی مرۆڤایەتی؟**

**ئایا ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ دابەش کردنی داهات دادپەروەرانە و چینایەتی نەهێڵین پێویست دەکات مرۆڤایەتی بەو شێوەیە بە هیلاک ببرێ؟**

**لەئێستادا سەدا شەستی داهاتی زەوی لە لای چەند کەسێکە و ئەوانیش بۆ مانەوەو زیادکردنی بونەتە ئەژدیهای گیانی باقی خەڵکی و یاری بەبازاڕی جیهانی دەکەن و گرانی و هەرزانی بەدەستی ئەوانە ، ئەمەش لەژێر چاوەدێری و ئاگاداری ئەم سیستەمە دەجالییە جیهانییەدا بەڕێوە دەچێت...**

لەم کاتەدا گۆی زەوی موحتاجی ئیسلامە تا دوبارە داهات بەڕێکی دابەش کاتەوە و دیسانەوە مرۆڤایەتی بخاتەوە سەر ڕێڕەوی خۆی و دڕندەیی مرۆڤە دڕندەکان کەنار بخات...

هەر بەڕاستی سەرجەم مرۆڤایەتی لەلێواری مەرگدایەو پێویستی بە ئیسلامە...

سەرجەم ئەو سیستەمەکانی ئەمڕۆ زیانی بۆ مرۆڤایەتی هەیەو لەبەرژەوەندی چەند گروپ و کەسێکدان و بە ناوونـاتۆری زریق و باقەوە مرۆڤەکانیان خەڵەتاندووە...

لێرەدا بەراوردێکی خێرا دەکەین لەنێوان:

سیستەمی ئابووری لە نێوان کاپیتالیزم و ئیسلام و کۆمۆنیزمدا

تێبینی: بۆیە نەمنووسی: ئیسلامیزم ، لە بەر ئەوە ئیسلام ، ئیسلامەو بەس ، هیچ پێشگرو پاشگرێک ناخرێتە سەری....

ئەوەی ڕوونە لە ئێستادا جیهان بەسەر سێ هێزی گەورەی جیهانی دابەشبووە ( کاپیتالیزم و ئیسلام و کۆمونیزمدا)

لە سیستەمی کۆمونیزمدا هیچ کەس خاوەنی هیچ شتێک نیە، بەڵکو ئەوەی هەیە موڵکی گشتیە و هی حکوومەتە (ئەم قسەیە سادە و جوان دیارە بەڵام وانیە)

خودی کۆمونیزم لە کاردانەوەی سیستەمی فیودالیزم درووست بوو کە خانەدانەکان خاوەنی هەموو شتێک بوون بە ژیانی کۆیلەکانیشەوە

بەمەش شۆرشی کرێکارەکان سەری هەڵدا و ئەیانویست یەکسانبن

تێروانینەکانی مارکس جوان و ویستراو بوون دژ بە فیودالیزم بەڵام پلان بۆدانراو و واقعی نەبوون هەر ئەوەش بوو کۆمونیزم نەیتوانی لە واقیعدا تێروانینەکانی مارکس جێبەجێبکات و شکستبێنێت.

ئەوەی مارکس ئەنجامیدا دژ بە دەسەڵاتی کڵێسە و ئەرستۆکڕاتەکان شۆڕشێکی مەزن بوو چونکە دەستیان بەسەر تەواوی ژیانی خەڵکدا گرتبوو

بەڵام گواستنەوەی ئەم ئەزموونە بۆ وڵاتە ئیسلامیەکان هەڵە بوو چونکە سیستەمی شەرقی فوداڵ نەبوو دینی ئیسلامیش پاڵپشتی فیودالیزم نەبوو

ئەوەی نادادپەروەری بوو کەسی ئاقڵ و کارزان لەگەڵ کەسی نەزان و تەمبەڵ وەکو یەک بوون هەردووکیان وەکو یەک سەروەت و سامانیان ئەبوو

ئەوەنەی لە بازرگانیدا زیرەک بوون نەیاندەتوانی دەوڵەمەند بن.

لە سیستەمی کاپیتالزمیدا شتەکان پێچەوانەن

ئەمانجەکە پارەیە بە هەر شێوەیەک و ڕێگایەک بەدەستبهێنرێت.

گرنگ نیە کێ زەرەر دەکات و زیانی بەردەکەوێت گرنگ بەدەستهێنانێ پارەیە

(بۆ ئەم مەبەستەش جەنگ لەنێوان وڵاتاندا درووست دەکەن بۆ فرۆشتنی چەک

-بەرهەمهێنانی بێمەرج بە کارگەکان دەدەن بەمەش چینی ئۆزۆن کون دەبێت

-ئافرەت وەکو کەرەستە بەکاردەهێنن و وەکو پیشەسازی سەیری دەکەن

-بێرەوشتی بڵاودەکەنەوە لەپێناو فرۆشتنی کاڵاکانیان

-پۆڕن بەرهەمدێنن

-وڵاتان داگیردەکەن و سەروەت و سامانەکانیان دەبەن...هتد )

هەموو ئەمانە لە پێناو پارە

بەمەش کەسانێک درووست دەبن کە سامانەکەیان لە ئاسمانە و ملیاردێرن لە بەرامبەریشدا کەسانێک لە برساندا دەمرن

بەمەش هەمان سیستەمی فیودالیزم دووبارە دەبێتەوە بەڵام بە مۆدێرنی

ئێستاش زۆربەی خەڵکی کۆیلەی سیستەمی سەرمایەدارین و لە خزمەت و بەرژەوەندی چەند سەرمایەدارێک کاردەکەن و مووچەکانیشیان تەنها بەشی نان و ئاو دەکات

(ئەمەش کۆیلایەتی مۆدێرنە)

ئەوەی ئیسلام جیادەکاتەوە (وەسەتیەتە)

لە ئیسلامدا کەسە زیرەکەکان مەجالی دەوڵەمەندبوونیان هەیە و دەتوانن پارە کۆبکەنەوە بەڵام بە شێوەیێکی یاسایی و نابێت یاسا سروشتی و مرۆییەکان پێشێڵ بکەن

وە كاتێكیش دەوڵەمەند بوون ئەبێت زەكاتی لیبدەن و بەشی هەژارەكانیشی لێبدەن چونكە ئەوان لە وڵاتێكدا دەوڵەمەند بوون كە مافی هەژارەكانیشیتێدایە

بەمشێوەیەش هیچ كەسێک لە ئاسمان و كەسانێكیش لەبرسان نامرن

واتە كەسی زۆر هەژار نامێنێت و سیستەمی ئابووری ئیسلام بۆ نەهێشتنی هەژاری و كەسانێكی ملیاردێری نا یاساییە.

واتە لە كۆمۆنیزم هیچ كەس نابێتە سەرمایەدار

لە كاپیتالیزم چینایەتییەكی زۆر جیاواز درووست دەبێت

لە ئیسلامیش مەجالی دەوڵەمەندبوون هەیە بەڵام نابێت هەژاری برسی بمێنێت.

بەمەش ئیسلام ناوەند=وەسەتی هەڵبژاردوە

ئەوەی جێی سەرنجە وڵاتە عەرەبیەكان زۆر بە زەقی دژی سیسەتەمی كۆمۆنیزم وەستانەوە و چەندین كتێب و فتوایان لەسەردا لە كاتێكدا سیستەمی كاپیتالیزم زۆر خەتەرتر و ترسناكترە لەسەر مرۆڤایەتی

ئەمەشیان بۆ دوو هۆكار دەگەڕێتەوە:

١-سەركردەی وڵاتە عرەبیەكان زۆربەیان كەسی دز و سەرمایەدار بوونە بەمەش نەیاندەتوانی دزی و سەرمایەداریەكەیان بەردەوامبكەن لەگەڵ سیستەمی كۆمۆنیزمی بەمەش دژی وەستانەوە و زۆر بە زەقی پێشانیاندا كە ئەم سیستەمە دژی دینە بەمەش كە خەڵكەكە دیندارن سیستەمەكەیان ڕەتكردەوە بەڵام سەركردەكان قازانجیانكرد و دزی و سەرمایەداریەكەیان بەردەوام بوو، خەڵكەكەش وەكو كۆیلە مانەوە، (لەكاتێكدا ئەكرا هاوكارییەكتر بن دژ بە سیستەمی فیودال چونكە هەردوو ڕێبازەكە دژی كۆیلایەتین وە ئەتوانین بڵێین لە دژایەتیكردنی سەرمایەداری لەیەک نزیكن)

۲-دەرکەوتنی کۆمۆنیزم وەکو حیزبێکی سیاسی کە ئەمەش ململانێی دروست کرد لەکاتێکدا کاپیتالیزم وەکو فکرەیە و حیزب و وڵاتان جێبەجێی دەکەن

۳-قۆستنەوەی کۆمۆنیزم لەلایەن بێباووەرەکان و بەکارهێنانی وەکو چەکێک دژ بە ئاینەکان (دژایەتیکردنی مارکس و کۆمۆنیزم دژ بە دەسەڵاتی کڵێسا شۆڕەشێکی ڕەوا بوو، بەڵام لەگەڵ ئیسلامدا بوە هۆی شکستی) .

(ئاین تلیاکی گەلانە) ئەم قسەیەی مارکس بۆ ئەوڕوپا قسەیەکی زۆر ڕاست و حەقە چونکە بە ناوی دینەوە پارە لە خەڵک کۆدەکرایەوە و کەسانێ ببون بە سەرمایەدار و کەسانێکیش کۆیلە

بەڵام بۆ وڵاتە ئیسلامیەکان هەڵەیە چونکە ئیسلام خۆی دژی کۆیلایەتیە.

ئەوەی ئێستا ئەگوزەرێت سیستەمی سەرمایەداری تەواوی جەنگەکەی بردۆتەوە تەنانەت وڵاتە ئیسلامیەکانیش سەرمایەدارێکی سەرسەختن و لەپێناو پارە هەموو شتێک دەکەن واتە بەس بەناو ئیسلامین و ئابوریەکەیان سەرمایەدایە

تەنانەت وڵاتە کۆمۆنیزمەکانیش بەس بەناو جیاوازن ئەگینا ئەوانیش بە ڕێڕەوی سەرمایەداریدا دەڕۆن

ئەوڕوپاش بە هەمان شێوە سەرمایەدەرە

بەمەش کە ئەمریکا سەرکردایەتی ئەم سیستەمە دەکات توانیویەتی سەرکردایەتی تەواوی جیهان بکات و وڵاتەکانی تر وەک کۆیلەوان لە بەرامبەری

ئەوەی سەرمایەداری وڵاتە ئەوڕوپیەکان و ئەمریکا لە سەرمایەداری وڵاتە ئیسلامیەکان جیادەکاتەوە ئەویە کە ئەوان تاڕادەیەک سەرمایەداریەکەیان لەپێناو وڵات و میلەت و دواتر خۆیانە بەڵام وڵاتە بەناو ئیسلامیەکان تەواوی سەرماییەکە لەخزمەت خودی دز و بەرپرسەکانە.

واشنەزانن ئەو سەروەت و سامان و خۆشبەختییەی وڵاتە سەرمایەدارە ئەوڕوپیەکان بەهۆی کارکردن و زیرەکیانە بەڵکو با باش بزانن

هەرمنداڵێکی ئەوڕوپی کە لە خۆشگوزەرانی و ئاشتی و ئاسایش و تێری دەژی، لەبەرامبەردا منداڵێکی شەرقی لە هەژاری و برسییێتی و قەیران و نائارامیدا دەژی،

هەرتاکێکی ئەوڕوپی کە ژیانێکی خۆشی هەیە لەبەرامبەردا هەزاران کەسی شەرقی لە خەفەت و هەژاری و جەنگدا دەژیت

ئەوان کاتێک

- بەریطانیا ٥٧ ووڵاتی داگیر کرد.

- فەرەنسا ٥٦ ووڵاتی داگیر کرد.

- ئەمریکا ١٧٢ جەنگی هەڵگیرساند.

- چین دەیان هەزار مسوڵمانی ئۆیغوری لە زیندان شەلەل دەماغ کردو سەدان هەزاری لێ کوشتن.

- ڕوسیا هەزاران مسوڵمانی لە سوریا بۆم باران کرد.

سەرجەمیان لەژێر ناو شیعاری"ئاشتی"یدا ئەنجام دران و پاشان مسوڵمانانیش تۆمەتبار کران بە"تیۆرۆر".

یاریەکان ئاشکرایە کە ئەوان چۆن دەوڵەمەن بوون و لە خۆشیدان، وانەزانن ئاگامان لە ئەو هەموو کووشتارە و قەتلوعامی موسوڵمانان و وێرانکردنی وڵاتەکانیان نیە

ئاخر چۆن ئەوە لە بیردەکەین کە فەرەنسا چی لە جەزائیر کرد کە چۆن کەلەسەری موسوڵمانانیان بەدیاری بۆ سەرکردەکانیان دەناردەوە کە تائێستاش ١٨٠٠٠ کەلەسەر لە مۆزەخانەکانیان ماون و نایانگەڕێننەوە.

کوشتارەکانی ئیتالیا لە لیبیا ،

بەریتانیا لە عێراق و سوریا ،

کوشتارکانی ڕوسیاش بەهەمانشێوە

ئەوەی ئیسلام لە سەرمایەداری جیادەکاتەوە ئەوەیە کە ئیسلام ڕووی لە هەروڵاتێک کردبێت ئاوەدانی و خۆشی هێناوە بەڵام سەرمایەداری کاولکاری و کوشتارو هەژاری بۆ وڵاتان بردوە و سەروەت و سامانەکەشیان بۆخۆیان بردوە.

ئەوەی زۆر کێشەیە سەرمایەداری ڕوحی لەناوبردوە و مرۆڤ خۆشبەخت نیە ،چەندین کێشەی دەرونی و مرۆیی هەن ،لەبەرامبەریشدا دین واتە ڕۆح ،واتە دین و سەرمایەداری پێچەوانەی یەکترن و لەگەڵ یەک ناگونجێن ،هەرئەوەشە مرۆڤ وەڵامی خۆشبەختی پێنیە و نایدۆزێتەوە چونکە پسیارەکە لە ئیسلام نەکراوە

بەڵکو لە سیستەمی سەرمایەداری خۆشبەختی پسیارێک نیە تا وەڵامێکی بۆ بدۆزرێتەوە.

بەمەش وەڵامەکە لای ئیسلامە کە وەسەتییە کەمێک لە پارە و زۆرێک لە ڕۆح و ئەگەر پارەکەش لەپێناو رۆح بێت نور علی نور...

لەکۆتاییدا با ئەوەشمان لەبیر بێت ، سەرجەم کێشەو نەهامەتی و شەڕو برسێتی لە وڵاتانی بەناو ئیسلامی ئەمڕۆ دەگەڕێتەوە بۆ پیلان داڕشتن و فرت و فێڵی جیهانی دیمۆکراسی و عەلمانی و سەرمایەداری بە

سەرۆکایەتی سیستەمی نوێی دەجالی ئیبلیسی ئەمڕۆ ، لێرەدا تەنیا نموونەیەک دێنینەوە:

هاوسەری ئەنوەر سادات لەکتێبی بیرەوەریەکانی خۆیدا دەگێڕێتەوە دەڵێت جارێکیان وەفدێکی چەند وڵاتێکی خۆرئاوا هاتن بۆ دیدەنی ئەنوەر سادات دیاربوو بۆ چەند داواکارییەک هاتبوون کەتێدا داوایان کردبوو بەجدی کاریان لەسەر بکات و جێ بەجێیان بکات داواکارییەکانیشیان بەکورتی ئەمانە بوون

ـ دەبێت کار لەسەر گەلی مصری بکەیت و خوێندن و خوێندەواریان لەسەر قورس بکرێت و ڕۆڵ و پێگەی خوێندن نەهێڵێت تا خەڵکی خوێندەوارونەبن و بەرچاوو ڕونبن.

ـ لێدان و ئیهانەو سوکایەتی کردن بەو کەس و ڕەمزانەی کەپێشەنگ و پێشەوایەتی کۆمەڵگا دەکەن بۆ ئەوەی هیچ کاریگەری و ڕۆڵێکیان نەمێنێت بەسەر خەڵکەوەو چیتر خەڵک بەگوێیان نەکات

ـ ڕۆژ بەڕۆژ نرخی شت و مەک و پێداویستی ژیانیان لەسەر بەرز بکەرەوە تا ئەوەی گەلەکەت برسی و شەکەت بن و هیچان بۆ نەمێنێتەوە غەیری گوێڕایەڵی کردن نەبێت.

# ١ _ سیستەمی نوێی جیهانی

۞سیستەمی نوێی جیهانی
و ئیبلیسی هەزار ڕوو

۞وەک ڕوونە لای هەمووان بۆ زانینی ئامانج و کاری هەرشتێک سەرەتا دەبێ مێژووی بزانی چوون بەزانینی مێژوو ئامانج و سیفاتی شتەکانمان بۆ ڕوون دەبێتەوە ، ئێمەش بۆ ناساندنی سیستەمێی نوێی جیهانی پێویستە سیستەمە کۆنەکان پێشوو بە ئێوەی خوێنەر نیشان بەین پاشا بۆخۆتان سیستەمی نوێی جیهانی دەناسن و دەتوانن هەست بە ئەو ژەهرە بکەن لەناویدایە ، چەن بەشێکی سەرەتا زانیاریە مێژوویەکان دەخەینە ڕوو بۆ زۆرێک لەمانەش پشتمان بە کتێبەکانی مێژوو بەستووە و لەگەڵ پەیامە ئاسمانیەکان ....

سەرەتای چیرۆکەکە
ئەزازیل

سوێن بەدەسەڵاتی تۆ هەموویان فریوودەدەم تەنها ئەوانە نەبێت کە بەتەنهایی تۆ دەپەرستن.

قورئان ( صاد 82 -83 )

خودا وەڵامی داوە بە وەعدی جەهەنم و سزای پر ئازار خۆی و هەرکەسێکیش شوێنی بکەوێ لەخەڵکی

چیرۆکێکی زۆر کۆن کە ڕوویداوە پێش دروست بوونی مرۆڤایەتی بە هەزاران ساڵ کە جنۆکەیەکی هەزار ڕوو تێیدا دەرکەوت چیرۆکەکە ڕوویداوە لەنێوان حەق و ناحەقدا بەمشێوەیەش بەردەوام دەبێ هەتا ڕۆژی قیامەت ، چیرۆکەکە چرپاندنێکە لە نەفسی جنۆکەیکدا کە لە ڕێز لێگیراوان بوو ، کە خۆبەزلزانی و دژایەتی و غروور و دووڕووی گرتی ، لەفەرمان دەرچوو و خۆی لەیادچوو کێیە ، خۆی بەگەورە زانی و بەجێی نەگەیاند فەرمانەکە ، ڕایگەیاند ڕێز لە دروستکراوێک ناگری لەقور دروستکراوە ، خوا لەعنەتی لێکرد و کردی بەشەیتانی نەفرینکراو ، و ڕووی لەخودا کرد و داوای کات و چاوەڕوانی کرد ، داواکاریەکەی لەوێدا پێدرا ، بوو بە چاوەروانکراو هەتا ڕۆژی یەکلاکردنەوە ، ئەوەی ڕوویدا کە دەیبینین و لەمێژوودا بۆمان گێڕاوەتەوە بەتێپەرینی کات خەڵکی ناسیان بە ئیبلیس نەفرینکراو ....

ئەمە چیرۆکی ئەزازیلە ، جنۆکەی گۆڕاو بۆ شەیتانی نەفرینلێکراو و جنۆکەی هەزار ڕوو !!

لەکاتێکی نەزانراودا خودای گەورە دروستکراوێکی دروست کرد لەئاگر ناوی لێنرا جن و لەزەویدا نیشتەجێ بوون پێش سەردەمی مرۆڤ ، جنەکان دروستکراوێکی عاقڵ بوون بۆ پەرستنی خودا دروستکرابوون ، لەزەویدا دەستیان کردە دروستکردن و بنیاد نان و جوانکردی زەوی ، هێزیان زیادی کرد و نەوەیان خستەوە و بەهێز بوون هەتا وای لێهات بیریان چووە بۆچی دروست بوون ، دەستیان دایە خوێنرێژی یەکدی و خراپە لەسەر ڕووی زەویدا هەتا ئەوکاتەی جنۆکەی لەنێوانیان دەرکەوت بەناوی " ئەزازیل" ، ئەزازیل ژیر و بەندەی خودا بوو زۆر لەوان زیاتر خودای دەپەرست ، ئامۆژگاری هۆزەکانی جنی کرد و ترساندنی بە تورەیی و سزای خودا بەڵام زیاتر گومڕا بوون و دەسیان داوە خوێن ڕێژی ، خوای گەورە ڕێزێکی زۆر گەورەی لە ئەزازیل نا ، پێگەی بەرزکردەوە لە ئاسمانەکان و زەویدا ، ئەویش بەردەوام جنۆکەی لە تورەی خودا ئاگادارەکردەوە هەتا ئەوکاتەی خودا

**سوپای فریشتەکان بەیاوەری ئەزازیل نارده سەریان دژی بێباوەر و سنور دەرچووەکانی جنۆکە**

کوشتاریان کردن و سەرکەوتن بەسەر شەڕ و خراپەدا ، ئەزازیل سەیریکی خۆی کرد و وتی شتانێکم دروست کردووە هیچ کەس نەیکردووە ، خوداش ئەمەی لەدڵیدا بینی ، لەهەندێ گێرانەوەکان دەلێ لەگەڵ فریشتەکان وەک دیلیک بەرزکراوە بۆ ئاسمان ، لەوێ دەستی کردە خواپەرستن هەتا خودا ڕێزی پێ بەخشی چووە ڕیزی فریشتەکانەوە ، لە نزیک بوونەوە و عیبادەتەی بەردەوام بوو هەتا کاتێ خودا بریاریدا جێنیشینێک لەسەر زەوی دابنێ ، فریشتەکان وەک پرسیارێک لە حیکمەتی خودا پرسیان کەسانێکی تێدا دانێیت کە خراپەکاری و خوێنرێژی تێدا بڵاودەکەنەوە ئێمەش تەسبیحاتی تۆ دەکەین ، خوداش وڵامی دانەوە کە شتانێ دەزانی ئەون نایزانن ، دروستکراویکی دیکەی دروستکرد ناوی لێنرا مرۆڤ کە ئادەم بوو ، ئادەمیش لەخۆڵ دروستکراوە ، دوای دروستکردنی ئادەم ئەزازیل بەچواردەوی دەهات و دەرۆشت بینی کە دروستکراویکە وشکە لەخۆڵە

دواتر خودا فەرمانی بە فریشتەکان کرد سوجدە بەرن سوجدەی ڕێز بۆئادەم ، ئەزازیل توشی حەسوودیەکی زۆر هات ، و سوجدەی نەبرد وتی لەو باشترم من لەئاگرم و ئەو خۆڵ ، فەرمانی شکان و دوورکەوتەوە لەڕەحمەتی خودا ، دوای ئەوەی لەرەحمەتی خودا دوورکەوتەوە بوو بە نەفرینلێکراو یەکەمین هەنگاوەکانی دژی مرۆڤ دەس پێکرد ئەویش دەرکردنی ئادەم و خێزانی بوو لە بەهەشت و لەگەڵ ئەوەی خودا ئادەمی ئاگادار کرد لە فێلی سەرۆکی جنۆکەکان ، بەڵام ئادەم بیری چوو گوێی لە چرپەکانی سەرۆکی جنۆکە و دووژمنی مرۆڤ لەهەموو سەدەیەک گرت ، ئادەم و خێزانی دەرکران لەبەهەشت و دابەزینە زەوی ، دەست پێکی سەردەمی نوێی مرۆڤ لەسەر زەوی لەگەڵیشیدا جەنگی ئیبلیسی نەفرینلێکراو لەگەڵ نەوەکانی ئادەمدا

دەستی پێکرد ، سەرەتا لە دەسەدەی یەکەم یەکتاپەرستی خودا پارێزراو بوو ، ئیبلیس تەنیا تاوان بە کورەکان و دۆستانی ئادەم دەکرد ، یەکێک لەکورانی ئادەم ئەویکەی کوشت بەم هۆیەوە ، ئیبلیس زۆر بەمە خۆشحاڵ بوو بوو بەدوای ئەمەیا زەمەن تێپەری هەتا داوین پیسیشی توشیان کرد ، لێرەوە ئیبلیس خاڵە لاوازەکانی مرۆڤی زانی ، دواتر توانی بەمانە نەوەکانی ئادەم لەناوبات بەدەستی خۆیان ...

۞ئیبلیسی هەزار ڕوو

ئیبلیس لاوازی فێل و تەڵەکەکانی خۆی دەزانی لەبەرامبەر بەندەکانی خودا بۆیە شێوازێکی جیاوازی بەکار هێنا ، چەندین ساڵە پیلان دانێ بۆ دەرهێنانی مرۆڤ لەدین بۆیە لەهەر سەردەمێکدا شێوازی خۆی هەیە ، هەموو کاتێ بەیەک شێواز سەرهەڵنادا. لەهەرسەردەمێکدا بەسیستەمی مرۆڤ لەدین دوورەخاتەوە ، گرنگ نیە ئەو سیستەمەی ئیبلیس بەکاری دەهینی گرنگ ئامانجەکەیە ! کە بێ باوەڕیە بۆنموونە لەکۆندا بت پەرستی و چەندین شێوازی تر هەبوو واتا سیستەمەکانی کۆن لەسەر ئەساسی بت پەرستی خەڵکیان گومڕا دەکرد بەڵام سیستەمی نوێی جیهانی کە کۆتا هەوڵی ئیبلیسە بۆ دوورکەوتنەوەی مرۆڤ لەدین ! بێ شک جیاوازترە لەهەموویان ، من ئێوە دەگەڕێنمەوە دواوە بۆ ناساندنی ئیبلیس و سیستەمەکەی لەکۆندا هەتا ئەمڕۆ ....

1- لەسەرەتاوە سەردەمی نوح پێنج پیاو چاک هەبوون بەناو ود و سواع و یعوق و یغوس، نسرا ، خەڵکی خۆشیان دەویست لەبەر جوانی ڕەوشت و خواپەرستیان ، ڕۆژان تێپەری و ئیبلیس چاوەرێ بوو بەسەر مرۆڤدا سەرکەوی ، دوای مردنی ئەم پێنج پیاو چاک ، بەگەلەکەی وت چۆن دەتوانن ئەم پیاو چاکانە لە بیرکەن ! ، پەیکەریان بۆ دروستکەن هەتا لەبیرتان بن هەمیشە، لەسەرەتاوە نەیان دەپەرسن بەڵام لەجیلەکانی داهاتویاندا دەسیان دایە پەرستی ئەو پەیکەرانە بەهۆی ئیبیلیسەوە ، لەوکاتەشەوە یەکەم بت پەرستی و شرک لەسەر

زەوی پەیدا بوو ، بەهۆی ئەمەوە خوودا نوحی نارد ، چەن کەسێکی کەم باوەریان بەنوح هێنا ئەوانیکە لەتۆفانەکە خنکان، کۆتای سەردەمی یەکەمی مرۆڤ هات ...

ئیبلیس جنۆکەیەکی گەمژە نیە بەڵکوو زۆر زیرەک و بەتوانایە ، شتانێکی سادەی بەخەڵکی دەکا و خەڵکی بەهیچی دەزانن بەڵام دوای دەیان ساڵ بەرهەمەکەی دەبینن ، لەهەموو سەردەمێکیشدا بەشێوازی تایبەتی خۆی دەجوێڵێتەوە ، لەئەمرۆیا پەرستنی بت و پەیکەر بونی نیە و نەماوە بەڵام گۆراتەوە بە زانست و نوێبوونەوە و رۆشننگەری لەسەر ئەم رێگایەش بزوتنەوەکان و فیکرە شەیتانیەکان سەریان هەڵداوە ، ئەمرۆ ئیبلیس خەڵکی هان نادا بۆ بت پەرستی ، تەکتیکی ئەمرۆی ئیبلیس گۆراوە بەڵکو دەستی کردووە بەچاو بەست کردن .

2- لەدوای سەردەمی تۆفانەکەوە مرۆڤایەتی دووبارە دروستووەوە و سەردەمی دووەم دەسی پێکرد ئەمجارە پەرستنی پیاو چاک و بتەکان نەمابوو لەدوای تۆفانەکە بۆیە سەیری نەوەکانی نوحی دەکرد هەتا لەرێگایەکەوە سەرکەوێ بەسەریان هەتاوەکو کەسێکی دروست کرد بەناوی مۆردۆخ ( نەمروود ) لەسەر شێوازە کۆنەکەی خۆی ، ئیبلیس لێی نزیک بووەوە و پێی گوت تۆ خوای بابلی و دەسەڵات داری بابلی ، نەمروودیش بەهەمان شێوە لەسنور خودا دەرچوو و خراپەکاری ناوە لەزەویدا ، گۆرینی مرۆڤ لەپەرستنی بەرد و بتەوە بۆ مرۆڤ رێگای دووەمی ئیبلیس بوو ئەم ڕێگایە ئیبلیس هەتاوەکو ئێستەش بەردەوامە بەڵام بەشێوازی دیکە .

3- خەڵکی لەسەردەمی ئیبراهیم بت ومرۆڤیان دەپەرست شەیتان دووبارە هاوبەش و شیرکی لەنێو خەڵکدا بڵاوەکردەوە هەروەها دەستی کرد بە فێرکردنی مرۆڤە خراپەکان بە سیحر و جادوو لێرەشەوە تیری سێهەمی لە جەستەی نەوەکانی ئادەمداجێگیرکرد ، لەدووڵی دوو رووباردا سیحر و جادووی بڵاوەکردەوە خوای گەورە پێغمبەر

سولەیمان لەو بوختانەی جولەکە پاراست کە دەیان وت سیحری فێرمان کردووە ، ئیبلیس  پیلانەکانی خۆی بۆ نەوەکانی ئادەم بەجوانی ڕێک خستووە ، سەبر دەگری لەسەر هاتنە دی پیلانەکانی ، کێش لە رۆژئاوا و ئیغریقیەکان زیاتر گوێرایەڵ و  بەوەفان بەرامبەر ئیبلیس !ٓ بەدرۆ و چەواشەکاری و بڵاوکردنەوەی رێگای گومڕای ، هاورکاری ئیبلیسین !  ئیبلیسیش وەعدەکەی خۆی بردە سەر کە وتی ئەمریان پێکەم دروستکراوەکانی خودا بگۆرن !

4- سەردەمی فیرعەوکانیش بەهەمان شێواز سەردەمی زێرینی ئیبلیس بوو  لەسەر رێگانی پێشوو شیرک ، بت پەرستی هێناوە دیسان  تێکەڵ لەگەڵ سیحر بابل و چەواشەکاریەکانی پیاوانی پەرستگا   ،  ئەو باش دەیزانی سروشتی مرۆڤ دروست بووە بۆ عیبادەت   و لەناخی مرۆڤدا هەستیکی پەرستن هەیە بەڵام شەیتان بەلارێدا ئەو هەستەی برد .

5- لەدوای دەست پێکردن بە سەردەمی نوێ و ئێستا لەدوای سەدەی نۆزدەوە ڕوویەکی نوێ بەسیستەمێکی نوێیەوە دەرکەوت کە خەڵکی توشی لارێی ئەکرد و خەڵکی دەخەڵەتاند ، و وای لەخەڵکی کرد زانست ببێتە مەنهەجی سەرەکی خەڵکی زەوی ، ڕێگایەک تەنانەت بانگخوازانی ڕێگای خواویستی لێی دەرباز نابێت ،  لێرەشەوە خۆی شاردەوە لەناو ئەو سیستەمەدا   ، لەناوەراستی سەدەی نۆزدەیا جووڵە فێمینیزم ، بابەتەکانی دیکە کە داوای ئازادی و خۆ ویستی مرۆڤگەریان دەکرد سەریان هەڵدا (پێشتر باسمان کردوون ) .

 بەم شێوازە زانست بووە دینیکی تازە بۆ خەڵکی دینیک کە ناوی خودای تێدا سرابوویەوە ، دینیک بانگەشەی نەبوونی خودای ئەکرد ! ئەمەش بووە تیری چوارەم لەجەستەی نەوەکانی ئادەمدا ، کەواتا هەموو شارستانیەتاکانی مێژوو کەدروست بوون و دژایەتی شارستانیەتی یەکتاپەرستیان دەکرد هەمووی ویستێکی ئیبلیسی بووە ! هەرچەن هەرجارەو بەشێوازێک هانی دروستبوونی شارستانیەتەکانی

دەدا ، جاریک بە پەرستنی بت ، جارێک بە پەرستنی کەسێک وەک خوودا ! ، ئەمرۆش پەرستنی کۆمەڵێک یاسا وەک شەرعی خوودا ! دووژمن هەر هەمان دووژمنە بەڵام هەرجارێ و بەرووییەکەوە دەر دەکەوێ بۆیە پێی دەوترێت ئیبلیسی هەزار ڕوو ! کەواتا ئێستا زانیمان کێیە دووژمنی سەرەکی مرۆڤ لەدێر زەمانەوە کێیە داهێنەری سیستەمەکان ، کێیە هاوکاری مرۆڤەکان بۆ دانانی سیستەمەکان ! جاریکی تر دەیلێمەوە سیستەمی نوێی کۆتا سیستەمی ئیلیسە و کۆتا هەوڵدانیەتی بۆ دژایەتی نەوەکانی ئادەم ! کەواتا لەسەرمان زۆر پێویستە ناسینی ئەو میکانیزمەی ئەمرۆ کە ئیبلیس بۆ لاریبردن بەکاری دەهێنیت !

# ٢ _ پیاوانی ئیبلیس

●پیاوانی ئیبلیس و جەنگی ڕوسیاو ئۆکرانیا.

تۆ جیهانێکی خەیاڵاویت بۆ باسکراوە پر لەخەیاڵ

ئەوە جیهانی راستیە دەبیینرێت لەواقع و حاڵ..

چیرۆکەکە دەستی پێکرد لە دروست بوونی یەکەم کۆڕبەندی کۆنی ئیمپراتۆریەتی ئەمریکا لەساڵی 1723 ئامانجی یەکەم تێیدا سێ وشە بوو لەسەر دۆلاری ئەمریکی نەخشێنراوە بەلاتینی ( navos ordo seclorum)

ماناکەی بریتیە لە ڕێکخستنەوەی نوێی سەردەمەکان !

بەدەستی ئیبلیسی گەورە و باوکی سیستەمەکان !!

ئەمە پیلانێک بوو دەستی پێکرد لەگەڵ حەوت سوارچاکەکە پێش 500 ساڵ پێش ئێستا ، لەکۆتایدا وێنەی ئاڵایەکی تێدا دروست بوو لەنێوان سوور و شین لە سکۆتلاندەوە بۆ واشنتن ! دوای دووسەت ساڵ و دەسپێکی سەدەی بیست بەتایبەتی دوای دووجەنگە گەورەکەی جیهانی ئەو جەنگانەی کە جەمسەرەکانی زەوی ڕێکخستەوە و باڵانسی هێزی رێکخستەوە لەدوونیا و دونیا خستە ژێر هەیمەنە و سیادەی دۆلارەوە ، حوکم کەوتە ژێر دەستی ئۆلی گارشیا! خاوەنی زێر و بریار !

هەتا نوسینی دواین یاسا و دەستور و قەرار

بۆخزمەتی کۆمەڵێ دەوڵەمەند و سەرمایەدار..

لەبەشەکانی پێشوودا باسی ئیبلیسمان کرد و سەرەتا چیرۆکەکەمان ڕوونکردەوە لەمەودوا دەچینە سەر باسی ئەوکەسانە نوێنەری ئیبلیسن لەسەر زەوی ئەم نوێنەرانە سیستەمی نوێی جیهانیان بنیادناوە بەڵام هەروا نامێنیتەوە دەگۆڕێ بۆ سیستەمی گشتگیری جیهانی ئەمەش دەبێتە هۆی ڕووخاندنی وڵاتان بەهەموو کۆربەندەکانیە چۆن ئەمە دەبێت ؟؟ ئایا سیستەمێ ئێستا دەروخێ ؟ ئایا سیستەمێکی دیکە هەیە جگە ئەمە مرۆڤایەتی بۆ حازر بکرێت ؟؟؟

پێش دووهەزار ساڵ پێش ئێستا لایەنی دینی دەستی گرتبوو بەسەر ئیمپراتۆریەتی جیهانی بەتەواوی ، بۆیە جیهان بوو بە دووبەرەوە بەرەی یەکەم ئیمپراتۆریەتی بێزەنتی مەسیحی و بەرەی دووهەم خەلافەتی ئیسلامی کە هەژموون و دەسەڵاتی بەسەر نیووەی جیهاندا هەبوو خەلافەتەکە

بەڵام سەدەی هەژدە و حەڤژدەی زاینی باڵی چەپەکان کە باڵێکی بێ باوەرین دروست بوون لەسەر پرۆتۆکۆڵاتی علمانی و مادەگەرایی بەناوی ڕووناک کەرەوە و ئاوەدانی بۆ زەوی بۆیە هەموو وڵاتە گەورەکان بوونە دووبەرەوە باڵێکی راست و باڵێکی چەپ بەڵام هەردوو باڵەکە یەکانگیر بوون لەسەر دژایەتی ولەناوبردنی خەلافەتی ئیسلامی خۆ لەهەمان کاتیشا هەردوولا هەمووکات هەڵگری دوو پەیامی پێچەوانەی یەکدین...

ئەم دەستەواژەی چەپ و راسە وەک دەستەواژەیەکی سیاسی بەکارهات کە بنچەکەی ئەگەڕێتەوە بۆ شۆڕشی فەرەنسی لەساڵی 1789 کاتێ کە نوێنەرانی ڕاست ڕەوەکان کە سەرخەری حوکمی پاشایەتی بوون لە لای راستەوە دانیشتن ، بەڵام چەپرەوەکان لەلاکەی دیکە واتا چەپەوە دادەنیشتن لەپەرلەمانی فەرەنسی ، بەڵام دروست بوونی باڵی ڕووناک کەرەوەکان لەسەدەی هەژدەیا بوو بەهۆی پێش خستن و برەودانی

چەپڕەوەکان ، بەشێوەیەکی ئاشکراش دەوڵەت یارمەتییانی دەدا لەسەر حسابی ڕاستڕەوەکان ..

شوێن کەوتوەکان و بیرمەندانی ڕاسترەوەکان دەست وەردەنە ژیانی کۆمەڵگا بۆ پاراستنی کەلتور و دابوونەریتی گەلان چ بەرێگای دین یان بەرێگای یاساکان لەنێوشیاندا دەستوری ئینجیلی وەک پیرۆزیەک سەیریدەکەن خۆ لەهەمان کاتیش پەیرەوی لێناکەن ! چون ئەوان وەک بلێی ئینجیل راست بێ لێی ناروانن بەڵکو وەک دابوونەریت و پاشماوەی کۆنی خۆیانی دەزان وەک چۆن راسترەوی مەسیحی هەیە بەهەمان شێوە راسترەوی موسڵمان و جولەکەش هەیە ...

بەڵام لەبەرامبەردا دەبینین چەپرەوەکان پروپاگەندای ئیعلامی زۆر سەرنجراکێشتر و باشتر دەزانن بۆ راکێشانی بیری تاکەکان چەپەکەن لەسەر کۆمەڵە مەبدەئـ دروست بوون ڕووکەشەکەی ڕوونە و ڕەونەقدارە وەک مافی یەکسانی نێوان تاکەکانی کۆمەڵگا و دیمووکراسی و هەڵوەشاندەوە سەرمایەداری بەڵام ناخی چەپڕەوەکان کرۆکیان دژایەتی هەموو ئاینە ئاسمانیەکان ئەکەن بەعامی و لەدرێژ مەودا هەوڵی سرینەوەی ئاین دەدەن لەسەر زەوی

بەتێپەرینی کات دەستەواژەی چەپ گۆڕا و دابەش بوو بۆ کۆمەڵی لق و پۆپ لەژێر چەتری چەپدا بۆیە چەپرەوی رۆژئاوا گۆڕدرا بۆ سۆشیالیست و لیبراڵی کۆمەڵایەتی لەئەوروپا ، هەروەها کۆمەڵە باڵێک لەژێر چەپدا دروست بوو ئەمرۆ پێیان دەڵێن ئەناکیسزم کە بیروباوەرێکی ئاژاوەگێریە ، بانگشەی کۆمەڵگا دەکا بۆ دژایەتی فەرمان ڕەوایی وڵات پێیان دەوترێ چەپی ڕادیکاڵی ، لێرەوە ئەلێم هەرکەسێ کەمی ئاگایی سیاسی هەبێ دەزانی کە باڵی چەپ بەتەواوی دروستکراو و بنیادراوی دەستی کۆربەندەکانی پیلانگێری رۆژئاوایە لەسەرەتاشەوە کۆڕبەندی رۆزیگرۆشین هەتا fro the ufe of lodges دیسان دەیلێمەوە چەپەکان لەسەر مادی علمانی بێ دینی

دروستبوون ، زۆرێک لەکەسە بەئاگاکانی ئەمرۆش دەزانن کە باڵی چەپ بەئاشکرا دەعمی ئازادی سێکسی و بزوتنەوە فێمینیزمەکان و بۆچونە بێدینیە بێباوەریەکان و دژایەتی کردنی بیری مرۆڤ و تێکدانی فیترەت لەسەرووی هەمووشیەوە نێربازی دەکات !

بەڵێ وەک دەبینن ڕۆژئاوا بە بیرو باوەڕی ڕاست ڕەوەکان و چەپەکانەوە کە پرۆتۆکۆلات و یاساکانیان دژایەتی یەکدین دانەیەکیان پشگیری حوکمی پاشایەتی ئەویکەیان دژی ، یەکێکیان پشگیری دابوونەریتی کۆمەڵگا و ئەویەکەیان دژی ...هتد سەرەڕای هەموو ئەمانە یەکانگیرن لەدژایەتی شارستانیەتی ئیسلامی! هەژوومنی چەپ و ڕاست باڵێ کێشاوە بەسەر جیهانی ئەمڕۆیا ! دەسەڵاتدارانی ئەمڕۆی وڵاتانی ڕۆژهەڵات نوێنەری چەپ و ڕاستن بۆ وڵاتەکانیان! کەواتا سیستەمی نوێی جیهانی لەسەر دوو لایەن دامەزراوە هەردوولایەنیش هەرچی پرۆتۆکۆلاتیان هەیە ئیبلیسیە ! لەکۆتایدا ئەم دوو باڵە نامێنن و دەبنە یەک سیستەم !

وائێستا دەبینین شەڕ و ئاژەوەکان بەڕابەرایەتی پیلانگێری جیهانی و کۆمەڵێ خێزانی سەرمایەدار سەری هەڵداوەتەوە ئەم جەنگە بچوک نابێت بەڵکو جەنگێکە بۆ ڕووخانی باڵی ڕاستەکان لەدوونیا ، کۆتایەکەشی بەڕووخانی سیستەمەکە دەبی واتا سیستەمی نوێی جیهانی ! لەدوای ئەمەوە سیستەمێ دروست دەبێ بەناوی سیستەمی گشتگیری جیهانی کە یەک پرۆتۆکۆڵیان هەیە و یەک سوپا و یەک حکومەت و یەک پاشا . ئەمانە هەمووی بەشێکە لە پیلانگێری ڕۆژئاوا وا بەرە بەرە سەرەتاکانی دەرکەوتووە دەنگی تەپڵی جەنگی جیهانی سێیەم بەگوێی جیهاندا لێدراوە کێش گوێی لێ نیە کەڕە ! کوێرە !!!

●جەنگی ڕوسیاو ئۆکرانیا

ئەمرۆ هێزی ڕۆژئاوا لەسەر مەفهوومی راست و چەپ بنیادنراوە و ئەو بیرە وێرانکەرانە جێبەجێ ئەکات بەپشتیوانی هێزیکی سیاسی چەوسێنەری زۆردار سەپێنەر و هێزێکی شاراوەی نوستیسیزم( گرووپێکی جولەکەیە ) کە هەڵدەستی بە بێئاگایی کردنی خەڵک تەبعەن ئەمیش لەرێگای ستەیجەکانی فیلم و راگەیاندنەوە وەک بۆ نموونە نێتفلێکس ! لە فلیمەکانیدا بانگەشەی هاوڕەگەزبازی چەندین شتی دیکەش دەکات ، لەکاتی گەلانی دوونیا دژی دەوەستن بەڵام سوورە لە کردنی بەقورگی خەڵکید !!

دووساڵ پێش ئێستا جیهان سەر سام بوو بە ڕووداوێک کە بووە هۆی گۆرینی رێرەوی ڕووداوەکانی جیهان بەخێرای لەم دوایانەدا بەتایبەتی لە 2020 ، وڵاتانی گەورە دەستیان کرد بە دەرکردنی سەرکردەکانی راسترەوەکان یەک بەیەک پیلانی داهاتوودا بریتیە لەگرتنەدەستی جیهان لەلایە سەرکردەکانی باڵی چەپەکانەوە ، ئەوەتا بینیتان سەرۆکی حیزبی جمهووری ئەمریکی دۆڵناد ترامپ لەدوای تەواوبونی ویلایەتی یەکەمی حوکمی لابرا لەسەرۆکی کۆماری ، ناتانیاهۆ بەهەمان شێووە ، هەروەها مێرکل سەرۆکی حیزبی راسترەوی ئەڵمانی کە لەژیانیشدا پشگیری بیرکردنەوەکانی چەپەکانی کردووە لەپۆستەکەی لادرا بۆ چەپەکان ، ئەمرۆش بۆریس جۆنسۆن سەرۆک وەزیرانی بەریتانی مەسەلەی لادانی کاتێکە و هیجی کە ، بۆیە ئێستا سەیریکی جیهان بکەیت دەبینی جەپرەوەکانن ، کەبەشێوەیەکی ئاشکرا باسی وەستاندنی و دانانی سنورێک بۆ گەشەی دانیشتوانی جیهان باسدەکات ، پیلان و نەخشەکانی چەپەکان ئەمڕۆ بوون بە حاکمی جیهان ،بۆیە ڕێگە بەهیج لایەنێک نادرێ ئەمڕۆ دژایەتیان بکات و پێشیان پێبگرێ تەنانەت ڕاست ڕەوەکانیش زۆر پرۆگرامی ئەوان جێ بەجێکەن ! ، لێرشەوە دەستیان داوەتە ڕووخاندنی وڵاتانی راست ڕەوەکان لێرەیا باسی نموونەیەکتان بۆ دەکەم ....

ڕاستی جەنگی نێوان ڕووس و ئۆکران

ئەمڕۆ ساڵی 2014 یە شۆرشی ئۆکرانی کۆتایی پێهات دوای زنجیرەیە شەر وپێکدادان لەنێوان خۆپیشاندەران و پۆلیس و چەکدارە نەناسراوەکاندا لەناو جەرەگەی پایەتەخت کییڤ بووە هۆی دەرکردنی سەرۆکی پێشووی ڤیکتۆر یانۆکۆڤیچ و ڕووخانی حکومەتەکەی کە ئۆکرانیای نزیک کردبووەوە لە ڕووسیای ئیتحادی هۆکاری ئەم شۆرشە هەڵمەتێکی راگەیاندنی ڕۆژئاوا بوو بەرابەرایەتی ئەمریکا کە ئۆکرانیەکانیان بۆ ئازادی و یەکسانی هاندەدا بۆ دەرچوون لە هەیمەنەی ڕووسی ، ڕووس دەیزانی ئەمریکا لەپشت ئەمەوەیە ، بۆیە شۆرشەکەی بە ئینقلابی نایاسایی ناوبرد و دانی نەنا بە حوکومەتی کاتی لە ئەنجامی شۆرشەوە دروست بوو بەڕابەرایەتی کەسێ بەناوی گلادیۆ کە باڵی نهینی ناتۆ بوو ! ، بۆیە کۆمەڵێ خۆپیشاندان دژی شۆرش و بۆ پشتیوانی روسیا بەرێوو چوو لەناوچەکانی باشوور و ڕۆژهەڵاتی وڵات کۆتایی هات بە گرتنی نیمچە دوورگەی قرم ساڵی 2014 و دروستکردنی وڵاتێکی سەربەخۆ لە لۆغانتسک و دونیتسک و ئۆکرانیاش کەوتە چنگ ئەمریکا ، پێترۆ پرۆشینگۆ ، بووە سەرۆک دوای هەڵبژاردنێک و بەم شێوە ئەمریکا روسیا گەمارۆدا و هەناسەی لێبری ، ئۆکرانیا دواین سنور کەوتە دەستی ناتۆ ، لێرەشەوە سێ ئامانجی بەدەست هێنا یەک جیاکردنەوەی ئۆکرانیا لە ڕووسیا دوو گۆرینی بۆ دەوڵەتێکی ئەوروپی ، سێ کردی بەهۆکاری بۆ ئەوەی ڕووسیا هێرشی بۆبێنێت بەمەش دەبێتە هۆکار بۆ ئابلۆقەی سەربازی و لۆجیستی و سەربازی ، رووسیا ترسناکی ئەمەی دەزانی ، دەیزانی داوەکە ئۆکرانیایە ! هەر بۆزانیاریتان جەنگەکانی ڕۆژهەڵات ناوەراست هەمووی لەباتی ئۆکرانیا دەکرا واتا ئەوروپا جەنگەکەی لەخۆی دوور دەخستەوە فرێداوە رۆژهەڵاتی ناوەراست و ئەفریقا بەڵام دواجار گەشتەوە ئەوەی لێی دەترسا و دوای دەخست

لەو کاتەشدا تورکیا بە فەرمانی ئەمریکا دەریایی رەشی بەرووی رووسدا داخست ، لەساڵی 2014 چەپەکان لەسەر دەسەڵاتی ئەمریکا بوون ئۆباما گڵۆپی سەوزی بۆ روسیا هەڵکرد بۆ ڕۆشتنە ناو نیمچە

**دوورگەی قرم ، لەولاشەوە راگەیاندن بەهەرای سزا و ئابلۆقە رازینراوە، ڕووس دەیزانی کە گرتنی قرم مانای سزا و ئابلۆقەیە و خزمەتی ئەمریکا دەکات ، بەڵام بۆ پاراستنی ئەمنی قەومی وڵات ناچار بوو قاپە ژەهرەکە بخواتەوە**

**لەساڵی 2016 دوای دوو ساڵ لەو ڕووداوانە ، حیزبی داد و گەشەپێدان جوڵەکانی لە ڕێکەوتنامەی لۆزان 1923 دەرچوو ، هەندێک زانیاری نهێنی کەشف بوو کە تورکیا ڕێکەوتن لەگەڵ ڕووسیا دەکا لەسەر ئاستی سەربازی و سیاسی ، بۆیە باڵی راست لەتورکیا کە ئەردۆغانە ئینقلابی بەسەردا کرا بەپشتیوانی چەپەکانی ئەمریکا بەهۆی نزیک بوونەوەی لە سەربازگەی رۆژهەڵات ، ڕووس مەرجی بۆ تورکیا کردنەوەی دەریایی ڕەشبوو بەروویدا ، بەڵام ئاسان نیە تورکیا لەناتۆدابێت ! لێرەیا ئەمریکا گڵۆپی سەوزی بۆ تورکیا کردەوە دەریای رەشی بەرووی روسدا کردەوە ، لەولاشەوە سوپای کۆکردەوە لەیۆنان وەک هەرەشەیەک بۆ تورکیا لەئەگەری دەرجوونی لەهەژموونی ناتۆ و بڕیارەکانی ئەمەش بۆ هۆکاری بوو ڕووسیا تووشی جەنگی هەرێمی بکەن ، ئەمریکا زۆرجار وەک چاودرێری دوور دەبێ ، بەشداری جەنگەکە ناکات هەتا کۆتایی جەنگەکە وەک جەنگی جیهانی یەکەم ، لەجەنگی جیهانی دووەمیش وەک پشتیوانێ بەشداریکرد و لەهەردووحاڵەکەدا براوەبوو ، لەجەنگی جیهانی دووەم بەریتانیا بەهیلاکی لێی دەرچوو و سەرکردایەتی جیهان کەوتە دەست ئەمریکا و هەموو قەرزەکانیشی داوە بەهۆی جەنگەوە ، ئابووریەکەشی بەهۆی چەندین رێکەوتنەوە بەرەو پێشەوە برد بەتایبەتیش پترۆ دۆلار ...**

**لەساڵی 2018 دا ڕووسیا ویستی ئۆکرانیا بگریت بە بێ هیچ جوڵەیەکی سەربازی ، هەرچەن رێگای سەربازیش دەیتوانی بەکاری بێنیت بەڵام لە داوەکان ئەمریکا دەترسا ، لەوکاتەشدا هاوپەیمانی رووسیا و چین بەسترا تۆپەکە فرێدرایە ساحەی ئەمریکاوە ، بۆیە ئەمریکا راستەخۆ چینی گەمارۆدا بە یابان و تایوان و وڵاتانی ئاسیا ،**

و هێزەکانی ناتۆش نزیک سنورەکانی ڕووسیا بڵاوەی پێکرا لە ئیستوانیا و لەهەمان کاتیشدا ئەمریکا هەنگاوی پێشبینی نەکراوی نا بەکشانەوەی لە ئەفغانستان ، جێهشتنی بۆ تاڵیبان دوای ئەو هەموو ماوە شەڕەی و سەربازەی لەوێ کوژرا سەرەنجام جێی هێشت و حکومەتی کارتۆنیش بەرگەی ڕۆژێکی نەگرت ! هەموو ئەمەش ئامادەکاری بوو بۆ جەنگێکی گەورەتر لەڕێگای جەبهەی ڕۆژهەڵاتی ئەوروپاوە بە ئیسفزاز کردنی روس بە ناتۆ لەساڵی 2020 ناتۆ هەوڵی دا ئۆکرانیا وەک ئەندام وەرگرن لە ناتۆ بۆ ئیستفزازی رووس و کەوتنی بە داوەکەوە ، داوەکە چیە ئەوەیە ڕووسیا ناچار کەن بۆ پاراستنی ئەمنی قەومی وڵاتی بەرەوە ئۆکرانیا جەنگ دەسپێکا بۆ یەکەم لاوازکردنی رووسیا و ماندووکردنی ، دووەم ناچارکردنی وڵاتانی ئەوروپا و چونەوە بۆ ژێر باڵی ئەمریکا ، لێرەشەوە جەنگێکی نوێی جیهانی دروستەبێ بە هەمان سیناڕۆی پێشوو ئەمریکا پشتیوان وڵاتانی ئەورووپیش بەرداشەکەن دژی رووس و چین بۆ لاوازکردنیان ، وڵاتانی ئەورووپی ئەمڕۆ زۆر دەترسن لەپچرانی بۆریەکانی غاز لە رووسیاوە ، لەم ماوەشدا هێلی درۆگبا لە لۆغانتسک هێلی گازی روسی تەقیەوە و نورد ستریم دووش چوو بەقوڕدا ، کەواتا ئەوروپا دیسان بەبی مەرج کەوتنەوە چنگ ئەمریکا ،لێرەوە تێدەگەین ئەمریکایە دەیەوێ جەنگ دروستبی بۆ ڕووخانی و لاوازکردنی وڵاتان لێرەش ئۆکرانیا بەرداشەکەیە بۆ پلانەکەی ، بۆیە کێشەکە لەنێوان ڕووس و ئۆکرانیا نیە بەڵکو ئەمریکا و ڕووسیایە ، ئامانجی رووسیا لەم هێرشەیا وەستاندنی ناتۆیە بەڵام ئامانجی ئەمریکا هەڵگیرسانی جەنگی جیهانی سێیەمە و بەهەمان سیناریۆی کۆن ، ئەمەریکا دەیەوێ ڕووس هێرشکا بۆیە سەربازەکانی کشانەوە و باڵوێزخانکەشی کشانەوە لێرەشەوە دەزانین زیلنیسکی بووکەڵەیەکی جولەکەی چەپرەوەکانە و هیچی کە ئامنجیشی ئەوەیە ئۆکرانیا ببێتە خەڵوزی گەرم بوونەوەی ئەمریکا !

گەر تێبینی بکەن لەکاتی هاتنی تڕامپدا هیچکات ڕووسیا بەم شێوازە ڕووبەرووی هێرش نابووە لەلایەن ئەمریکاوە چون بەرەی ڕاست

**ڕەون ! بۆیە ئەمریکا لەکاتی تڕامپ جەبهەی ئێران و چینی گەرم دەکرد ! چون باڵی چەپ لەئێراندا هەیە دەیەویست بیبرێ تاڕادەیە زۆریش سەرکەوتوبوو ! بەڵام بەهاتنی بایدن دیسان جەنگەکان دەس پێدەکەنەوە جەنگی ئەمجارە خوێناوی و وێرانکەر دەبێ بەئەوروپا و عەرەبەکان دەکرێ دژی جەبهەی ڕۆژهەڵات بۆلاواز کردنی وڵاتانی ڕۆژهەڵات ، لەم نێوانەش ئەمریکا وەک بەرزەکی بارام بۆی دەرچی !! ببێتە حاکمێکی موتڵەقی جیهان و هەموویان ناچاربن بیکەن بە براگەورە بۆ نەمانی شەڕ ! هەموو ئەمەش لەژێر پیلانگێری زایۆنیزمی جیهانیدایە !!!**

# ٣ _ سەدەی بیستەم

● سەدەی بیستەم و سیستەمی دەجال.

سەدەی بیستەم ئەو سەدەیە کە ڕواڵەتی ئایدۆلۆجی و تۆبۆگرافی و بیرو باوەر جیهانی گۆری خراپترین سەدە لەمێژوودا گەر کەسێ پرسیاری لێکردی لەسەر سەدەی بیستەم پێی بلی ئەو سەدەیە بنیاتنرا لەسەر چاوبەست و فێڵکردن لە مرۆڤایەتی سەدەی هێنانی کارەسات بۆ گەلان

لەنێوان جەنگی یەکەم و دووهەمی جیهانی ، کاتێک بۆیەکەم جار تێروانینێکی تازە هاتەکایەوە دواتر بە سیستەمێ نوێی جیهانی ناونرا لەلایەن کۆمەڵی کارەکتەر لەپشتەوەی مێزی کۆربەندەکانی کۆنەوە دانرا بەسەرۆکایەتی ۆوردۆ وێلسۆن سەرۆکی 28مین ئەمریکا و وینستۆن چێرجڵ سەرۆکوەزیرانی بەریتانیا ، لەپێناو ئامادەکاری بۆ ماوەیەکی نوێ کە ئەو ماوەیە تایبەت مەندە بەکۆمەڵی گۆرانکاری بنچینەیی لە بیری سیاسی و سەنگی هێزی جیهانی ،

ئامانجی جێگیرکردنی جیهانە لەژێر یەک حکومەتدا ، هەنگاوەکانی جێ بەجێ کردنی ئەم پرۆژەیە دەستی پێکرد لە دروستکردنی ڕێخراوە حوکمیە نێودەڵەتیەکان سەرەتا لە کۆمەڵەی گەلان ساڵی 1920 و دواتریش نەتەوەیەکگرتووەکان لەساڵی 1945 و ڕێخراوی هاوپەیمانانی باکوری ئەتڵەسی ( ناتۆ ) لەساڵی 1949لەپاڵ کۆمەڵی ( ڕێکەوتنی GATTڕێخراوی نێودەولەتی وەک بریتن ۆدس و نێودەڵەتی بۆ بازرگانی) و تەندروستی جیهانی ئەمانە هەمووی لەپیش چاو خەڵکی ڕوویدا دروستکردنی ڕێکخراوێکی جیهانی نێودەڵەتی بۆ هەموو لایەنێکی ژیان سیساسی و ئابووری و سەربازی و تەندروستی

و هەتا بۆخۆشی و رابواردنیش هەنگاوەکان ڕوون بوو بۆ دروستکردنی حوکمەتیکی جیهانی حوکمی جیهان بکات بە ئاسن و ئاگر لەپشت بەربەستە گوڵەکانەوە .

هەریەک لەو ڕێخراوانە کۆمەڵی بەند و یاسای خۆی هەیە کە دەبی وڵاتی ئەندام بوو تێیدا قبووڵی بکات ، واتا حوکمەتی جێبەجیکاری وڵات دەبێت یاساکانی نەتەوەیەکگرتووەکان قبووڵکات هەتاوەکوو وەربگیریت لەرێخراوە جیهانیەکانی تر لەسەرووی هەمووشیانەوە بانکی نێوو دەوڵەتی و ئەنجومەنی ئاسایش ، کەوایا موومکین نیە وڵاتێ ئەندام بوو دەبی یاساکانی نەتەوەیەکگرتووەکان قبووڵکات هەتاوەکو وڵاتەکەی پارەدار بێت ! و خاوەنی ئاووری بەهێز بێت ! و جەنگی لێ نەبێت سەرەرای ئەمەش هەندێ جار هەر قبووڵی دەکات بەڵام ئەوان هەر فەقیر یان ئاژاوەی تێ بەرەدەن ! کەوایا ئیبلیس سیادەی خۆی لەنەتەوە یەکرگرتوەکان داناوە ! بۆیە هەرکەسێک وەر بگریت دەبێ ببێتە بەرداشی و پەیڕەی جێبەجێکردنی پلانەکانی !

بۆیە بەفەرمی لەدوای ساڵی 1991 وە بەشێوەیەکی فەرمی حوکمی سیستەمی نوێی جیهانی دەسی پێکرد ، یاوەران و سەخەرانی سیستەمێ نوێ جیهانی جیهان دەبەنەوە ژێر یاساکانی لوسیفەر یان ئیبلیس ! بۆ بەدەست هێنانی ئەمەش هەوڵەدەن بۆ پێکهێانی حوکمەتێکی جیهانی و سوپایەکی جیهانی و ئابووریەکی جیهانی لەژێر سایەی ئۆلی گارشیای بەریتانی کە سەرکردایەتی ئابووری جیهان دەکات

جیهان لەمڕۆدا دیکتاتۆرێکی شاراوە حوکمی ئەکا بەپاڵ پشتی و هێزی کۆمەڵەیەک ناویان لەخۆیان ناوە نەتەوەیەکگرتوەکان ئەوەش وەک دەزانین ئیبلیسە ! بۆ قەناعەت پێهینان و ڕازیکردنی خەڵکیش موومکین نیە دەبێ وێنەی نەتەوە یەکگرتووەکان جوان نیشان بدرێت لەڕێگای کۆکردنەوەی و یەکخستنی ئەورووپا و کۆتایی هێنان بە

بیرەکانی دیکە کۆکردنەوەی خەڵکی لەژێر چەتری سەرمایداری و عەلمانیەت و لەژێر یەک مەبدەئی فیکریدا ، رۆبێرت سۆن لەکتێبەکەیدا پیشبینی قەیرانێکی ئابووری زۆر زەق ئەکات کە لەداهاتوودا توشی جیهان دەبێ ئەوقەیرانە وا لە ئەمریکا دەکات سیادەکەی بباتە نەتەوەیەکگرتوەکان و لەوێشەوە دەبێتە سەرۆکی جیهان و لەوێشەوە حوکمدەکات بەپیی مەبدەئەکانی دینی مرۆڤگەری عەلمانی بەبێ بوونی هیچ تەشریعێکی خوودایی واتا سرینەوەی دین لەسەر ڕووی زەوی و گۆرینەوەی بەدینکی دەسکردی مرۆڤ هەروەک ڕوونە هەموو دەستورە دەسکردەکان ڕووی زەوی هەمان ئیشی لات و عووزا و ئەکەن بەڵام بەشێوازێکی مۆدێرن ! ئیبلیس لەمڕۆیا خەڵکی هان نادات بۆ بت و سەنەم پەرستن ! بەڵکو دەستور و یاسا نوسراوەکان لەمڕۆیا بەکاردێنێت لەباتی یاسای خودا دەیکاتە قورگی خەڵکیدا !

دامەزراوەی (جۆم بێرش )لەساڵی 1991 ڕایگەیاند لادانی بەربەستەکان لەپێش بازرگانی جیهانی لەلایەن ڕێکخراوێک بەناوی " جاد " و ڕێکەوتنە بازرگانیەکانی دیکە و کەرتی جیهانگیری جگە لە چەن هەنگاوی بۆ دروست بوونی سیستەمی نوێی جیهانی هیچی کە نیە لەکۆتایی ڕێرەویشدا هێزی سەربازیەکان بەکاردەهێنریت بۆ ڕووبەروو بونەوەی هەرکەسی نەیەوی بەشداری جیهانە نوێیەکە بکات و هێزە ئاشتی پارێزەکانی نەتەوەیەکگرتوەکانیش جگە دەسپێکیکی ئەو هێزە سەربازیە جیهانیە لەداهاتوو دێتە دروست بوون هیچی کەنیە ، هیچ کەسێک بۆی نیە لەدەستووره دەس نوسە دروسکراوەکان ئیبلیس لابدات !

جۆن ماکمانۆس سەرۆکی یەکێ لەڕێخراوەکانی گەشەپێدانی سیستەمێ نوێی جیهانی دەڵی ئامانجەکە بریتیە لە ڕووخانی سیادەی گەلان لەرێگای ئابووریەوە لەکۆتایدا گەر پێش بەهەموو ئەمانە نەگیری ئەوا سیسەمە نوێیەکە دەرەکەوێ ، ئازادیش دەبێتە تەنها بیرۆکەیەک و

جیهانیش لەلایەن 13خێزانەوە بەڕێووە دەبرێت کە ناوی هەنێکیان ئەمرۆ وابەرە بەرە دەرەکەوێت ئەم وتارە پێش سی ساڵ پێش ئێستا بڵاوکرایەوە بەڵام وادەبینین ئەوەی تێیدا وتراوە بەراستی وادەردەکەوێت ، تۆیەک پێت وایە هیچ شتێ وا بوونی نیە و دنیا خۆی وا دەڕوات ، ئەمە وتەی خۆیانە نقڵمان کردووە بۆتان جا ئایا کەی لەو فێلە ئیبلیسیە بەئاگا دێنەوە ! بەڵی بیردۆزی پلانگێری بوونی هەیە لەئادەمەوە هەتا خاتەم بوونی هەیە بەتایبەتیش لە سەردەمی کۆتایی کە کۆتا زەمانە زۆر زیاترە ! ئیبلیس تەنها وەسواس ناکات لەناو خوێندا !

بەڵکوو ئیبلیس خاوەن سندوقی نەختی نێودەوڵەتیە ، کارگەکانی چاپکردنی دۆلاری لایە ! ئیبلیس خاوەن دەیان سووپایە !

دەیان دەزگای ڕاگەیاندنە ! دەیان دەوڵەتە !

خاوەنی سەدان هەزار پیاو و سەربازە !

پێت وایە هێشتا بەوەسواس تۆ فریودەدات؟!

وێنەکەش جۆرج بۆش و پوتین و سەرۆکی چین هوو جین تاو لە لووتکەی کۆبوونەوەی ئاسیا بۆ هاوکاری بازرگانی لە زەریای هێمن لە 19ی 11ی 2006

## ● سیستەمی دەجال

دیاردەیەکی زۆر باو هەیە کە کۆمەڵگاکان لەناو ئەبا لە دەیەکان پێشوو کۆمەڵگای ئەوروپای لەنێو برد بەتەواوی مەبەستم لە دژایەتی کلتور و عورفی خەڵکە نەک شارستانیەتی ئیسلامی ، چون زۆر لەمێژە ئەم شارستانیەتە لەناو براوە و بۆغزێنراوە نەک ئیسلامی بەڵکو لەئەوروپا شارستانیەتی مەسیحیەتیش لەناو براوە زۆر لەمێژە ! سیستەمی نوێی جیهانی بەڕوونی دەیلێم ئیبلیس دەمێکە ژن بوون و خێزانی ئەوروپی لێکهەڵوەشاندووە ، خێزانی ئەوروپی لەسەر عورف و کلتوری

ئەورووپی دروستەبن لەسەدەی پێشوودا بەتەواوی دابوونەریتی ئەورووپیش گۆڕدرا ، ئەوەی لەوێ ماوەتەوە ئێستە کلتوری زۆر کاڵە کە بەدواکەوتویش دادەنریت ، بۆیە خێزانی ئەورووپی ئێستا نەماوەتەوە ! شتێک نیە بەناوی فامیلی بەمانای خۆی ! گەریش هەبێ ئەو ژن و پیاوە ماڵێکدا پێکەوەن نەک ژیان !

لاتان سەیر نەبی لەناو کۆمەڵگای ڕۆژهەڵاتیدا زۆر لەمێژە وەک ئەورووپیەکان شارستانیەت و دەسەڵاتە دینیەکە ڕووخاوە ئەوەی ماوە تەقلیدەکان و دابوونەریتە ئەمەش بۆ ئیبلیس و سیستەمی نوێ قبووڵکردن نیە دەبێ ئەم بلۆکەش بشکێنن ! ئەم پرۆسێسە گەورەیە بە ڕاگەیاندن و سووپا و پارە دەسیان تێی داوە بێگومان بۆ کۆمەڵێ ئامانجە گرنگترینیان بریتیە لە :

( ئامادەکردنی خەڵک بۆ سیستەمی گشگیری جیهانی یان ناوە دینیەکەی "سیستەمی دەجالی " دووبارە داتاشینەوەی حەزەکان و خولیاکان بۆ خەڵکی و لەهەمووی گرنگتر ئەم خولیاو حەزانە بۆ مرۆڤی مۆدێرنی بنیاد دەنەن تەنها لای سیستەمی دەجال بەردەستە ! )

سندووقی نەختێنەی نێوو دەوڵەتی ! درۆ گەورەکە! ئابووریناسانیش نازانن بەتەواوی ئەم سندوقە داهاتەکەی لەکوێیەوە دێت ! ئەوەندە زۆرە قەرز بەهەموو وڵاتان دەدات بە ترلیۆنان دۆلار ! لەکوێیەوە سەرچاوەکەی !! ئەمرۆ خۆشگوزەرانی وڵاتانی مۆدێرن لەسەر ئەم سندووقەیە ! دروست بوونی ئەورووپا دوای جەنگی جیهانی دووەم لەسەر حسابی ئەم سندووقە بوو !! گەشەسەندن ئەمریکا و وڵاتانی تریش هەمان شێواز ، ئەو شتەی مرۆڤ خولیایەتی و حەزی لێکات بە پارەیە ! ئەمرۆ پارەش لەسندوقی نەختێنەیە ! کەوایا بەرە بەرە تێدەگەین ئێمە مولزەمی کۆمەڵێ حەز کراوین پێشمان دەڵێن بۆهێنانەدی داوا لە نەختینەی نێودەوڵەتی بکەن بەڵام ئایا نەختێنەیەک لەلای

ئیبلیس بێت بەکێی  دەدات !؟ ئایا تۆ دووژمنایەتی ئیبلیس بکەیت پارە و قەرزت پێ دەدات ؟؟ یان لەناوت دەبات !

یاسایەک هەیە دەڵێ گەر دەتەوێ هەر کۆمەڵگایە دروستکەی یان لەناوی بەی لە ژنانەوە دەسپێکە ، گەر بێت و ئافرەتان لەسەر شەرعی خوا پەروەردە بکرێن ئەوا جیلێکی تەواو لەسەر خوا پەروەردە بێت کە بەهێزن و نابەزێن  بەڵام پێچەوانەکەی زۆر ترسناکە ئەمرۆش ئەم ترسناکیە وا ڕوودات

لەڕۆژئاوا چۆن زەواج لەناوچوو ؟

سەرەتا یاسایەک هەیە کە ژنان وادەزانن باشترین یاساکانی رۆژئاوایە ، هەرپیاوی هەستا بە هێنانی ژنێک و تەڵاقی با ئەوا ئەبی نیوەی سامانەکەی پێبات ، لەهەمان کاتدا رێخراوە فێمینیزمیەکان هەوڵەدەن ژنان ڕاپەرێنن لەدژی پیاوان بۆ تەڵاق ، تەڵاقیش بووە بە بردنی نیوەی سامان ، لەئەنجامی ئەم موعادەلەدا  لەکۆتایی ڕێرەوەکەدا پاڵنەرەکانی زەواج وەستان لەڕۆژئاوا ، بۆیە ئامارەکان دەڵێن **61%** پیاوان زەواجیان ناوێ ، پەیوەندیە ناشەرعی و نایاسایی  دەوێ  چونکە زەواج دەبێتە هۆی ئەگەری لەدەست دانی نیوەی سامان  ، بەم شێوازەش پشتگیری پەیوەندیە ناشەرعیەکان دەکرا بەشێوازی ناراستەوخۆ بێگومان ئەمەش بزمارێکی دیکەیە ئیبلیس لە تابوتی کۆمەڵگای ئەورووپیداوە  !

کۆمەڵگای ئەورووپی ئەمرۆ بەدەست دیاردەیەکی نامۆوە دەناڵێینی بەناوی منداڵی بێ باوک ! بۆیە زۆرێ لەئافرەتەکان دەستیان داوەتەوە لەباربردن لەترسی هەڵگرتنی بەرپرسیاریەتیەکە بەتەنەهایی ، هەندێ وڵات حەپی مەنع بە خۆرایی دابەشەکات بەسەریاندا بۆ رێگری

زۆربوون وکەمبوونی دانیشتوانی جیهان ، لەمرۆژشدا ولاتانی ڕۆژئاوایی بانگشەی زەواجی ژن بۆ ژن و پیا بۆ پیاو دەکەن

"هاورەگەزبازی" بەبی جێ بەجێ بونی یاسای بردنی نیوەی سامان ! بۆ پشتیوانی و هاندان هاورەگەزبازی ، هەرچەن زۆرینە کۆمەڵگای ئەورووپی رەتیکەنەوە بەڵام لەرێگای فیلم و راگەیاندن و یاساوە بەزۆر دەیکەن بەگەروی خەڵکیدا لێرەشەوە بزمارێکی دیکە درا لە تابوتی کۆمەڵگای ئەورووپی لەلایەن ئیبلیسەوە !

بۆیە هەرکات زیاتر کۆمەڵگا نغرۆی ئارەزوو و ویستەکان بوو حوکمردنی ئاسانترە زۆر لە کۆمەڵگایەکی بەئاگا لەداهاتووشدا خەڵکی بانگدەکەن بۆ مادگەرایی ڕۆحانی دەیکەنە بەدیلی دین لاتان سەیر نەبێ خەڵک ژیانی دەوێ و پارەی دەوێ ئامانجی ژیانی خەڵک خۆشگوزەرانیە لە خوودی دوونیادا ، پارە و خۆشگوزەرانی مۆدێرن لای ئەو سیستەمەیە ، بۆ ئەوەی مشتی پارە و خۆشگوزەرانیت پێبەن هەرڕۆژێک کوفرێکت پێدەکەن !

جەنگ وا لەدەرگایە و کات نیە بۆ بەئاگا هێنانەوەی خەوتوەکان وا دەبینین ساڵی 2020 کۆتایی ساڵی ڕاستەوەرەکان بوو و بڵاو بوونەوەی کۆرۆنا و ڤاکسین فەرزکردن ، کردنەوەی دەیان بەدکاری لە خاکێک کە ئەمر بەچاکە و نەهی لەخراپە دەکرا تێیدا (شارستانیەتی ئیسلامی ) کەواتا بەئاگابن و بزانن ئێمە لەکۆتا زەمانی ئەم زەویەین ، کۆتایی جەنگەیە ئیبلیس سووپا و هێزەکانی یەکخستووەتەوە ! تۆش خۆت یەکلاکەوە لەگەڵ سوپا ڕۆچووەکەی نێوان مەکە و مەدینەی ! یان ئەوەی قوستەنتینیە بە الله اکبر فتح دەکات !

## ٤ _ جەنگی جیهانی سێیەم

### جەنگی جیهانی سێیەم و دوو جەنگە جیهانیەکە

دەزانیت گەر ئۆکرانیا ببێتە ئەندامی ناتۆ و بریاریدا نیمچە دوورگەی قرم بگرێتەوە بەهێزی سەربازی ، ئەوە وڵاتانی ئەوروپا بەشێوەیەکی ئۆتۆماتیکی دەکەونە جەنگەوە لەگەڵ رووسیا ؟ ، بەتئکید هێزی روسیا و هێزەکانی ناتۆ بەراورد ناکرێت بەیەکدی ئەوان زۆر بەهێزترن ، ئێمە ئەوە دەزانین ، بەڵام لەوەش تێدەگەین کە ڕووسیا یەکێکە لە وڵاتە گەورەکانی خاوەن چەکی ناوەکی لەم ڕووەشەوە لەزۆربەی وڵاتانی ناتۆ پێشکەوتوترین بۆیە بە راشکاوی دەیلێم لەم جەنگەیا هیچ کەس براوە نابێت !

. " پوتین"

شانۆگەریەکانی جەنگی جیهانی سێیەم بەڕابەرایەتی ئەمریکا دەستپێکردووە هەرکەس دەیەوێ لەم جەنگە تێبگا سەرەتادەبێ لە دوو جەنگی جیهانیەکە تێبگا ، هەریەکەیان ستراتیجیەتی ئەمریکا ئاشکرا دەکات ، جەنگ چێژێک نیە ، یان ژەمێک ئەدرینالین نیە داخلی خوێنی عەوام بکرێت ! بەڵکو وێرانی و خەفەت و بنیادنانەوەیە هەموو نەتەوەیەک بەئاواتی بردنەوە جەنگ دەکات ، ئەمرۆ کات نیە بۆ ڕوونکردنەوەی زۆر جەنگ وا لەپێش دەرگایە، ئێمە ترسناکترین بەشی پیلانەکەتان بۆ پیشان دەدەین کە بەندەکانیان دارشتووە بەدرێژایی ساڵان دەزانین دەسکەوتەکان بەخوێن بەدەست دێن چون ئەمە ڕاستی سەدەی شەیتانەکانە .... دوای دەسپێکی سەدەی بیستەم دەستکرا بە جێبەجێکردنی پیلان و هێنانی جەنگ ئەمەش درێژ بووەوە هەتا کۆتا داوی ئەمریکا بۆ ڕووسیا ، ئەمە چیرۆکی جەنگی

جیهانی سێیەمە کە پێش بیست ساڵ دەستی پێکرد و ئێستا سەرەتاکانی دەرکەوتووە...

پێشتر باسی ئەوەمان کرد ئەمریکا چۆن ڕووس دەباتە داوی ئۆکرانیاوە بەناچارکردنی بۆ ڕۆشتنە نێوو جەنگەوە و ترساندنی ئەوروپا بە ڕووسیا بۆ چەن ئامانجێ کە ڕوونمانکردەوە ، ئێستاش باسی سیناریۆکانی کۆنتان بۆ دەکەین کە نوسراوە بۆ ئەوەی ببێتە بروسکەی و چەخماخی جەنگی جیهانی سێیەم کە ئەمریکا هەوڵەدات بەهۆیەوە ڕووس و چین پێ لاوازبکات و ئەورووپاش بخاتە ژێر چەتری پیلانگێری خۆیەوە ، ئەم ئاماژانەش بەڵگەن بۆ ڕووخانی سیستەمێ نوێ جیهانی و بەڕێکردنی مرۆڤایەتی بەرەو یەک وڵات و یەک سوپا لەژێر حوکمی یەک پاشادا بەڵام ئەمجارەیان بابەتەکە بەوشێوەیە نابێ کە پیلانیان بۆداناوە چەندین ساڵە ، خەڵکی ئەمرۆ پێویستە بەئاگا بن لە سیناریۆی جەنگی داهاتوو بۆ زانینی پێویستە سەرەتا سیناریۆی دوو جەنگە جیهانیەکە بزانین ئەوەش لەرێگای ناسینی براوەی دوو جەنگەکەوە کە ئەمریکا براوە بوو وخوودی خۆشی هەڵگیرسێنەری بوو بەبێ زانینی هەنگاوەکانی هەڵگیرسانی ئەم دوو جەنگەش هەرگیز سیناریۆ و ئاژاوەکانی جەنگی سێهەمی جیهانیش نازانیت

شێوازی هەڵگیرسانی دووجەنگە جیهانیەکە و جەنگی سارد ، چون بەزانینی شێوازی هەڵگیرسان و تەکتیکاتی بۆخۆتان جەنگی جیهانی سێهەمیش دەزانن...

دوو جەنگە جیهانیەکە

هۆکاری سەرەکی جەنگی جیهانی یەکەم لەلای خەڵکی عەوام ، کوشتنی شازادەی جێنیشینی نەمسا

( فرانس فێردینانس ) بوو  بەڵام ڕاستیەکە زۆر دووره لەم چەواشەکاریەوە ....

جەنگی جیهانی یەکەم لە دەسپێکی سەدەی بیستەم دەستی پێکرد بەڵام 150 ساڵ پێشتر ئامادەکاری بۆ ڕوودانی دەکرا ، کاتی کە بەریتانیا وەک گەورەترین هێزی جیهان دەرکەوت لەساڵی 1776 بەدواوە دەستی کرد بە کۆنترۆڵکردنی هەرێمەکانی دیکە لەرێگای سیاسەتێکەوە کە هەموو کات بەکاری دەهێنیت ئێستاش بەکاری دەهێنیت ئەویش رەگەز پەرستی و نەتەوایەتیە ، جیهانی بەش بەش کرد و پەرت و لاوازی کردن و خستیە ژێر چنگی یەک جەمسەرەوە بەلاوازی  ئەمە پیلانگێری ئینگلیز بووە بەدرێژایی مێژوو بۆ لاواز کردنی بەرامبەرەکانیان نەک هەرئەوەندە تەنانەت گەلەکانی یەک نەتەوەی دابەشکرد و کردیانی بەدووژمنی یەکدی ئەوەتا دەبینن عەرەب هەمووی یەک نەتەوەن کراون بەچەند دەوڵەتێکی لاوازەوە! هەریەک پیاوی لایەکە ! هەمان شێواز کۆریاش ... هتد

سەرەتا سەدەی نۆزدە جەنگ و ئاژاوەی سنوری لەنیوان بەلشەفیەکان واتا ڕووسەکان و هاوسنورە ئەوروپیەکانی لە ئەڵمانیا و نەمسا دەستی پێکرد لەژێر هەژموون و کاریگەری دینیدا واتا مەسیحیەت  ، دواتریش ئاژاوەو کێشە هەرێمیە کۆنەکان لەنێوان فەرەنسا و بەریتانیا دروست بوو  ، کە وەک وتمان بەریتانیا لەوکاتەدا بەهێزترین بووە ، بەریتانیا لەنێو خاکی عووسمانیدا هەیمەنەی و سیادەی دەرکەوتبوو بەتایبەت لەساڵی 1898  ، ئیدی لەوە بەدواوە هێزی عووسمانیەت بەهۆی هەڵگەرانەوەی والیەکان لەقسەی خەلیفە و چونە ژێر هەیمەنەی ڕۆژئاواوە بەرەو لاوازی چوو لەئەنجامدا نغرۆکرا لە ئاژاوە و کێشە و جەنگ لەگەڵ ڕووس وە نوقمی خیانەت و هەڵگەرانەوەی ناوخۆیی کرا وای لێهات پێی دەوترا پیاوە نەخۆشەکە !  ، کەواتا یەکێ ئامانجە گەورەکانی جەنگی یەکەمی جیهانی داگیرکردن و هاتنی هێزی زەمینی

ئینگلیز و ڕۆژئاوابوو بۆ خاکی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست لێرەیا خاڵی گرنگ هەیە کە هۆکاری هاتنی ڕۆژئاوا زۆر شت بوو ....

یەکەم: لەوانە کۆتایی هێنان بوو بە دراوی سکەی عووسمانی چونکە ئەم دراوە ڕێگر بوو لەدروستبوونی دراوی کاغەز و بانکی جیهانی بۆیە دەبوو بروخایە کەواتا نەخشەکە دروست کردنی دۆلار بوو دواتر بەرامبەرکردنی دۆلار بەزێر و دواتریش دۆلار بەنەوت ، ئاخۆ کاغەزی چ بەهایەکی هەیە گەر پیلانگێری ئینگلیز و سیادەی ئۆلیگارشیا نەبێت !!!

دووهەم : دەس بەسەراگرتنی سامانی بەپیتی ژێر دەستی عووسمانیەکان وەک نەوت و کانزاکانی ژێر زەمین هەتا ئێستەش ئەم سامانی ژێر زەمینە دەگەریتەوە بۆ بانکی بەریتانی وەک زانیاریەک بۆ ئێووە و نموونەیەکی بچووک نوری مالیکی سەرۆک وەزیرانی پێشووی عێراق 770 ملیار دۆلاری ناردووە بۆ بانکەکانی بەریتانیا لەماوەی سەرۆکایەتیدا ئەمە جگە لە کاربەدەستانی دیکە ! ڕوونە ئاوەدانی و پێشکەوتنی ڕۆژئاوا لەسەر حسابی وڵاتانی داگیرکراوە بەتایبەتیش وڵاتانی ئاسیا ناوەراست و ئەفریقا! کاکی عەلمانیش دێ دەڵی دین هۆکاری دواکەوتوییە !! سەیری ئەو خەڵەفاندنە ئیبلیسیە !!!!

سێیەم : پارچە پارچەکردنی وڵاتانی ژێر دەستی عووسمانیەکان بوو بۆ چەندین دەوڵەتی بچووک و لاواز لەڕێکەوتنامەی لۆزان لە 1923 پاشان دروستکردنی ململانێ و جەنگ بۆیان بەزیندووکردنەوەی قوتب و هیلالی شیعی بەرابەرایەتی خومەینی بۆ ڕاگرتنی تەوازنی هێز لە ڕۆژهەڵاتی ناوەراست و لاوازکردنی زیاتری یەکدی ، هەمووشیان واتا ( وڵاتانی ژێر دەستی عووسمانی) بەلاوازی دەگەرینەوە ژێر قوتب و جەمسەری پیلانگێری جیهانی بەتایبەت سیادهی ڕۆژئاوا بۆ پاراستنیان لە شەر و لاوازی لەدەستی یەکدی !

بەم شێوازە جیهان بەرە بەرە نغرۆی جەنگ و ئاژاوە و ملمانێ دەبوو لەکۆتایەکانی سەدەی نۆزدەهەم ئەڵمانیا و نەمسا نزیک بوونەوە لەیەک هەردوولا کێشەیان هەبوو لەگەڵ ڕووسدا ، ڕووسیاش هاوپەیمانی بەست لەگەڵ فەرەنسا ، فەرەنسا لاواز بوو توانای بەرگری نەبوو بۆیە لەسەرەتای سەدەی بیستەمدا بەریتانیا هاوپەیمانی گرێدا لەگەڵ دووژمنی کۆنی فەرەنسا و سلاڤینە ڕووسەکان بەڵام ئەڵمانیەکان لەگەڵ نەمسا و مەجەر هاوپەیمان بوون و عووسمانیەکانیش بەناچاری بوون بەهاوپەیمانی نەسما و ئەڵمان چونە جەنگەوە ، پاشان ئیتاڵیەکان جەنگی ڕووسیا و ئەڵمانیا قۆستەوە زەبرێکی کوشندەیان لە عووسمانیەکان دا ئەمەش هاوکاریە باشی ڕووسیا و سربیا کرد ، بەم شیوازە ناوچەکە بوو بە چەندین پارچەوە و هەریەک لەلایەکەوە جیهان هەمووی شۆرشی دەکرد و دەکوڵا هەتا ئەوکاتە کە شازادەی جێنیشینی نەمسا کوژرا ، شازادەی جێنیشینی نەمسا لەلایەن سربیاوە کوژرا ، من وەک پیلانگێریەک دەیبینم ئاخر چۆن دەکرێت کە شازادە گەشتێک بکا بۆ ناو وڵات و ڕێرەوی گەشتەکەی لە ڕۆژنامەکان بڵاوکرێتەوە ؟؟؟ ئەو کەسەی ویستی بیکوژێ جاری یەکەم بۆمبێکی دانا بەهەڵە بەسەیارەیەکەی دیکە تەقیەوە ، بەڵام شازادە خۆی نەپاراست بەڵکوو چوو بۆ نەخۆشخانە بۆ سەردانی بریندارەکانی تەقینەوەکە !! لەباتی خۆپاراستن بۆیە لەڕێگادا هەمان کەس دەسرێژی لێکرد و کوشتی و جەنگ دەستی پێکرد !

بۆ ئەوەی ئەلمانیا و عووسمانیەکان و نەمسا بخرینە جەنگەوە دژی ڕووس هەموو ناوچەکەش کەوتە جەنگەوە سوود مەند تێیدا ئەمریکیەکان بوون لەو ماوەشدا ئابووری و سەربازی وڵاتان لاواز دەبوون و ئەمریکا بەشداری ناکرد تەنها لە چەن مانگی کۆتا نەبێ بۆئیمزای سەرکەوتن و بردنی دەسکەوتەکانی ئەو جەنگەی کە خۆی دووبارە دەستی پێکردووە ، ئەو جەنگانەش هوکاری سەرەکی بوون بۆ بوونی ئەمریکا بە زلهێزی جیهان ، وڵاتان کاول بوون و سوپاکان لەناوچون و خەڵکان مردن ، ئەمریکاش بوو بەخاوەنی شۆرش و

دەسکەوتەکان دوای جەنگی جیهانی یەکەم ئەڵمانیا وەک خۆڵەمێش لێکرابوو ئیتاڵیاش گەڕاوە بۆ هاوپەیمانی ئەڵمانیا چونکە بێبەش کرا لە دەسکەوتەکانی خاکی عووسمانی و سنوری دەریایی خاکی یۆنان ، بۆیە ئەمریکا هەستی بەترسیکی واقعی کرد و هەمان سیناریۆی رووسیا ئێستای بەرامبەر هیتلەر بەکار هێناوە ڕێگای بۆ نازیەکان کردەوە ببنە هێزی گەورە و بەهیز لە ئەوروپا بەرامبەری ڕووسیا کۆنە دووژمنی بگرن لەهەمان کاتدا ئەوروپای پشتگوێخست و ئاسانکاری کرد بۆ داگیرکردنی خاکەکەی لەلایەن نازیەکانەوە ، ئەڵمانیا چونکە لایەنی دۆڕاو بوو لەجەنگی جیهانی یەکەم بەناچاری رێکەوتن نامەی ڤێرسای پێکرا سوپای ئەمەش بریتیبوو لە :

یەکەم : نەهێشتنی سووپای ئەڵمانیا لەسنوری فەرەنسا

دووەم : کەمکردنەوەی سووپاکەی بۆ 100 هەزار سەرباز

سێیەم: دابەشکردنی خاکەی و جیاکردنەوەی پۆڵەندا

چوارەم : ڕێگری لەدروستکردن و کرینی فڕۆکە

هیتلەر هیچ گرنگی بە ڕێکەوتن نامەی ڤێرسای نەدا ، سەربازی کرد بە ئیجباری و سوپاکەی بەهێزکرد و فڕۆکەی دروستکرد هاوپەیمانان هیچیان نەکرد !! پاشان سوپای نارد بۆ سنوری فەرەنسا دیسان هاوپەیمانان هیچیان نەکرد !! ئیستراجیەتی هاوپەیمان بۆ بەهێزبوونی هیتلەر بوو بەم شێوازە بوو :

هیتلەر : ئەو شتەم دەوێ

هاوپەیمانان: نەخێر نابێت بەدەستی بهێنیت

هیتلەر : بەدەستی دەهێنا

هاوپەیمانان : باشە بەڵام داوای زیاتر مەکە

**بۆیە لەساڵی 1938 سوپای ئەڵمانیا چووە نەمساوە بێ بەرگیری داگیری کرد ، هاوپەیمانان هیچیان نەکرد ! پاشان نیازی چیکسلۆفاکیا هەبوو بەڵام هاوپەیمان لەگەڵی کۆبونەوە و ناوچەی سۆدیتیان پێدا کە زۆرینەی ئەڵمان بوو لەبەرابمەری ئەوەی باقی چیسلۆفاکیا داگیر نەکات بەڵام دواتر داگیری کرد هاوپەیمانان هیچیان نەکرد !!!**

**لێرەوە دەزانین ڕێگا بۆ هیتلەر کرایەوە لەلایەن هاوپەیمانان بەسەرۆکایەتی ئەمریکا! ئامانجەکەش بریتی بوو لە**

**یەکەم : لاوازکردنی ئەوروپا تەسلیم بوونی بە ئەمریکا**

**دوو : لاوازکردنی ڕووسیا لەڕووی سەربازی و ئابووری**

**سێ : بەهێزبوونی ئەمریکا ، چونکە لەماوەی جەنگەکە ئەوروپا چەک و کەرەستەکانی لە ئەمریکا دەکڕی بۆیە ئابووریەکەی فڕی لەکۆتای شەرەکەش بەشدار بوو و پشکی شێری لە دەسکەوتەکانیش بەرکەوت !!**

**ئایا ئەمڕۆش هەمان سیناریۆ بەبەرگێکی نوێیەوە نیە؟**

## ٥ _ دەسپێکی هەرمەجیدۆن

◆دەسپێکی هەرمەجیدۆن و دەجال و سوپای مەهدی.

لەدوای ئەوەی یاری ئەمریکات زانی لە پێشوودا

، ئێستا ئاسانە بزانی چی ڕوو دەدات تەنها ئەوەندەت لەسەرە چاوت بکەیتەوە بەهێمنی دیقەتبەیت ، ئایە ئەوەی ئێستە ڕوودەدات هەمان سیناریۆ و هەمان یاری هەمان میکانیزمی پێشووتر نیە کە لە جەنگەکانی یەکەم و دووەمی جیهانی بەکار دەهات ؟ ! بۆنا مەگەر نوسەرەکە و جێبەجێکارەکە و پلاندانەرەکە هەر ئەمریکا نیە ؟ بۆجارێ سێەم لەسەر یەکە ڕووسیا کراوە بە بروسکەی شەرێک لەرێگای داوێکەوە بەدەعمی ئەمریکا بۆ ڕاکیشانی ڕووسیا بۆ جەنگێک کە چەن دەیەکە پیلانی بۆدانرێت ، پرسیارەکە ئەوەیە ئایا جەنگی ڕووسیا و ئۆکرانیا دەبێتە دەسپێکی بۆ جەنگی جیهانی سێیهەم ؟ بەتایبەتیش سەرکردەکانی ئەوروپا ڕێگری لێدەکەن دروست بێت لەترسی درێژە کێشانی جەنگەکە و دووبارە چونە ژوورەوەوە بۆ جەنگی کە وڵاتەکانیان لەناوەوە بۆ دەرەوە وردو وخاش دەکات پاشان دەبێتە جەنگی گشتی جیهانی هاوشێوەی جەنگەکانی یەکەم و دووەمی جیهانی وڵام دانەوەی ئەم پرسیارەی سەرەوە ئەوانە لەخۆ دەگری کە ڕوویان داوە لە پەنجاکانی سەدەی پێشووەوە هەتا دەسپێکی سەدەی بیست و یەک ، واتا جەنگی ئۆکرانیا و ڕووسیا جگە دەسپێک و درەوشانەوەیەک بۆ جەنگێکی گەورە هیچی کە نیە ...

بهێلە ئەو یاریەت پێ بناسینم لە جەنگی ناوخۆی نیمچە دوورگەی کۆریا لەساڵی 1950 ڕوویدا ، نیمچە دوورگەکە کرابووە دووبەشەوە باکورو باشوور ، بەشی باکوری لەژێر دەستی یەکێتی سۆڤیەت بوو بەشی باشووری لەژێر دەستی لیژنەیە کاتی نەتەوەیەکگرتوەکان بوو بە سەرۆکایەتی ئەمریکا ، سیاسەتی ئەمریکا هەموو کات هەوڵی

دووبەرەکی و ناکۆکی دەدا لەرێگای نەتەوە و ڕەگەزەوە هەر بۆیە لەهەمان ساڵدا کۆریا باکوور هێرشی دەسپێکرد بۆسەر بەشە باشوورەکەی کۆتایی پێ هات بە دابەشەکردنی بۆ دوو کۆریا و دروست کردنی بۆمبێکی تەوقیتکراوی حازر بۆ دەسپێکردن بەجەنگ هەربۆیەکۆریای باکوور دەعم و پشتیوانی هاوپەیمانێتە کۆنە سۆڤیەتیەکە دەکات(ڕووسیا) و چاوەروانی کاتێکی گونجاو دەکات بۆ لێدان لە کۆریایی باشوور و هێنانەوەی بۆ ژێر دەستی کیم ! ئەمەش بۆمبی یەکەمە !

لەناوەراستی سەدەی بیستەم ئەمریکا دەستی کرد بە یارمەتی دانی تایوان بۆ دروستکردنی بۆمبێکی دیکەی تەوقیتکراو لەنێوانیاندا لەگەڵ ئەو دوورگانەی هاوسنوری چین کە سەر بە تایوانە بەشێکی و سەرچاوەی سەرەکی پارچە بچوکە ئەلکرتۆنیەکانە بۆ چین بەم شێوازە داوێکی دیکە بۆ چین دروستکراوە بەجەنگ لەگەڵ دراوسێکان ،

چونکە ئەمریکا باش لە خەونی چینیەکان بۆ داگیرکردنی جیهان تێدەگات لەمڕۆشدا ئەو جەنگە هیچی وای نەماوە !

ئەمەش دووهەم بۆمبی تەوقیتکراو !

ئامانجەکە دوو بەشە یەکەم سازدانی جەنگی ڕووس لەگەڵ ئەوروپا دوو سازدانی جەنگی چین لەگەڵ وڵاتانی دراوسێی تایوان و یابان وکۆریای باشوور ئەمەش جەنگێکی بەوەکالەتە بۆ ئەمریکا لەهەردوولاوە بۆ لەناو دانی هاوپەیمانێتی ڕۆژهەڵاتی کە تەهدیدە بۆ هاوپەیمانێتی ئەمریکی ڕۆژئاوایی !

لەلایەکی دیکەشەوە هندیەکان و پاکستانیەکان میحوەرێکی دیکە دەبن پاکستان وڵاتێکی خاوەن چەکی ئەتۆمە لە هەشتاکانی سەدەی پێشووەوە بۆیە ئەمریکا دەیەوی ئەمەش بەجارێ بەهیندستان لەناوبات ! ئەمەش سێیەم بۆمبی تەوقیتکراوی حازرە !!

سەبارەت بە ڕۆژهەڵاتی  ناوەراستیش ئەوان لەتۆ زیاتر رابردووت دەزانن ئەوانەی لە کتێبەکان ولە قوتابخانەکان دەیخوێنن هیچ نیە جگە لە کتێبەکانی ئەمریکا نەبێ و مێژوویەک بەخواستی ئەمریکا!
بەبەهانەی دوورکەوتنەوە لە شەر و ئاشتیەوە ئایەتەکانی خوا لەناو کتێبەکانیشیان ڕێگە نادەن باس بکرێت بۆیە هیچ هاورێیەتیەک لە سیاسەت نیە هەموو بەرژەوەندیە ، بۆیە رژێمی شیعی رافیزی لەئێران پێش چل ساڵ زیندوو کراوە و بەکار هێنرا بۆ تەوازنکردنی هێزی سوونە لە ڕۆژهەڵاتی ناوەراست ، هەربۆیە هیلالی شیعی بەدرێژایی یەمەن و عێراق و سوریا و لوبنان درێژەی پێ دەدرێت ، ئەمەش چوارەم بۆمبی تەوقیتکراوە !!

لەلایەکی دیکەشەوە ململانێی نێوان ناتۆ و ڕووسیا بۆمبێکی دیکەیە وادەبینین تەقاوەتەوە ، کەواتا باش بزانین ئەوەی ڕاگری بۆمبەکان بووە و نەیتەقاندووتەوە خوودی ئەمریکا بووە بەڵام ئیدی دەست دەکرێ بە تەقاندنەوە !!!             یەکەم بۆمبیش نێوان ناتۆ و ڕووسیا بوو تەقیەوە

لێرەوە سیناریۆیی جەنگی سێیەمی جیهانی ڕوون دەکەینەوە.....

تۆ ئێستا بۆمبە تەوقیتکراوەکان جەنگی جیهانی سێیەم دەزانی  و جەنگی جیهانی سێهەمیش هەمان شێوازی دوو جەنگەکەی ترە

دەسپێکەشی بەسێ بارە خستنە جەنگی ڕووسیا ئەمجارە دژی ئۆکرانیایە کە بەوەکالەت بۆ ئەمریکا دەیکات و لە 1997 وە دوای ڕێکەوتن نامەی ناتۆ و ڕووسیا ناتۆ لەفڕاوانبووندایە و ڕێکەوتنەکە پێشیل دەکات بۆ ئەوەی ڕووسیا کاردانەوە بنوێینی و جەنگ بکات هەتا بە ئابلوقەی سیاسی و سەربازی دەوری بەن  بەڵام ڕووسیا یاریەکەی دەزانی ، ئەورووپاش جەنگی ناویست لە کیشوەرەکەی بۆیە فرێیان

دەداوە ئەفریقاوە بۆ دەساڵ لەوێبوو فرێیان داوە ڕۆژهەڵات ناوەڕاست بەڵام بەهۆی فشاری زۆری ناتۆوە و لاوازی رووسیا سەرەنجام گەشتەوە دەرگای و مەترسیە جدیەکە بۆ کیشوەری ئەوروپا لێرەشەوە جەنگە دەستی پێکرد بەڵام ئەمجارەیان جیاوازی هەیە جەنگی ئەمجارەیان کەس براوە نابێت ! وەک پۆتین وتێ ئێمە خاوەنی چەکی ناوەکین کەس براوە نابێت ! ئەنیشتاین دەڵێ نازانم جەنگی جیهانی سێیەم بەچی چەکی دەکرێ بەڵام دڵنیام جەنگی جیهانی چوارەم بەدار و بەرد دەکرێت !

◆دەجال

ئەمە سەرەتا نیە بەڵکو کۆتایی ڕێگاکەیە ، دانیشتم بۆماوەیەکی درێژ دیقەتی مرۆڤایەتیمدا پێش ئەوەی بنوسم هەستم بە بێ ئوومێدی کرد لەهەوڵدانم چون دەمزانی وشەکان بێ سوودن بەبێ کردار ! چ بایەخی بۆ تیۆر هەیە بەبێ واقع !

لە ئەنەسەوە ڕەزای خوای لێبی پێغەمبەری خوا سەلامی خوای لێبێت فەرموویەتی ، خوای گەورە هیچ پێغەمبەرێکی نەناردووە ئیلا گەلەکەی لە ئاشووبی ئەو کوێرە درۆزنە ئاگادارکردۆتەوە ، ئەو کوێرە خودای ئێووە کوێر نیە ، لەنێو چاوانی نوسراوە کافر

پەیوەندی نێوان ڕێخراوە نهێنیەکان و پیلانگێری جیهانی بە چیرۆکی دەجالەوە چییە؟ ئازاد بوونی دەجال و حوکمکردنی جیهان پێش دەرکەوتنی خۆی بەئاشکرایی چیە ؟ ، ئەوە دەیبینین ئەمرۆ حوکمکردنی دەجال و ئازادبوونییەتی؟

پەیوەندی نێوان سیستەمی نوێی جیهانی و دەجال چییە؟

لێرەوە دەتانبەین بۆ کۆمەڵی بیرکردنەوە کە دەبێتە هۆی گۆرانی ژیانتان  و فراوان بوونی بینینتان بۆ نیشانەکانی کۆتایی زەمان و سیستەمی کۆتایی ئیبلیس و دەجال

لەزۆرێک لە فەرموودەکان باسی دەجال جێگیربووە و گومانی تێدانیە هەرچەن یاوەران و سەرخەرانی ئیبلیس هەوڵدەن گومان دروست بکەن لە سیستەمی پیلانگێری و دەجال بەڵام من دەلێم دەجال سیستەمەکەی ئێستا وا لەناوماندایە ! لەگێرانەوەکەی تەمیمی داری بۆ دوورگە نەناسراوەکە ڕوون بووەتەوە دەجال مرۆڤێکە بوونی هەبووە لەکۆنەوە بەڵگەش لە فەرموودەکانی پەیامبەر علیه السلام  دەرچوونی دەجالە نەک لەدایک بوونی لەگێرانەوەکانی تەمیمدا دەجال کۆتکراوە و نزیکە وادەی  هاتن و دەرچوونی لێرەوە بەرێزان دەبێ بزانن هاتنی دەجال و  حوکمی شەخسی خۆی لەسەر زەوی سێ قۆناغە :

قۆناغی یەکەم : لەدایک بوونیەتی پێش سەردەمی پەیامبەر علیه السلام بە کاتێک کەس نازانی کەیە وچۆنە لەکوێ بووە بەڵام لەو ساتەدا لەزەوی خراپەکاریەکی زۆری ناوەتەوە

قۆناغی دووەم : کۆت و بەندکردنیەتی لەم قۆناغەدا پشت دەبەستی بە ئاژەلە بەناوی (جەساسە) ئەویش دروستکراوێکی مواوی سەیرە قسەدەکات بۆ بردن و  هێنان باسەکان بۆ دەجال

قۆناغی سێهەمیش : دوو بەشە بەشی یەکەمی ئەوەیە دروستکردنی سیستەمێک پێش دەرچوونی کەئەمەش هەر خوودی خۆی سەرپەرشتی دەکات دیارە ئەم سیستەمە ئامادەکردنی خەڵکیە بۆ  هاتنی و قبووڵکردنی !

**بەشی دووهەم : دەرچوونی خوودی خۆیەتی لە کاتێک نازانریت جگە لە خوودا خۆی نەبێ**

بەپێی فەرموودەکان ئێمە لەقۆناغی سێهەم بەشی یەکەمین !
لەوبەشەین دەجال حوکم دەکات لەپشتی وڵاتەکانەوە ! لەرێگای کۆمەڵێ نێوەندگیرەوە ! ئەمەش بەئاشکرا دەبینین چۆن جیهان بەرەو مەملەکەتی ئەودەبەن !! کەواتا دەجال ئەمرۆ لەسەر زەوی بوونی هەیە !! ئەمرۆ دەجال بۆتۆ بوونی هەیە ! ئەویش سیستەمەکەیەتی !
گەر لەو سیستەمە دەرباز بیت و رقت لێیبێت و هاوکاری نەبیت دەتوانیت لەدەجالیش رزگارت بێت ئەیچی گەر لەم سیستەمە ڕزگارت نەبێ ؟ !

دەجال خەڵکی فریودەدا لەرێگای واقعیەوە ! عەقلیەوە ! دینیەوە!
لەڕووی واقعیەوە ئەمرۆ خەڵک زۆرینەی پارە دەپەرستی ! دەجالیش خاوەنی بانکەکان و کارگەکانی چاپکردنی پارەیە !! سیستەمی دەجال کۆنترۆڵی وڵاتان و دەسەڵاتەکانیان کردووە !! خەڵکیش پێی وایە دەجال هەر چاو کوێرێکی قژ لوولە !!

لەڕووی دینیشەوە ئینکاری بوونی خوا و دینەکان دەکرێت بەتەواوی !
گۆڕاوەتەوە بەدینیکی مرۆڤگەری عەلمانی (دوونیا ویستی) لێرەشەوە ئیبلیس و شەیتانیش بووە بەوەهمێک لای خەڵک! پێیان وایە تەنها وەسواسێکە !!! پێیان وایە ئیبلیس ڕەنگدانەوەی لە واقعی زەوی و ژیانی مرۆڤەکان نیە ! پێیان وایە ئیبلیس پەیام و ڕێگای خۆی نیە !
ئیبلیس دینی خۆی هەیە ! مرۆڤایەتی لەسەر کۆکردووتەوە!!

ئیبلیس دەسەڵاتی هەیە ! سوپای هەیە !

پێغەمبەری خوا علیه السلام دەفەرمووێ دەجال دەرناکەوێ هەتا خەڵکی بیریان نامێنی و ئیمامەکان باسی ناکەن لەسەر مینبەرەکان ...

ئێمە وتمان دەجال سێ قۆناغە ئێمە لە قۆناغی کۆتا بەشی یەکەمین واتا سیستەمەکەی ! ئایا دەبینی ئیمامەکان باسی ترسناکی سیستەمەکەی بکەن ! بەڵکوو زۆرینەی ئیمامەکان پارێزگاری لەو سیستەمە دەکەن چونکە ژیان و بەهەشتی دوونیای پێە ! هەرکەس وڵامیان باتەوە فرێی دەدەنە جەهەنمەوە !!!

خوای گەورە دەفەرموویت( ان کان مکرهم لتزول منه الجبال) ، یەکێکیش دێ لەو لەولاوە دەڵێت تیۆری پیلانگێری درۆیە ! گەر دووکەڵ هەبێت کەواتا ئاگر هەیە ! کەواتا کەسێک هەیە ئەم ئاگرەی کردووەتەوە !! سەیری ئاگری چواردەورت بکە لەجەنگ و کوشتار و خراپەکاری !!!

هێشتا پێت وایە دەجال هەر چاو کوێرەکەیە؟!

کەسێک(ک ، ف ، ر ) نەبینی لەنێو چاوی سیستەمەکەی چۆن دەیبینی لەنێو چاوی خۆیدا !!

◆سوپای مهدی

هەموو شتێ سەرەتا و دەسپێکی هەیە ئەمە ڕاستی ئەم جیهانە کاتیەیە و هەموو کۆتایەکیش کۆمەڵێ نیشانەی هەیە لەپێشیدا دێن ئاوابوونی خۆر نیشانەی هاتنی شەوە و دەرچوونی سپیایش لە ئاسمانی بەیان مانای هاتنی ڕۆژە و ستەم و خراپەش نیشانەی خراپە و وێرانکاریە کەواتا ئایە بەڕاستی ئێمە لەپێش دەرگای کۆتا ساتەکانین ! زۆرێک لە فیکر و ئایدیاکان ڕوانینی خۆیان هەیە بۆ ئەم ساتە هەریەک فەلسەفەی خۆی هەیە بەڵام خودا لەنێو کتێبەکەی مەودای بۆ هیچ قسەیە نەهێشتووەتەوە ، نیشانەکان لە فەرموودەکان ڕوونن نیشانە گەورە و بچووکەکان ، نیشانە بچووکەکان لەسەردەمی پەیامبەر علیه السلامەوە

دەستیان پێکردووە کۆتای بە کەوتنی یەکەم مووری نیشانە گەورەکان دێ کە وا لەمڕۆمان لەدەرگامان دەدا و خەڵکی لێی بێ خەم نوستون !

(پەیامبەر فەرمووی علیە سلام قیامەت هەڵناستیت هەتا کاتەکان لێک نزیکەبنەوە ساڵ وەک مانگی لێدێ و مانگیش وەک هەفتە و هەفتەش وەک ڕۆژ ، ڕۆژیش وەک سەعاتێک و سەعاتیش وەک سوتانی پوشیک وایە )

لەنیشانەکانی نزیک بوونەوەی کۆتای نزیک بوونەوەی زەمان و کاتەکانە ، هەرچەند تەمەنتە ئێستە بپرسە لەخۆت دوێنی چۆن تێپەری؟

هەستت پێکرد ؟

هەستت کرد چۆن مانگ و ساڵان دەڕۆن ؟

دوێنی ساڵی تازە بوو سبەیش واجێی دەهێلین ! ڕۆژ وەک سەعاتێک و سەعاتیش وەک چاو تروکانێک ! کورتبونی ڕۆژ بەهۆی گۆڕانی فیزیکی زەوی نیە بەڵکو وەک ئیمامی نەوەوی دەڵی بەرزکردنەوەی بەرەکەتە لە کات ! ئەمەش نیشانەیەکە پێش کۆتایی دێت ، حافیز ئەڵێ لەکۆتا زەماندا بەرەکەت هەڵدەگیریتەوە لەڕزق و ماڵ هەتا لەکات و عوومریشدا ! نزیک بوونەوەی زەمان واتای ئاسانی پەیوەندی نێوان شوێنە دوورەکانیش دەدات ابن حجر دەڵی کاتەکان کورتەوە دەبن وەک پێشوو نابن .

(پێغەمبەری خوا علیە سلام دەفەرمووێ لەپێش قیامەتدا فیتنەکان وەک شەوی تاریک دێن پیاو ڕۆژ دەکاتەوە بە مووسڵمانی شەودەکاتەوە بەکافری ، شەو مووسڵمانە ، ڕۆژەکەی بێ باوەرە ! )

لاتان سەیر نەبێ سیستەمەکەی پێش هاتنی دەجال هەموو ڕۆژێ بەیعەتی کافربوون لەخەڵکی وەردەگرێت ! بۆیە تۆ ناتوانی پێش بەو لێشاوە گەورەیە بگریت ! تاکە چارە گەشتنە بە شاخەکان ! تەنانەت لەهەندێ باریشدا ئەمر بەمەعروف سوودی نابێت ! بۆیە دەس گرتن بەم دینەوە وادەکات سەرانی دەجال دابەزنە سەرت بەسووپا و ئیعلام !

ئەمرۆ محمدی مهدی دەرکەوی ئیعلامی ئیبلیس دەڵی مهدی دەرکەوت !! ئیعلام ئەمرۆ دەستورەکانی ئیبلیسی کردووە بەخوا تشریعی پێوە دەکات ! ئەی خۆی بێت چیبکات بۆی !!! کێ ئەمانەت دارە و کێش خائینە لای خەڵک !

پەیامبەر علیە سلام ئوومەتەکەی لە فیتنە ئاگادارکردۆتەوە فەرمانی کردووە بە پەناگرتن بەخودا لێی  و ئاگاداریشمانی کردۆتەوە لەکۆتایی ئەم ئوومەتەدا فیتنە توشی خەڵک دەبێ و کەس لێی دەرناچێ مەگەر کەسی ئیمان بەخوا و ڕۆژی دوای هێنابی، خۆڕاگرتن بە کۆمەڵی مووسڵمانان گەر کەمێکیشبن ! زۆرینەی فیتەکانیش توشی ئەم ئوومەتە دەبن لە ڕۆژهەڵاتەوە دێن !  هەروەک دەیفەرموو ( ألا إن الفتنة ها هنا ، ألا إن الفتنة هاهنا من حيث يطلع قرن الشيطان ) قرنی شەیتانیش بەڕەسمی لەڕۆژهەڵاتەوە سەری هەڵدا لەساڵی 1924 دا ! قەڕنیش لەزمانەوانیدا مانای 100ساڵ دێ ساڵەکان بژمێرە و سەیرێکی چوار دەورت بکە و چاوت بکەوە و بیرکەوە ئەی ئەو دروستکراوەی خاوەن ژیر و تێگەشتنی حەزەری خۆتبکە !

چەن فیتنە و جەنگی ترت پێویستە هەتا تێبگەیت ؟ نا باسی جەنگ ناکەین ! چەن روبەییبضە ترت دەوێ هەتا تێبگەیت !! نا واز لەوەش بێنە چەن یاسای ترت دەوێ دژایەتی دینتی پێبکەن هەتا تێبگەیت !!

پەیامبەر علیە السلام دەفەرموێ : قیامەت هەڵناسێت تاوەکو دووبارە خاکی عەرەب نەبێتەوە سەوزایی وەک پێشتری !

ئیمامی قورتوبی لەتەفسیریدا دەڵێ هۆکاری ئەم سەوازیی بوونەوەی دەسوەردانی مرۆڤە لە زەویدا .

پەیامبەر دەفەرموێ (حەیا و ئیمان لەیەکەوە نزیکن کاتێک یەکێکیان نەما ئەویکەش نامێنی )

لەنیشانەکانی ڕۆژی دوای نەمانی شەرمە لەنێو چاوی ژنان و مرۆڤبوون لەلای پیاو نامێنی و بەزەیی و رەحم لە دلی دەسەڵاتدار نامێنی ، زانایانێک دەبینی زانستەکە دەشارنەوە بۆ ژیانێکی کورت !!

پەیامبەر علیە السلام دەفەرموێ قیامەت هەڵناستی هەتا دڵ خۆشترین کەسەکان لەدوونیا  پیسی کوری پیس دەبن ( دیارە مەبەستی دەسەڵاتدارەکانە ) تەحاوی دەڵی مەبەستی پێ کەسانی نەزانی دنیا ویستە هەموو هەوڵی دوونیایە , ئەمجۆرانە دەبنە کاربەدەست پارە و سامان و خۆشی دوونیا دەکەوێتە لای ئەمانە ! وەک چۆن بەرەکەت هەڵدەگیریتەوە دڵ خۆشیش هەڵدەگیریتەوە !

پێغەمبەری خوا علیە السلام دەفەمووی پیاوی واهەیە پاڵی داوە بە پشتیەکەیەوە و یەکێک لە فەرموودەکانی منی بۆ دەلێن دەڵێت لەنێوان ئێمە و ئێوە ئایات قورئان هەیە ، چی لەو قورئانە حەڵاڵ هەبێت حەڵاڵیکەین ، چیش حەڕام ببیت حەڕامی دەکەین ، ئەوەی پەیامبەری خوا حەرامی دەکات وەک ئەوەیە خوا حەڕامی کردبێت )

لەم سەردەمە کەسانی پەیدا بوون کە لەقورئانەوە وەردەگرن و واز لەسونەت دەهێنن ، لەولاشەوە عەوامێکی زۆر شوێنیان دەکەون

سونەت سەرچاوەی دووەمە لە تەشریعی ئیسلامی ، ناتوانری وازی لێبێهێنێت لەهەرکاتێکدا بێت بەڵگەش قسەی الله یە دەڵێت ( من يطع الرسول فقد اطاع الله ) هەروەها دەفەرموێت

(يا ايهاالذين ءامنوا الستجيبوا لله و للرسول اذا دعاكم لما يحيكم )

ئەوکەسانە ئینکاری نیشانەکانی قیامەت و ئیسراء و المعراج دەکەن و زۆربەی فەرموودەکان بەڕاست دانانێن ، زۆریکیان کاڵ فامانن وادەزانن قیامەت نایەت ئیلا بەشێوازی بغتە ( دەس بەجێ) نەبێت ئەم ئایەتە دەکەنە بەڵگە ( هل ينظرون الا الساعة ان تأتيهم بغتة وهم لايشعرون )

بەڵام ئەم ئایەتەیان وادیارە بیر چووە (فهل ينظرون الا الساعة ان تأتيهم بغتة ، فقد جاء أشراطها فأني لهم اذا جاءتهم ذكراهم ) لێرەدا الله باسی ئەوەدەکات قیامەت دەسبەجێ دێ و لەئایەتی دووەمیش دەڵێت نیشانەی خۆی هەیە ، ئەم دوو ئایەتە دژ بەیەک نین بەڵکو ماناکەی ڕوونە کە قیامەت دوای ئەم نیشانە دەسـەجێ ڕوودەدات لەکاتێ کەس نازانی کەیە و چۆنە بەڵگەش ئەوەیە خەڵکی بێ ئاگان لەوکاتەدا

پەیامبەر عليه السلام دەفەرموێ ( دونیا کۆتایی پێنایەت هەتا لەناو عەرەبدا پیاوێک لە ئالوبەیتم پەیدا دەبێت ناوی وەک ناوی من وایە ناوی باوکیشی وەک ناوی باوکم وایە )

دووبارە دەفەرمووێ ( بەردەوام تاقمێ لە ئومەتەکەم جەنگدەکەن لەپێناو حەقدا ، مەوجود و هەن هەتا ڕۆژی قیامەت کاتێ عیسا عليه السلام دابەزی ئەمیرەکەیان دەڵێ وەرە نویژمان بۆبکە عیسا دەڵێ نا ئێوە هەندێکتان بەسەر هەندێکی ترتان ئەمیرن ، شکۆمەندیەک بۆ ئەم ئوومەتە )

پەیامبەر دەفەرمووێ ( ئاوەدانی بیت مقدس ، کاولبوونی مەدینە بەدوادێ ، کاول بوونی مەدینەش مەلحەمە گەورەکەی بەدوادێ ، مەلحەمە گەورەکەش فتحی قستنتینە بەدوا دێ ، وە فتحی قوستەنتینەش دەرچوونی دەجال )

پێغەمبەری خوا علیە السلام دەفەرمووێ ( قیامەت هەڵناستی هەتاکو ڕۆم نەیەتە دابق ، سوپایەک لەمەدینەوە بۆ دەرەچێ ، باشترین خەڵکانی زەوین لەوکاتەدا ، کاتێ پێک دەگەن ئەو دوو سوپایە ڕۆمەکان دەڵێن ئەوانەمان پێبەن دەمانەوێت با بیانکوژین ، ئەوانیش دەڵێن نا وﷲ ئەوان براماتن پێتان نادەین ، جەنگ دەسپێکات )

ئەوکەسەی ئاقڵ بێت لەو فەرموودانە دۆست و دووژمنی خۆی دەناسیت و هەنگاوی داهاتووی دەزانیت لەگەڵ کێیە و دژی کێیە !!

# ٦ _ بانکی نێودەوڵەتی شەیتانی

◈ بانکی نێودەوڵەتی شەیتانی، جەنگی دۆلار.

جیاوازی نێوان بانکی نێودەوڵەتی و نەختێنەی نێودەوڵەتی چییە؟

چۆن کار دەکەن؟

ئایا ئەم دوو بانکە تەنها قەرز دەدەن؟

بەکێی دەدەن؟

پرۆفیسۆر ڤالنتین کاتاسونوڤ بەرپرسی پرۆژەکانی ڕوسیایە لەبانکی نێوودەوڵەتی دەڵێ پێنج ساڵ لەوێ کارم کردووە و لەیەکێ پرۆژەکان روسیا لەم بانکە بەشداربووم کە پارەی بۆ ڕووسیا دەهێناوە ، بۆیە من دەزانم چۆن دروست دەبێت ئەم قەرزە هەروەها دەڵێیت خەزێنەی نێودەوڵەتی جیاوازە زۆر لە بانکی نێوو دەوڵەتی بۆیە زۆر بەداخەوە تەنانەت خوێندکارانی کۆلێژی ئابووریش ئەوەنازانن بەڵام ئەم دوو دەزگایە لەکۆتایدا دەگەنە یەک ئامانج !

بۆناسینی ئەم دوو دەزگایە چەند هەنگاوێک لەگەڵم وەرنە دواوە بۆ پێش جەنگی جیهانی دووهەم ...

لەساڵێ **1944**دا نەتەوە یەکگرتووەکان بەسەرۆکایەتی ئەمریکا وڵاتانی جیهانی بانگێشتی کۆنگرەیەکی ئابووری و دراوی کرد ڕاستەوخۆ لەدوای جەنگی جیهانی دووەم ئەم کۆنگرە لە دارستانەکانی "بریتن ۆودس" لە ئەمریکا بەسترا لەم کۆنگرەدا نوێنەری **45** وڵات بەشداربوو لەکۆتایدا و لە ساڵی **1945**دا بەڵا گەورەکە لەدایک بوو ! نەختێنەی نێوو دەوڵەتی و بانکی نێودەوڵەتی ! ئەم ڕێکەوتنە داهاتوی

**مرۆڤایەتی خستە ژێر چنگی پیلانگێری جیهانی ! وڵاتانی هەژار دەکرد و دەوڵەمەندیانی دەکرد ! هەژارانی هەژارتر کرد و دەوڵەمەندەکانی دەووڵەمەندترکرد ئەو ڕێکەوتن نامەش ناونرا (بریتن ۆودز)**

**کار و پیشەی "بانکی نێودەوڵەتی" هاندان و گەشەکردن و ئاوەدانکردنەوە و بنیادنانەوەی وڵاتانە بەتایبەت ئەوروپا دوای وێران بوونی لەدوای جەنگی جیهانی دووەمەوە بەڵام "نەختێنە نێودەوڵەتی " کار و پیشەی پێدانی قەرزە بەوڵاتان بۆ هاوسەنگردن و ڕاگرتنی بەهای دراوەکەی بەڵام ئەم قەرزانە هەروا بەخۆرایی نیە هیچ شتێک لەجیهانی ئابووری بەتایبەتی بەخۆڕایی نیە بەتایبەت لە پەیوەندی بانکیدا بەڵکو بەمەرجە ، مەرجەکانیش وەک پەتی لەسێدارەدان وایە وڵاتی قەرزار دەبێتە کۆیلە و خزمەتکاری نەختێنەی نێو دەوڵەتی ، نموونە لەو مەرجانەش نابێ وڵات مامەڵە بە کانزا و سوتەمەنییەکان بکات وەک نەوت و گاز ..هتد بەسەربەخۆ بەڵکو دەبێ بدرێت بە کۆمپانیاکانی بیانی، ئەمە تەنها یەک مەرج بوو ، مەرجەکان زۆرن هەندێ جار مەرجەکان دەگاتە 150 مەرج ! لەساڵی 1999 دا بانکی نێودەڵەتی و نەختێنە 114 مەرجیان سەپاندە سەر هەندێک وڵاتی ئەفریقی بۆ پێدانی قەرز واتا بۆهەر وڵاتێک 114 مەرج! ( دواتر درێژە بەمە دەدەین ان شاءالله) کۆنگرەی بریتن وودس بەقسەی خۆیان بۆ ئەودەوڵەتانە بوو کە ژێرخانی ئابووریان نەمابوو و دراوەکەشیان لاوازبوو بەهاکەی ، بۆیە ئەم قەرزە بەهای ئاڵوگۆری دراوی وڵاتەکەی جێگیر دەکرد واتا هێزی دەکردەوە بەر دراوی خۆماڵیدا بەڵام ئایا لەراستیدا وایە مەسەلە ؟؟؟!!. ئەم پرسیارە پرسیارێکی دیکە وڵامی دەداتەوە ئایە مەرجەکان بۆ هەموو وڵاتێک وەک یەکن !!!؟؟ بێگومان نەخێر کەواتا بەم شێوازە هەندێک دەبنە کۆیلەی هەندێکی دیکە!**

**بەڵام بانکی نێوودەوڵەتی بۆ دروستکردن و ئاوەدان کردنەوەی وڵاتانە دوای جەنگی جیهانی دووەم وەک باسمان کرد ئەم بانکە قەرزی دا بە**

وڵاتە ئەوروپییەکان کەوڵاتەکانیان وێرانە بوون ئەوکاتە ، ئەم قەرزەش گەشەو ئاوەدانی بۆ ئەوروپا گەڕاندەوە کەواتا پارەکان بۆ پرۆژە وەبەرهێنانە تایبەتەکان دابین دەکرا. کەپەیوەندی هەبوو بەکەرتێکی واقعی لەکەرتی ئابووری و ژێر خانی وڵات بەڵام دواتر ئەم بانکە پارەی دەدا بۆ پرۆژەی دیکە جگە ئاوادان کردنەوە ، کەواتا سەرەرای جیاوازیەکان ئەم دوو بانکە بۆیەک ئامانج هەنگاویان دەنا کە بەرژەووەندیەکانی ئەمریکایان دەخستە پێش هەموو شتەوە !

پرۆفیسۆر "ڤالنتین" ڕووسی دەڵێ ئەو برە پارەیە کە پێت دەدرێت لەلایەن دامەزراوە نێودەوڵەتیەکانەوە سنوردارە وەهەروەها ناتوانی سەرفی ئەو پارە بکرێت بەویستی خۆت بەڵکو بەشێوازی پێت دەدرێ کە دەبێ بەو قەرزە کاڵا و خزمەتگوزاریەکانی لەکۆمەڵی کۆمپانیا بکریت کە بانکەکانی نێودەوڵەتی خۆیان ئەو کۆمپانیانە دیاری دەکەن یانی بۆنموونە گەر وڵاتی وەک ڕووسیا برە پارەیەکی بەقەرز وەرگرت لە بانکی نێوودەوڵەتی ئەوا یەکەم ناتوانیت هەمووی پێکەوە وەرگریت دووهەم ناشتوانی بەویستی خۆی لەهەرچی ویستی بەکاری بێنیت ، مەرجەکانی قەرز پێدان زۆر قورسن، ئەو پارەیە بەدەگمەن دەڕوات بازاری ئازادەوە بەڵکو ئۆتۆماتیکی دەگەریتەوە چنگی کۆمپانیاکانی خۆیان ! لەرێگای کرینی کاڵاکانیانەوە بەڵام ئەو مەرجانەی بۆ هاوکاری کردن کە بۆ وڵاتێکی وەک ڕوسیا دادەنرێ هیچ کات وەک ئەومەرجانە نیە بۆ کۆمپانیا ئەمریکیەکان دادەنرێ ئێ بێگومان دەبێ واشبێت چون ئەو خۆی خاوەن ماڵە خۆی یاسا دادەنێ !! ڕووسیا ناچار دەبێ پارە قەرزەکان لەکاڵا و شتومەکە کۆمپانیا ئەمریکەکان سەرف بکات و بەم شێوەش پارەکان دەگەرینەوە بانکەکان سویسرا !! و ئەم کۆمپانیانەش زۆربەیان ئەمریکین !! هەروەک لەخاکی وڵاتی چینیشدا بەشێکی زۆر فروان کۆمپانیا ئەمریکی بوونی هەیە بەهەمان ستایل و یاریەوە !! کەواتا وڵاتەکان دەسەڵاتیان بەسەر بانکی وڵاتەکەیاندا نیە و ئەو مەرجانەش بەناچاری قبـوولٚ دەکەن ! وەک سعوودیە کە چۆن کرانەوە دەکات بەڕووی دەرەوەدا !! ڕووسیا پشت لە سیستەمی پێشووی دەکات هەمووی بەهۆی مەرجی سەپێنراوە و

قبووڵکردنیەتی لەلایەن وڵاتەکانەوە ! ئەگەر دەتەوی وڵاتەکەت پێش کەوێت و دەوڵەمەند بێت مەرجەکان قبووڵبکە و ئەوانیش بەویستی خۆیان پێت دەدەن یان نا! ! !

ئەمە وەک ئەوە وایە خاوەن مارکێتی بڵی من قەرزت پێدەم بەڵام دەبێ بەو پارە تەنها شت لەخۆم بکری !

نوسەر و ئابووری ناس "جۆم بێرکس" دەڵی ئەو دەوڵەتانەی قەرز وەر دەگرن ڕووبەرووی فشارێکی زۆر دەبنەوە لەلایەن سەرانی بەرێوبەری دوو بانکی جیهانی چون ئەوان قەرز ددەن و مەرج دادەنین ( زۆر بەوردی باس لەمانە دەکەین لە داهاتوودا ان شاءالله ) ، وە ئەو فشارانە زۆر کاریگەرە لەسیاسەتی جیهانی ئەمرۆدا لێرەوە پەیوەندیە دروستەبێ لەنێوان وڵاتانی قەرزار و سیستەمی قەرزدەری جیهانی کە ناتوانی هەرگیز لێی دەربازبێت چ لەلایەن ئابووریەوە چ لەلایەن سیاسیەوە هەتا لەلایەنی ئایدۆلیژیشەوە بێت ! بەم مانایەش ئەو دامەزراوە واتا ( دوو بانکەکە ) کاریگەری یەکەمی هەیە لەبەستنەوەی وڵاتان بە سیستەمی سەرمایەداری بانکی ئەمریکی بانکی چونکە وەک پێشتریش باسمان کرد راستی دروستی ئەم بانکە هەر بۆ پاراستنی بەهای دراوی وڵاتانی ئەندامیەتی ! واتا پاراستنی سیادەی دۆلار !

کەواتا لەمڕۆدا دۆلار جێگای سوپای و هێزی سەربازی گرتووەوە بۆ داگیرکەر و پیلانگێری زایۆنی !!

ئێستا با بزانین سەرچاوەی داهاتی ئەم دوو بانکە چیەو چۆنەو چۆنیەتی کۆنترۆڵ کردنی بازار و سوڵتەی تەشریعی و یاساکان چین...

## ❖جەنگی دۆلار

لە 1978 دا کاتێک کە رێکەوتنامەی جامایکای ئابووری ئەنجامدرا و شوێنی" سیستەمی بریتن وودزی" گردەوە دوایش بەستنی دۆلار بە ئاڵتون نویێ بووە، واتا نرخی دۆلاڕ وابەستەی ئاڵتون کرا و نرخی دراوەکان تریش وەک لیرە و دینار و تمەن وابەستەی دۆلارکرا، لەوە بەدوا نەخێتنەی نێودەڵەتی نەیتوانی هەمان دەوری پێشووی هەبێت ئیتر نەزانرا سوودی چیە ئەم نەختێنەیە و ئەمرۆش نازانرێت و ڕوون نیە کارو پیشەی ئەم نەختێنەیە بەڵام ئەم دەقەیە ئەم نەختێنەیە یارمەتی وڵاتان نادا بۆ پاراستنی بەهای دراوەکەی بەڵکو پرۆژە ئابووریەکانی ئەمریکا جێ بەجێ دەکات واتا چ وڵاتێک ئەمریکا بیەوی بەهای پارەکەی بەرزەکاتەوە کێش نەیەوێ بەهای پارەکەی داکەوێ ! ئەمەش ئیلتزام و سەپاندنی زنجیرەیەک یاسا و ڕێسایە بەسەر وڵاتانی قەرزاردا لەلایەن بانکی نێودەوڵەتیەوە ..

لەمەرجەکانی نەختێنە بۆسەر وڵاتێ قەرزار دەبێ چی بێت ؟

ئەمە بەشێک لەوانەیە کرانەوەی وڵاتە بەڕووی جیهاندا ، کردنەوەی دەرگای وڵات بۆ بەرهەم و کاڵاکان ڕۆژئاوا ، رێگری کردن لەوڵاتان بین بەخاوەن سەرمایەی تایبەتی ، ڕێگری کردن لەوڵاتان بۆ بوون بەوڵاتێکی بەرهەم هێن ، هاندانی وڵات بۆ کردنی خەڵکی بە بەکاربەر و بەکارهێنەر، جێگیر کردنی سەرمایەی وڵات لەبانکەکانی ڕۆژئاوا. پاشان ئەو قەرزەش بەناچاری هەندێجار وەردەگیریت تەنانەت سەرۆکی وڵاتیش توانا و دەسەڵاتی ناشکێت بەسەر بانکی وڵاتدا ، ئێستا بانکی ڕووسی مەرکەزی لەژێر دەستی حکومەتی ڕووسیا نیە ، بانکی عێراقی فیدارڵی زۆرینەی بانکەکان جیهان سەربەخۆن لەلایەن حکومەتەوە کۆنترۆڵ ناکرێن ! بەڵکوو راستەوخۆ سەربە بانکی مەڕکەزی ئەمریکین! کاکی عەلمانیش لەولاوە دێ دەڵێ عەلمانیەت ناسەپێنرێت !! ئەمە سەپاندن نەبیت چی سەپاندنە !!!!!

کەواتا داوا لە وڵاتی قەرزار دەکرێ پەیوەندیە دەرەکیەکانی ئازادبکات بۆ ئەوەی بەئاسانی دۆلار بگاتە وڵاتەکەی ! ،

و هەڵوەشندنەوەی کۆنترۆڵکردنێکی ئاڵوگۆڕی دراو واتا بەهای دراوی وڵاتان لەدەست حوکمەتەکان نیە بەڵکوو پەیوەندی بە دۆلاڕەوە هەیە بۆ نموونە دیناری عێراقی نرخی دینار وابەستەی دۆلارە ! و کۆنترۆڵکردنی بازاری ناوخۆیی بەناچارکردنی وڵاتان بەکرینی شتومەکی کۆمپانیا ئەمریکیەکان بەوقەرزانە و ئەمەش واتا هەڵوەشاندنەوەی بریارەکانی دەزگای دژەگەندەڵی وڵات و رێگریکردن لەجێگیرکردنی نرخەکانی شتومەک لەنێوخۆی وڵات بەڵکو بەشێوازیکی راستەوخۆ بازاری ناوخۆی وڵات دەکەوێتە چنگی ڕۆژئاوا ! ، لێرە دەبێ ئاماژەبەین بەوەی هەریەک لەوجێگایانە هەڵناوەشێتەوە لەڕووی هەیکەلەوە بەڵام پەکی دەخەن لە کار و ئیشی خۆی .

دەرەنجامی ئەمانە دەبێتە هۆی کەم بوونەوەی خەرجیەکانی بوجەی وڵات ! واتا گرانبوونی کاڵای دەرەوە ، گەشەکردنی بازاری دراو واتا ( گۆڕینەوەی دۆلار بە دینار) و ئەمەش زۆر گرنگە بۆ خاوەنەکان دراوی جیهانی یانی دۆلار چونکە جێ بەجێ کردنی ئەم کردارانە پەیوەندی نێوان بازارەکان زیاد دەکات گەر بەڕوونی قسەبکەین واتا هەموو ڕێکاری دەگرنە بەر بۆ هاتنە ژوورەوەی بانک و دۆلار بۆ وڵاتان !

ئایا بانکی عێراقی و ئەو پارانەی تێیدایە موڵکی عێراقە ؟

بانکی عێراقی لقێکی بانکی یەدەگی فیدراڵی ئەمریکیە بێ زیاد و کەم بۆیە "بانکی عێراقی مەرکەزی "باشتر وایە پێی بلێن دامەزراوەیەکی بەڕێوبردنی دراوە نەک بانکی ناوەندی ، بەڕێوبردنی دراو چیە ؟؟ واتا بەرهەم هێنانی دراوی ناوخۆیی لەبەرامبەر کرینی دۆلار لەبازاری دەرەوەدا ، کەواتا بانکی عێراق دۆلار دەکڕێ بۆئەوەی ئەو کاغەزە

ڕەنگاو ڕەنگانە چاپبکات کە پێی دەڵێین دینار ، کەواتا دیناری عێراقی هەمان دۆلارەکەیە بەڵام بەڕەنگێکی تر کاغەزەکە ڕەنگراوە ئەمەیە بەڕێوبردنی دراو کەواتا هێزی دینار لەکوێ توانای وڵاتەکەوەیە بۆ کرینی دۆلار کەواتا ئەم توانای کرینی دۆلارە بووە بە ڕێگایە بۆ جیاوازیکردن لەنێوان وڵاتدا بۆ نموونە وڵاتی ئێران دراوەکەی دادەکەوێ چون وڵاتەکان بەدۆلار مامەڵەی لەگەڵ ناکەن و بازاری ئێران دۆلاری کەمە تومەنی تێدا زۆرە بۆیە داکەوێ ! بەڵام وڵاتی عێراق نەوتەکەی بە دۆلار دەفرۆشی ئینجا قەرزیشی بەدۆلار پێدەدریت لە نەختێنە بۆیە بەهای دینار داناکەوێ وەک تومەن ! و ئەم جیاوازیە لەنێوان ئەم دوو وڵاتە وادەکات دینار بەهێزتر بێت تومەن ! کەواتا زانیمان جەنگەکە جەنگی دۆلارە ! دۆلار لەباتی سەربازی ئەمریکی و چەکی بەهێزنیە بەڵکو 32 fحوکم دەکات ئەمریکا پێویستی بە دۆلاری بەسە ! بۆ وێرانکردنی ژیانی خەڵک ! ئەمەش ڕێگایە زۆر باشە بۆ فشار خستنە سەر وڵاتان لەوانەیە وڵاتێک سەربەخۆبێت بەڵام داگیرکراوە هەتا لەنێو ئەم سیستەمە بێت بۆیە دەووڵەتی سەربەخۆ درۆیەکە و هیچیکە چونکە بانکی حوکومی ناوەندی زۆربەی وڵاتان دامەزراوەیەکی تایبەتن و حوکمی نین خەڵک وادەزانیت بانکی ناوەندی وڵاتان موڵکی حوکمەتە بەڵام وانیە بەڵکو موڵکی کۆمەڵێک بنەماڵەیە!!

کێن ئەو بنەماڵانە؟

# ٧ _ رۆتچێلد ڕۆکفلێر

▲رۆتچێلد ڕۆکفلێر و دۆلاری کاغەزی پەرەستراو.

پێتان وایە ئێستەش ئەو هەموو قەرزانە بۆ یارمەتی وڵاتان بۆ یارمەتیدانیان بێت لەکەیەوە ئیبلیس هەست و سۆزی جوڵاوە !!
مەسەلەکە ئەوەیە خاوەنی پارەکان خۆیان قەرزەکان دەدەن بۆشتانێک سوودی خۆیانی تێداهەبێ نەک بۆ بەهێزکردنی دووژمنەکانیان
بۆنموونە وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی ئەوروپا و سۆڤیەت کەوتنە بەر ئەم جۆرە هێرشە ئابووریانە بووە هۆی لێک هەڵوەشانی سۆڤیەت و دروست بوونی سەرمایەداری لەڕووسیادا لەنەوەدەکانی سەدەی پێشوودا !

پرۆفیسۆر (ڤالنتین ) کە نوێنەری بانکی مەرکەزی ڕووسیە لە بانکی نێوودەوڵەتی و نەختێنە د دەلێ من کۆمەڵێ پەیوەندیم لەگەڵ "ئۆلی گارشیای" بەریتانی هەیە بەهۆی ئەم پەیوەندیەمەوە تێگەشتم ئەوان بەدوو شێواز سەیری وڵاتانی دیکە دەکە ...

هەندێکیان سەیری وڵاتانی ڕووسیا و وڵاتە کۆنەکانی سۆڤیەت و ڕۆژهەڵاتی ناوەراست وەک فەزایەک بۆ کۆکردنەوەی پارە سەیردەکەن لەرێگای پێدانی قەرز و چەن هێندە بوونی قەرزەکان بەهۆی ریباوە و ساغ کردنەوەی کاڵا ئەمریکیەکانەوە !

بەڵام جەماعەتێکی دیکەیان پارەیان ناوێ بەڵکو ئەوان پارە و سەرمایەداری وەک هۆکاری بۆگەشتن بە دەسەڵات سەیردەکەن ئەوان کەسیان لە ڕاگەیاندەوە باسی ئەوەت بۆناکەن چیان لەوڵاتی تۆ دەوێ یان ئەسڵەن خۆشیان بەتۆ ناناسێن کە کێن !

پرۆفیسۆر ڤالنتین دەڵێ "جاک تالی" بانگی کردم بۆ ئەنجومەنی ڕاوێژکاری بانکی نێودەڵەتی ئەوروپی بۆ ئەوەی کاری لەگەڵ بکەم بەڵام دواتر لەگەڵ جێگرەوەکەی " جاک دی لاروزیەر" کارمکرد کەپێشتر بەڕیوبەری بانکی فەرنسی بوو و بەڕیوبەری جێ بەجێکاری نەختینەی دەولەتی بوو وە هەردووکیانیش سەر بە پیلانگێری ڕۆژئاوا و زایۆنی جیهانین و بوکەڵەی دەست  بنەماڵەکانن هەموویان وەک بەرداشی شەترەنجن ئەگینا چۆن دەتوانن بگەنە ئەو پۆستانە ئەوان یاساکانی یاریەکە دەزانن و ئینکاریشی خۆ ناکەن پرۆفیسۆر دەڵی من دەزانم  کەسانێکی دیکەش هەن لەسەرووی ئەمانەوە ...

(سەرۆکی نەختینە و سەرۆکی بانکی نێودەولەتی و سەرۆکی بانکی فیدراڵی ئەمریکی )  بەرزترین پێگەکانی دەسەڵاتیان لایە بەڵام بەشێکی نەبینراوی دیکە هەن لەمانە بەرزترن نایانەوی دەرکەون ئەویش "بنەماڵەی رۆچیڵدن "

وتەیەکی جوانی " ژان ژاک ڕۆکسۆ" هەیە دەڵی :

[[ بنەمای سەرکەوتن بۆ بەڕێوبردن ئەوەیە دەسەڵاتەکەت نەبینراو بێ ]] لەوانەیە ڕۆچێلد و بنەماڵە گەورەکانی دیکە لەژێر کاریگەری ئەم وتەبن !

دەسەڵاتەکەیان ناڕوونە بۆئەووەی خەڵکی تێنەگەن لە ڕاستیدا چی ڕوودەدا و کێ هۆکاری خراپەیە ! کێ هۆکاری گەندەڵیە ! ، کەسانیکی بەناوبانگ نین و نەناسراو ناشزانین کێین هەتا سەیری لیستی دەوڵەمەندترین کەسەکانی جیهان لە ڕۆژنامەیfobes" بکەین ناوی بنەماڵەی ڕۆتچێلد هەرگیز نابینی لەنزیک پەنجاهەمین " کەس ناوی "دیڤد ڕۆکفیلەر" دەبینین بەڵام ئەم کەسە مردووە لەساڵی 2017دا  لەدوای سەدەی بیستەمەوە بەگشتی لەنێو جیهاندا هەردوو بنەماڵە ڕۆچیلد و ڕۆکفلیر خۆیان لە پێش چاوی خەڵکی نەهێشت ، هەریەکیک لە ئەندامەکانی  بنەماڵەکە گەر سامانەکەی ملیاریک دۆلار

تێپەڕێنیت دەبێت موڵکەکانی بکات بە وەکالەت ! ، خاوەنی سەرەکیان خۆیانن بەڵام لە ڕووکەشدا بەناوی کەسانێکی دیکەیە!

کەواتە ئابووری بازار لەژێر سێبەری بنەماڵەی قۆرخکارە ! جیهان تۆڕێکی دەسەڵاتی شاراوەی قۆرخکار بەڕێوەی دەبا نایەوێ دەرکەوی وەک لینین لەکتێبەکەی بەناوی ( ئیمپریالیزم بەرزترین قۆناغی سەرمایەداریدا )ٚ بەبێ هیچ ئەملا و ئەولایەک دەڵێت:

(( دەسەڵاتی نهێنی ئیمپریالیزمی شێوازێکی داگیرکاری مۆدێرنە بەتایبەتی لەبازار و کانزاکانی ژێر زەویدا))

بەڵێ مۆدێرنە لەکۆندا بەسووپا دەهاتن ! ئێستا دۆلار بۆ وڵاتەکەت دەنێرن و پاشان کۆمپانیاکانیان دەنێرن هەتا رێگای فرۆشتنی نەوت و پترۆدۆلار بەهای دۆلار بپارێزن ! پاشانیش لەڕێگای کۆمەڵێ دەسەڵاتداری خۆیانەوە نوێنەری خۆیانن لەم وڵاتانە پارەکان دەگەڕێنەوە بانەکەکانیان لەسویسرا ! بەڵێ لینین جوان لەیاری سەرمایەداری تێگەشتبوو !

کەواتا ئەم کارتێلە نهێنیە چیە ! ڕێکەوتنە ! بەڵام کارتێلی ئاشکراشیان هەیە وەک ئۆپیک! کەواتا دامەزراوەی زۆریان هەیە و ئێمە و بەشێکیان دەبینین ! کەواتا بازار فەزائێکی داگیرکراوی قۆرغکراوە ، کەواتا سامانەکان لەدێر زەمانەوە دابەش کراوە ! سوپای ئینگلیز بۆ خۆشی نەهات بۆ داگیرکردنی خاکی عوسمانیەت بەڵکو پلانەکە ئەمە بوو ئێستا دەیبینن !!! عێراق مافی ئەوەی نیە نەوتی بەکێی ویست بیفرۆیشێت و بیدات، بەڵکو ناچارە لەگەڵ سۆمۆدا بێت! ئەسڵەن عێراقێک بوونی نیە کۆمەڵێ بەکرێگیراو میلیشیان ! تەنانەت نەک عێراق یەکێتی سۆڤیەتیش توانای بازاری ئازادی نەبوو ! توانای بەزاندنی بنەماڵەکانی ڕۆکفلێر و ڕۆچێلدی نەبوو بەڵکو بەویستی ئەوان نەوتەکەی دەخستە بازارەوە ، هەرلەبەر ئەمەش هەڵوەشاوە .!!

بەڵام لەمڕۆدا کتێبەکان و ئابووریناسەکان چی دەڵێین ! هیچ
بیرۆکەیاکیان نیە لەسەر داگیرکردنی دراو و بازرگانی جیهانی !ٚ یەکێ
لە هەوڵە گەورەکانی ئەمریکا بریتی بوو لە ڕووخانی بانکی مەرکەزی
سۆڤیەت کە تەواو سەربەخۆ بوو و جێگای بریتن ۆدسی گرتبووەوە !!
کەواتە بەهاتنە ژوورەوەی دراوی داگیرکار بۆ وڵات هەمان کاریگەری
هاتنی سوپاکەی هەیە! دەبێتە هۆی داگیرکردنی زەمینی و سیاسی و
ئایدۆلۆژی وڵاتەکەش

بەڵێ ئەمە پلانە ئیبلیسەکەیە و ئەوەش دەستور و یاسا
دروستکراوەکانیەتی بۆپاراستنی سیادە و هەیمەنەی دۆلار و داگیرکاری
مۆدێرن ! لەژێر چەتری دیموکراسی و عەلمانیەت !

▲دۆلار کاغەزی پەرستراو

دەتوانی دۆلار لەهەموو جێگایە ببینی ! بووە بە بەهای جیهانی مۆدێرن
! بەڕادەیە بووە ئارامی دەروونی بۆ کۆمەڵگای مۆدێرن ! هێمای
دەوڵەمەندی و بەهێزی !دۆلار نیشانەی ئیمپریالیزمی ئەمریکی ،
نیکسونی سەرۆکی ئەمریکا دەڵی هێزی دراو هێزی ئابووری وڵات
دیاری دەکات ، کاتێ دۆلار دەپژمێت ! جیهان سەرمای دەبێت !

دۆلار پێویستی نیە بەڵکو حەزە ، کاتێ خۆپیشاندانێک دەکرێ ئاڵاکان
دەسوتێنریت ! پەنجەرەکان دەشکێ ! کەسەکان دەکوژرێ ! پاسەپۆرت
و کارتی نیشتمانیەکان دەسوتێنریت بەڵام نابینی کەسێک دۆلاری
بسوتێنی!

لەکاتی ڕاگەیاندنی سەربەخۆی ئەمریکا لەساڵی 1776 دا لەوکاتەدا
بەریتانیەکان ڕەتیانکردەوە واز لە ئەو زەویانە بێنن لەئەمریکا

داگیرکرابوو بۆیە ئەمریکا توشی شەرهات و پێویستیەکی زۆری بەپارە هەبوو بۆدابین کردنی خەرجی شەڕ سەرکردەکانی ئەمریکا دراوی کاغەزیان داهێنا بەشێوەی سەرەکی نەبوو لەوکاتەیا ، ساڵی 1787 دا ئەمریکا جەنگەکەی بردەوە و جۆرج واشنتۆن بوو بە یەکەمین سەرۆکی ئەمریکا وێنەکەی لەسەر دراوی کاغەزی یەک دۆلاری هەیە ، جۆرج وشنتۆن ئەلێکساندەر هامیلتۆنی کردە بەڕێوبەری خەزێنەی ئەمریکا وێنەی ئەم کەسەش لەسەر دراوی کاغەزی دەدۆلاری هەیە هامیلتۆن دەیویست بانکێکی ناوەندی فیدارڵی دروستکات بروای وابوو ئەمە دەبێتە هۆی گەشەی پیشەسازی و بازرگانی بەڵام تۆماس جێفرسۆنی وەزیر ئەم بیرۆکەی ڕەتکردەوە وێنەی جێفرسۆن لەسەر دراوی کاغەزی دوو دۆلاری هەیە جێفرسۆن لای وابوو ئەم بانکە پێویست نیە چون پێی وابوو ئەمریکا خاکەکەی کشتوکاڵیە جێفرسۆن پێی وابوو ئەم بانکە وڵاتەکە بەرەو تەمەڵی و سستی دەبا ، جێفرسۆن زۆر لەوە دەترسا کۆمەڵێ سەرمایەداری چاوچنۆکی خراپەکار ببنە خاوەنی بانکی ناوەندی لەساڵی 1791 دا ئەوەی کە جێفرسۆن لێی دەترسا ڕوویدا ! بۆیە بانکی ناوەندی ئەمریکا لەژێر دەوڵەت نیە بەڵکو لەلایەن کۆمپانیاکان و خاوەن پشکەکانەوە بەڕێیووە دەبرێت پێشتریش باسمان لەوەکردبوو کێین ئەم کۆمپانیایانە !!! (لینکی ئەم بابەتە لەکۆمێنتە )

دۆلاری ئەمریکی لەساڵی 1792 پشتی پێ بەسترا وەک دراوێکی فەرمی ئەمریکا ئەوکاتە سێ جۆر دراوی کانزایی هەبوو ئاڵتون و زیو و مس بەم شێوازە ئەم سێجۆرە هەتا ساڵی 1862 بەردەوام بوو و بەهۆی هەڵگیرسانی جەنگی نێوخۆ لەنێوان باکوو و باشوور و پێویستی حکومەتی ناوەندی بە زێر وزیووەکان دراوە کانزەیەکان بەتەواوی گۆرا بەکاغەز لەوکاتەدا دۆلار تەنها وەک کاغەزی متمانە بوو لەنێوان حکومەت و خەڵکدا ، لەواقعدا بەهای نەبوو ، بەڵام ئەو دراوانەی هێمای ئاڵتونی لەسەر کرابوون دەتوانی بەهێندەی نرخەکەی ئاڵتون بەدەست بێنێت ( هێمایەکی ئاڵتون لەسەر دۆلارەکە بوو ) دواتر نرخی دراوی کاغەزی بەرامبەر ئاڵتون دەکرا بۆ ڕاگترنی سەنگەکەی

لەوکاتەشدا کۆنگرێسی ئەمریکی فەرزی کرد لەسەر خەڵک مامەڵە بەدۆلاروە واتا نێوان خەڵک و حوکومەت بە دۆلاڕ بوو مامەڵەکان ...

لەساڵی 1879 دوای دروست بوونی هەڵاواسانێکی گەورە لە ئەمەریکا دۆلاری ئەمریکی بەشێکی زۆری بەهاکەی لەدەستدا دووبارە دۆلار بەئاڵتون بەرامبەرکراوە و خەڵکی دەیتوانی دۆلارەکان بگۆرنەوە ئاڵتون هەرکات بیانویستایە بۆیە هەڵاوسانەکە کەم بووەوە ..

لەساڵی 1929دا قەیرانێکی ئابووری زۆر گەورە ڕوویدا ئەمەش وای لە ڕۆزفلت کرد دۆلار بەزێر هەڵوەشێنێتەوە بەم شێوازە بەردەوام بوو لەداکەوتن و بەرزبوونەوەی بەهای دۆلار هەتا رێکەوتنی بریتن ۆودس پێش جەنگی جیهانی یەکەم جەنگێکی دراوی هەبوو لەنێو وڵاتانی ئەوروپا بەڵام دوای جەنگەکە هەموویان نرخیان لەدەست دا جگە دۆلار چون دووربوو لە ناوجەرگەی جەنگەکەوە بنەکەی لە ئەمریکا بوو پێش ساڵێک لە کۆتای جەنگی جیهانی دووهەم ئەمریکا پلانی سیستەمێکی ئابووری جیهانی دانا کەتێیدا دولار و ئەمریکا لەسەرەوەی هەڕەمەکە بن ! ئەمەشی لەرێگەی بریتن ۆدسەوە ئەنجامدا لەساڵی 1944 کە 44 وڵات بەشدار بوو تێیدا لەوکەشدا ئەو وڵاتانە ئەیان ناڵاند بەدەست نەهامەتیەکان جەنگی جیهانی دووەمەوە ،( پێشتر ئێمە باسمان کردبوو چۆن لۆبیەکانی پیلانگێری رۆژئاوا پیلانی ئەم جەنگەیان دانابوو )( لینکی ئەم بابەتە لەکۆمێنتە ) وتمان بۆ دووهۆکاربوو :

یەکەم لاوازکردنی ئەوروپا و سۆڤیەت بوو لەڕووی سەربازی و ئابووریەوە و سیاسیەوە

لەڕووی ئابوویەوە داکەوتنی دراوەکانیان بوو (وەک فرانکی فەرەنسی ..هتد) بەهێزبوونی دۆلار بەهۆی ئەوەی ئەوروپا لەماوەی ئەو

دووجەنگە هەموو پێداوستیەکانی لەئەمڕیکا دەکری بەمەش دۆلار زاڵتر بوو تەبعەن هۆکاری تر

دووهەم : بەهێزبوونی ئەمریکا لەڕووی سەربازی و ئابووری و سیاسیەوە

لەڕێگا بەهێزەکان بۆ زاڵبوونی وڵاتێ سیستەمی ئابووریە ، بۆئەمریکاش دۆلار باشترین چەک بوو کردی بە براگەورەی جیهان

لەڕێگای ئەم کۆنگرەوە ئەمریکا قەناعەتی بەو 44 وڵاتەکرد کە ئەمریکا بەهێزترینە لەرووی سەربازی و ئابووریەووە وە هەروەها هێمنترین وڵاتە بەهۆی هەڵکەوتەی جوگرافی و تەماح تێنەبرینی کەس بۆ داگیرکردنی ، پێشنیاری ئەوەی کرد بۆ وڵاتەکان دراووەکەیان بەرامبەری دۆلار بکەن چون دۆلا جێگیرە بەمەش دۆلار بوو بە مەرجەعی سەرەکی بۆ دیاریکردنی گۆرینەوەی دراوەکان بۆنموونە دینار بگۆڕیتە تومەن هەردووکیان بەرامبەر دۆلار دەکرێن بۆ زانینی بەهاکەیان پاشان دەگوڕدرێنەوە ، بیرکەنەوە ئەمریکا خۆی تەنها سێ چارەکی زێری یەدەگی جیهانی هەبوو لەوکاتە ( چونکە هەموو وڵاتانی کۆنگرە بریتن ودس ڕازی بوون زێری یەدەگیان بدەنە ئەمریکا ئەویش کاغەزی سەوزیا پێدا ) بەڵام ئەمریکا پەیمانی بەوڵاتانی بریتن ۆودس دابوو بەدۆلار کاریان دەکرد کە زەمانەتی ئەوە دەکات هەرکات ویستیان بەنرخێکی جێگر دۆلارەکەیان بۆدەکاتەوە بە زێر نرخەکەش 35$ بۆ هەر ئۆنسەیە زێر واتا 28گرام ، یانی هەرکەس 35دۆلار ببا بۆ بانکی ناوەندی ئەمریکا 28 گرام زێری پێدەدەرێت، ئەمریکا خۆی ئیلتزام کرد و پەیمانیدا بە پشتگیری لە هەر دۆلارێک بە زێر چ ناوەوەی وڵاتی خۆی بێ دۆلاڕەکە چ دەرەوەی ، ئەمەش نرخی دراوەکانی دیکەی بەرامبەر دۆلار جێگیرکرد .

ئەمریکا دیسان پەیمانی بە وڵاتەکانی کۆنگرەی بریتن ۆدس دا  کە دۆلار هەتا کاتێ دروست دەکات کە زێری هەبێت بەرامبەری ، واتا کەزێر نەما  دولار چاپ ناکات , لێرەشەوە دۆلار بوو بە تاکە دراوێ کە بەزێر بەرامبەر بکرێت و دراوەکانی دیکە هەموویان شکستیان هێنا چونکە توشی هەڵاوسان دەهاتن ! ، یەکەمین وڵاتانێکیش کەوتنە گومانەوە و ڕەخنەیان هەبوو لەم پلانە ئەمریکیە بۆ کۆنترۆڵی ئابووری جیهان  ئەوروپابوو ، ئەمریکیەکان بەڵێنی پانزە ملیار دۆلاریان بەستالین دابوو بۆ ئاوەدانکردنەوەی وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی ئەوروپا کە لە ژێر دەستیدا بوون  گەربێتو  بێدەنگ بێت  لەسەر بوونی دۆلار بە دراوێکی جیهانی ، ستالین ڕازیبوو ، ئەوروپیەکانیش جگە ئەمریکا هیچیان بۆ نەماوە  و لێرەشەوە دۆلار بوو بە جیهانی وڵاتانیش لەباتی زێر دەستیان دایە کۆکردنەوەی دۆلاری ئەمریکی لە گەنجینەکانیان چون هەرکاتیک بیانەوی دەتوانن بیگۆرنەوە بە زێر بەپێی ڕێکەوتنامەی بریتن ۆودس  لێرەشەوە وڵاتان دۆلاریان وەک یەدەگی ئاڵۆگۆری دەرەکی هەڵدەگرد بۆماوەی پانزە ساڵ ئەم پیلانە ئەمریکی بەردەوام بوو  هەتا جەنگی ڤێتنام و نیکسۆن شۆک

لەساڵی **1955**دائەمریکا دەستی کرد بەجەنگی ڤێتنام پێی وابوو بەماوەیەکی کورت دەباتەوە کۆتایی دێت بەڵام بیست ساڵی خایاند ئەمریکا توشی داڕمانێکی زۆر گەورە کرد  لەئابووریەکەیدا ، بۆیە پێویستی بە دۆلارێکی زۆر زیاتر بوو بۆ خەرجی شەڕەکەی لەگەڵ ڤیتنام ، چونکە ئەمریکا  پەیمانی دابوو کە دۆلار هەتا کاتێک چاپدەکات زێر هەبی بەرامبەری بکات چونکە زێری دوونیا مەحدوود و سنوردارە و ئەمریکاش دۆلاری دەوێ بۆ خەرجی جەنگی ڤێتنام بۆیە ئەمریکا سنورەکانی بەزاند و دۆلاری زیادەی چاپدەکرد بەرامبەری زێری نەدەکرد چون هەموو زێرەکان بەرامبەر دۆلار کرابوو پێشتر و زێر نەمابووەوە بۆیە بەنهێنی بۆ خەرجی شەڕەکەی چاپی دۆلاری دەکرد ئەمەش بووە هۆی داڕمانێکی گەورەی جیهانی و بووە هۆی کۆمەڵە ڕووداووێک کە جیهانیان گۆڕی ...

ئەو ڕووداوانە چیبوون ؟ کاریگەریان چۆنە لەسەر ئێستا؟

## ٨ _ فریادڕەسەکانی دراوی ئیبلیس

▼فریادڕەسەکانی دراوی ئیبلیس و ئیمپریالیزم کۆتا شاڵاوی سەرمایەداری.

پێشتر باسی ئەوەمان کرد لەڕێکەوتنامەی "بریتن ۆودس" وڵاتان ڕازی بوون بەکردنی دۆلار بەدراوی جیهانی لەبەرامبەر پێدانی زێردا ، ئەمە واتا ئەوەی جیهان زێرە یەدەگەکانی خۆی بەئەمریکا دەدا بۆچی ؟ بۆپێدانی کاغەزێکی سەوز هیچ بەهایەکی نیە ! یەکەم وڵاتیش هەستی بەمەکرد فەرەنسا بوو لێرەشەوە قەیرانەکەسەری هەڵدا کاتێک

"چارڵ دێگۆل " سەرۆکی فەرەنسا لەساڵی 1970دا داوای کرد هەموو دۆلارەکان لەبانکی ناوەندنی فەرەنسی کە191ملیۆن دۆلار بوو بکرێتەوە بەزێر تەبعەن بەپێی رێکەوتنی " بریتن ووّدس " ئەمە شتێکی ئاسایە بەڵام ئەمریکا رەتی کردەوە چونکە ئەو برە زێرەی لەبەردەستدا نەبوو بەهوێ جەنگی ڤێتنامەوە هەمووی سەرفکردبوو تەنانەت ئەوەندە مایەپووچ بوو دۆلاری چاپ دەکرد بەبێ ئەوەی بەرامبەری زێری بکات بۆیە وڵاتانی دیکەش متمانەکەیان بەدۆلار لەدەستدا و داوایان کرد ئەمریکا راستگۆبێ لەگەڵ پەیمانەکەی ( کە بریتیبوو لەگۆرینەوەی دۆلار بەزێر هەرکاتی وڵاتەکان ویستیان )

بۆیە دۆلار بوو بەکێشەیە بۆ ئەو وڵاتانەی کریبوویان و دەستی کرد بە دابەزین و لەدەستدانی بەهاکەی و ئەمەش بووە هۆی قەیرانیکی ئابووری بۆ ئەمریکا ، هەروەها زۆرینەی خەڵکی ئەمریکاش متمانەیان بە دۆلار نەما چوونە پێش بانەکەکان بۆ گۆرینەوەی دۆلار بەزێر ئەمەش بووە هۆی هەم هەمەو و ئەزمەیەک ، لەساڵی 1971 " نیکسۆن" سەرۆکی ئەمریکا بریاریکی دا هەرکەس قاڵبێکی زێری هەبێت لەماڵەوە دەساڵ زیندانی دەکرێ ، ئەم هەنگاوە بۆ برینی پێی هەرکەسێ بوو بیەوی دۆلار بکاتەوە زێر ، کورتهێنانەکانی ئەمریکا تا

دێت زیاتر دەبوو بۆگۆڕینی دۆلار بۆ زێر بەهۆی جەنگی ڤێتنامەوە هەتا کۆتا سات وای لە "ڕێتچار نێکسۆن " کرد بەیانامەیەکی مێژوویی بڵاوکاتەوە لەساڵی 1973 دا کەئەمەبوو :

وەزیری گەنجینە "کۆناڵیم" بینی پێم وت بەشێوەیەکی کاتی بوەستی لە گۆرینی دۆلار بۆ زێر ئەمەش دەبێتە هۆی جێگری دۆلار ...

واتا دۆلاری هیچ وڵات و کەسێک ناکەینەوە بە زێر !!!

بەبڕیاریکی تاک لایەنانە ئەمریکا هەموو بڕیارەکانی گۆڕینەوەی دۆلاری بۆ زێری هەڵوەشاندەوە ئەمە کاردانەوەیەکی گەورەی بەدوای خۆی جێهێشت لەجیهاندا کە بە " نیکسون شۆک" ناسرا بۆچی شۆک ؟ چوون وڵاتەکان دەیان زانی کاغەز هیچە و بێ بەهایە بەڵام بەهۆی بەهێز ئەمریکاوە متمانەیان پێکرد کاغەزیان بەسەر زێردا هەڵبژارد

لێرەوە ئاشکرابوو کاغەز هەر کاغەزە ! بەڵام ماڵ وێرانیەکە بۆ ئەو وڵاتانە بوو هەموو یەدەگی زێریان خستە پێش ئەمریکا و گۆڕیانەوە بە دۆلار و ناشتوانن وازی لێبێنن چونکە هەموو ئەوەی هەیانە دۆلارە !

دواتر نرخی زێر ئازاد بوو و جێگیری نەما و خواست و خستنە ڕوو نرخی زێری دیاری دەکرد نەک دۆلار ! کاغەزەکانیش بوون بە وەهمێک لەلای وڵاتەکان و هیچ نرخێکیان نەما بەناچاری تەنها حوکمەتەکان کاریان پێکرد ! بۆیە لەساڵی 1973 بەدواوە چل هێندە نرخی دۆلار دابەزی لەکاتێ نرخی زێر زۆر بەرزەوە بوو ، لێرەدا ئەمریکا و ڕۆژئاوا شکستیان هێنا و داتەپی ئابووریان بۆیە ئەمریکا پیلانێکی شەیتانی دیکەی بەکار هێنا بۆ پاڵپشتکردنی دۆلار ئەویش ئاڵوتنێک بوو بەڕەنگێکی دیکە بەڕەنگی ڕەش! نەوت ! دروستکردنی پترۆ دۆلار ! بۆئەمەش" هێنری کێسنجەری " وەزیری دەرەوەی ئەمریکا لە ساڵی 1974 سەردانی مەلیک فەیسەڵی پاشای سعوودیەی

کرد بەهۆی ئەوەی گەورەترین وڵاتی بەرهەم هێنی پترۆڵ سعوودیەیە !! کێسنجەر گەڕاوە بۆ ئەمریکا بەڕێکەوتنێکی مێژوویی کە لەدووخاڵی سەرەکی پێک هاتبوو :

یەکەم : سعوودیە پترۆڵەکەی بە دۆلار تەنها دەفرۆشێت ، واتا هەر وڵاتێ دەیەوێ پترۆڵ بکرێ لە سعوودیە دەبێ دۆلاری پێبێدا و هەیبی و سعوودیە قەناعەت بە وڵاتانی ئۆپێک بکات بەفرۆشتنی پترۆڵیان تەنها بەدۆلار لێرەشەوە دەستەواژەی پترۆ دۆلار سەریهەڵدا (نەوت بەدۆلار !)

خاڵی دووهەم : ئەو دۆلارانەی سعوودیە وەریدەگری لەوڵاتان لەبەرامبەر نەوتەکەی لە بانکی ناوەندی ئەمریکا هەڵیدەگرێ بۆ بووژانەوەی ئابووری ئەمریکا ! ، لەبەرامبەردا سعوودیە چی دەسەکەوی ؟ پاراستن و پشتیوانی ئەمریکا لەکێ ؟ لەبنەماڵەی ئال سعوود بۆ مانەوەیان لەدەسەڵات !!

پێچەوانەی سیستەمی دۆلار بەئاڵتون کە ئەمریکا ناچار بوو بە پەیداکردنی ئاڵتون بۆهەر دۆلاری چاپیکات پترۆدۆلار رەوایەتی داوە ئەمریکا چەن دۆلار چاپدەکات بیکات چون سعوودیە سامانێکی نەزانراوی نەوت لەژێر خاکەکەیدایە بەسە بۆئەوەی ئەمریکا و دۆلارەکەی بکاتە فیرعەونێک بەسەرووی جیهانەوە !!! لێرشەوە دەپرسن باشە بۆچی وڵاتانی بەرهەمهێنی نەوت وازناهێنن لەفرۆشتنی نەوت بە دۆلار و گۆرینی بە دراوێکی دیکە لەوڵامدا دەڵێین : ئوستول و کەشتیە جەنگیەکانی ئەمریکا لە دەریاکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستن چونکە ئەوانە بۆ سەفرە و سیاحە نەهاتون بۆیە هێزی سەربازیە هێزی ئابووری ڕادەگرێ ...

بۆنموونە کاتێ "مەلیک فەیسەڵ" بریاری دا بە کەمکردنەوەی نەوت و پترۆڵ بۆ ئەمریکا لە ساڵی 1975 دا ئیغتیال کرا لەلایەن کوڕە مامەکەیەوە ، ئەوەش بووە وانەیەک بۆ هەموو وڵاتانی ئۆپیک کە دۆلار هەر تاکە دراوی فرۆشتنی نەوتە لێرەشەوە پێویست نەما دۆلار بەرامبەر بە ئاڵتون چون سعوودیە و ئال سعوود وەک فریاد ڕەس باڵی پیلانگێری ڕۆژئاوا و ئیبلیسیان ڕاگرت لە کەوتنێکی دیکە ! دۆلاریان کردە بتێک مرۆڤایەتی بیپەرستێ ! تەنانەت چین و ڕووسیا و وڵاتانی دژکاری سیستەمی ئابووری ئەمریکاشیان ناچار کرد سەر دانەوێنن بۆ دۆلا و بانکی ناوەندی ئەمریکا!! بۆیە ئاڵتون داکەوت و دۆلار بەرزبووە!! ئال سعوود لەهێنری کێسنجەر و سەرۆکی ئەمریکا دڵسۆزتر بوو بۆ پیلاگێری رۆژئاوا و رۆتچێلد و ڕۆکفلیر بۆ داگیرکردنی ئابووری جیهان !

هەمووی بەلایەک ! ئەوانەش بەلایە تر دەڵێن ئال سعوود و سەرانی دەسەڵاتداری ڕۆژهەڵاتی ناوین کاربەدەستی موسڵمانن !! ئەوەیە سەردەمی دەجال و کۆتا زەمان کاتێک کە درۆزن راستگۆیە و ڕاستگۆش درۆزن !! بەهەرحاڵ..

کاتێ سەدام ڕازی نەبوو نەوتی عێراق بەدۆلار بفرۆشرێ و ویستی نەوت بە یۆرۆ بفرۆشێ لەساڵی 2000 دا ئەمریکا بریاریدا حکومەتەکەی برۆخێنیت بە بیانوی چەکی کۆمەڵکوژ لەکاتێکدا نەشیان دۆزیەوە !!! ، هەمان شتیش بەقەزافی کرا کاتێ ویستی دراوێکی ئەفریقی دروستکا بۆ فرۆشتنی پترۆڵی لیبیا هەمووشمان دەزانین چی لەقەزافیکرا هەمان شتیش بەئێران دەکرێ کە دەیەوێ نەوتەکەی بە دراوی چینی بفرۆشێ بۆ ڕووخانی پترۆ دۆلار !!!

کۆمەڵە دەسەڵات داریک و سەرمایەدارێک دەیانەوێ سیستەمی ئابووری ئەمریکی بیێتە سیسەمی ئابووری جیهانی بۆ ئەوەی دۆلار بکەن بەخوایەک هەموو تاکێک سەجدەی بۆببا هەتا لەپێناوی چنگ

خستنی دۆلار خەڵکی هەموو شتێک بکات ! ئامانجی هەموو گۆی زەوی چیە ؟ خۆشگوزەرانیە ! خۆشگوزەرانیش بەدۆلارە ! بەکاغەزێکە ! ئەم کاغەزەش ئاگاداربە لای ئیبلیسە ! خۆی نەخشی کردووە و هێماشی بۆ داناوە ! هەر خۆشی دەزانی بەکێی دەدات و بەکێی نادات !

▼ئیمپریالیزم کۆتا شاڵاوی سەرمایەداری

کاتێک وڵاتێک قەرزەکان دەبات توانای دانەوەی ئەم قەرزانەی نیە سەدا سەد بۆیە زیاتر نغرۆی فەساد و خراپەکاری دەبێ بۆنموونە وڵاتی مالاوی ئەفریقا لەهەشتاکاندا لەلێواری کەوتندا بوو داوای یارمەتی کرد لەنەختێنەی نێوو دەوڵەتی ، نەختێنە یارمەتی دا بەکۆمەڵی مەرج یەکێ لەوانە ئەوەبوو کەنابێت دەوڵەتی مالاوی پەینی کشتوکاڵی بدا بە جوتیاران ، جوتیارەکانیش بۆخۆیان نەیان توانی بیکرن لەکۆتایدا برسێتیەکی زۆر زۆر بڵاوبووەوە بووە هۆی مردنێکی زۆر لەو وڵاتە یەکێکی تر لەو مەرجە سەیرانە سەپێنراوە سەر وڵاتی ئوردندا ئەویش پرۆژەیەکی هەبوو ئوردن بۆ دانانی بەنداویک لەسەر رووباری ئووردن ، داوای قەرزیکرد لە نەختێنە بۆ بەنداوەکە ، قەرزەکەیان پێدا بەمەرجی ئەوەی ئیسرائیل دەبێ رازی بێت لەدروستکردنی بەنداوەکە !! ئووردن مەرجەکەی قبووڵ نەکرد و قەرزەکەیان پێ نەدا !!

پێشتر لە ستۆریەکدا وتمان پلانی 2030 سعوودیە چیە ؟ کرانەوەی سعوودیە بۆ خو و رەوشتی ئیمپریالیزمی ! هەمان شت کە خرتچۆف و ستالین تورە کردبوو ! سەرسام بوون بە سەقافەت رۆژئاوا ! جل و بەرگی ئیمپریالیزمی ! لەکۆتایشدا بەهۆی زاڵ بوونی دۆلارەوە خرچۆف نەک تەنها سەقافەتی ئیمپریالیزمی بەسەر وڵاتەکەی سەپا بەڵکو سیستەمی ئیمپریالیزمیشی بەسەر ڕووسا جی بەجێ بوو ! بۆیە ڕۆژئاوا سەقافەت و خو رەوشتی خۆی زاڵ دەکات بەهۆی هێزی سەربازی و ئابووری و ئیعلامەوە ! دەیکاتە مەرجیش بۆ

خۆشگوزەرانی وڵات ! گەر دەتەوێ نەوتەکەت بڕوات دەبێ بکرێیتەوە بەرووی ڕۆژئاوا! بۆیە " نیوم " و چەندین پرۆژەی دیکە دێتەبوون !

کەواتا هێشتە لات وایەکۆنترۆڵی ئەم بانکانە لەلای حکومەتەکانە !!
نەختێنەی نێوودەوڵەتی لە 188 وڵاتی ئەندام پێکهاتووە ئەم وڵاتانە مافی دەنگدانیان هەیە بەڵام بەشیان کەمە ! بۆنموونە ئەمریکا لە 17.6% بەشی لە نەختێنەی نێودەوڵەتی ، بۆیە تاکە وڵاتە توانای بەکار هێنانی ڤیتۆی هەیە لەنەختێنەی نێوودەوڵەتیدا ( پێشتر باسمان کردووە دەسەڵاتی بانکی ئەمریکی لەلای کێیە ) ! کاتێ وڵاتێکی داوای قەرز دەکات ئەوان مەرجی زۆر قورسی بۆدانین زۆرجار مەرجەکان زۆر قورسن وەک پێدانی کانزانکان وڵاتەکەی بەکۆمپانیا بیانێکان و دەسهەڵگرتنی دەوڵەت لەدەعمی کاڵاکان بۆ هاونیشتمانەکانی لەکۆتایدا قەرزەکە چونکە ریبای لەسەرە چەن هێندە زیادەکات و دەسەڵاتی خراپ و گەندەڵیش کانزاکان وڵاتی بەدیاری دەدات بەو کۆمپانیانە ، قەرزەکانیش لەوەبەرهێنان بۆگیرفانی خۆی خەرجدەکات پارەکانیش دەخاتە بانەکەکان سویسرا و بانکی فیدارڵی ئەمریکیەوە ، لەئەنجامی ئەمەشدا فەقیری و بێکاریەکی زۆر بڵاوەدەکات لەکۆتایشدا وڵاتەکە ئیفلاسدەکات و هەرئەمەش ڕوویدا لەوڵاتی ئەرجەنتین !

ئەرجەنتین لەماوەی جەنگی جیهانی یەکەم و پێشتریش لانکەیەک بوو بۆ ئاوارە ئەوروپیەکان و دەوڵەمەندترین وڵاتی ئەمریکای لاتینی بوو زۆرترین گەشەی ئابووری بەرێژەی 6% بوو لەساڵی 1914 دا یەکێک بوو لەوڵاتە دەوڵەمەندەکانی جیهان ئابووریەکەی زیاتر بوو لەفەرنسا ئەڵمانیا و ئیتاڵیا هەتاوەکوو ئەوکاتە ئینقلابی سەربازی تێیدا ڕوویدا لەلایەن جەنەراڵ خۆرخی فیدڵ لەساڵی 1975 دا ئەمریکا پشتیوانی کرد وەک چۆن پشتیوانی هەموو ئینقلابێک دەکات لەبەرژەوەندی خۆی لەم کودەتا 300 هەزار کەس مرد و تێکچوون توشی وڵات بوو ئابووری لەلێواری کەوتن بوو دواتر ئەرجەنتین بەرە

بەرە بەرەو تیاچون چوو بەهۆی قەرزکردنی لە نەختێنە "کێس هارمان"  نوسەر و ڕۆژنامە نوسی بەریتانی کتێبێکی هەیە بەناونیشانی ( ئەرجەنتین شۆرشێک لەلێواری قەیرانێکی جیهانیدا) لەم کتێبە روونی دەکاتەوە چۆن ئەرجەنتین ئیفلاسی کرد بەهۆی کوودەتایەک بە پشتیوانی ئەمریکا خۆرخی ئەو مەرجانەی بەجێ گەیاند نەختێنە داینابوو کە سامانەکانی وڵاتی دایە دەس کۆمپانیا بیانیەکان و باجی لەسەر کۆمپانیاکان هەڵگرت بۆ هاتنە ناوەوە هەتا وای لێهات ڕێژەی هەڵاوسانی ئەڕجەنین لەساڵی 1989 گەشتە 1000% ، قەرزی دەرەکی ئەرجەنتین لە 8 ملیار دۆلارەوە بازیدا بۆ 43 ملیار دۆلار

لەساڵی 1999 دا "فێرناندۆ دیلار"  سەرۆکایەتی گرتە دەست لەوکاتە ئەرجەنتین نغرۆ بوو لە قەرزی دەرەکی بەبری114 ملیار دۆلار ئەم سەرۆکەش دوبارە دەستی کرد بە قەرز وەرگرتن لە نەختێنە ساڵی 2000 قەرزەکان گەشت  بە 147 ملیار دۆلار ، کۆتا شتێک بیکات ئەم سەرۆکە  چی بێت ؟! ڕۆشت داوای قەرزی تری کرد لە نەختێنە بە بری 37 ملیار پاشان لەساڵی 2001 و خۆی و وەزیری دارایی بە فرۆکەیە تایبەت ڕایان کرد لەتاو ئیفلاسی ,  یەک مانگ دواتر ڕاگەینرا ئەرجەنتین ئیفلاسی هێناوە و توانای داناوەی قەرزەکانی نیە ئەرجەنتین لە دەوڵەمەندترین وڵاتەوە بۆ گەندڵ و فەقیرترین وڵات ، ئێستا حاڵی حازر تۆ سەیری ئەم پۆستە دەکەیت ئەرجەنتین یەکێکە لەو وڵاتانە خاوەنی زۆرترین قەرزە لەنەختێنە نێودەوڵەتی هەمان شتیش بەسەر یۆنان هات لەساڵی 2020 کە ئیفلاس بوونی خۆی ڕاگەیاند و توانای دانەوەی قەرزاکانی نیە کە90 ملیار دۆلارە دەئەوەندە چووەتە سەری ! هەموو ئەمانە بەهۆی ریباوە بوو ئەو قەرزەی ئەمرۆ ملیاری دۆلار ئەبیەی دووساڵ تر دەبێ دەملیار دۆلار بدەیەوە ، بۆچی ئەم قەرزانە وڵات توشی کاول بوون دەکات ؟؟  ئەی ئەم هەموو قەرزانە بۆکوێ دەروا ؟؟

وڵامەکە لەلای "پێنی لۆپی کۆچیانۆیە"  ئەویش مامۆستای ئابووری زانکۆ و سەرۆکی ئابووری بانکی نێودەڵەتی بوو لە  ساڵی 2020

بەڵام لە پوستەکەی کشاوە ، چونکە سێرچ و بەحسێکی چل پەرەیی کرد لەسەر ئەو وڵاتانە قەرز دەکەن چەن پارە دێتە ژوورەوە و چەن دەڕواتە دەرەوە بەحسەکەی زۆر توشی شۆکی کرد کەزانی ئەو سەرۆکانە لەوکاتە ئەو پارە وەردەگرن وەک قەرز بانکەکان لەسویسرا و لۆکسم بۆرگ و هۆڵەندا هێندەی پارە قەرزەکە دەچێتە سەری

ئەم بانکانە مافیاکان و گەندەڵەکان و سەرۆکەکان پارەکانیان تێیدا دادەنێن کەواتا قەرزدەکەن و لەبانکەکانی ئەوروپا دای دەنێن و هەتا ئەوروپا ئاوەدانبێەوە !!! لەسەر حسابی وڵاتانی دیکەی جیهان ! پینیلۆپی ئەم داتایانە پیشانی ئەو بەرپرسانەی بانکی نێودەوڵەتیدا بۆئەوەی پیشانی گەلەکانی بدەن سەرۆکەکانیان کێین ! بەڵام بەحسەکەی ڕەتکراوە و بڵاونەکراوە بۆیە دەسی لەکارکێشاوە بەڵام ئێستا ئەم بەحسە بەردەستە لەزانکۆی" کۆپن هاگنی دانیمارکی " کەواتا بۆچی ئەم بانکانە ئەم پارە ملیارانە دەدەنە ئەم سەرۆکانە دەزانن گەندەڵن و دەیدزن ولامەکەی لەکتێبێ ( دانپیانانە بکوژەکانی ئابووریدا ) هەیە لەلایەن" جۆم بێرکسەوە" نوسراوە کەباسی ئەوە دەکات چۆن ئەمریکا و ڕێخراوە بانکی و ئابووریەکانی کۆنترۆڵی گەلان دەکەن و داهاتوویان تێکدەدەن بەتایبەتی وڵاتە هەژار و گەندەڵەکان جۆن دەڵێ پیلانەکە ئەوەیە یەکەم قەناعەت پێکردنی وڵاتەکەیە بەبردنی قەرزیکی گەورە ! لەبانکی نێودەوڵەتی یان نەختێنە دواتر سەپاندنی مەرجە توندەکان لەسەری دواتر خنکاندنی وڵاتەکە لەقەرز و ڕیباکانی کە ساڵ لەدوای ساڵ زیادەکات زۆر بەزۆری داهاتی وڵات بۆ قەرزەکە دەروات و هیجی نامێنی بۆ پرۆژە و شتەکانی کە دوایش ئیفلاس دەکات وڵاتەکە ئیتر ئاسانە کۆنترۆڵکردنی و ئاراستەکردنی بەهەرشێوەیەک بتەوێت !!

100ساڵ پێش ئێستا لینین لەکتێبەکەیدا بەناوی ( ئیمپریالیزم کۆتا قۆناغی سەرمایەداری ) پێنج سیفاتی ئابووری ئیمپریالیزمی خستوەتە روو ئەوانیش :

1- دروستکردنی کۆمپانیا قۆرخاکارەکان لەلایەن سەرانی ئیمپریالیزم و دەسگرتنیان بەسەر بازاری جیهاندا

2 - دەسگرتنی سەرمایەدارەکان بەسەر پیشەسازی و بانکەکاندا و دروستبوونی سەرمایەکانیان لەسەر پیشەسازی و بانک وەک وتمان لەڕێگای دەسەڵاتدارانی جێنیشی خۆیان !

3 - بەدەست هێنانی پارە بەهۆی هەناردەکردنی کاڵاکانەوە بۆ وڵاتانی داگیرکراو و بردنی داهاتەکانیان لەرێگای دەسەڵاتدارەکانیان

4 - دابەشکردنی ئابووری جیهان لەنێوان کۆمپانیا قۆرغکارەکان ، دابەشکردنی خێر و بێری وڵاتانی داگیرکراو

5 - دابەشکردنی زەویەکانی جیهان و دووبارە ڕێخستنەوەیان گەڕانەوەیان بۆ ژێر هەیمەنەی خاوەن نفوزەکانیان ، خاڵی پێنجەم ئابووری نیە بەتەواوی بەڵکو سیاسەتی جەنگیە بۆ دابەشکردنەوەی جیهان ...

بەپێی تێروانینی لینین بێت ئێمە لەکۆتا قۆناغی پیلانگێری ئیمپریالیزمی داین ئێستا !!

# ٩ _ قۆرخكارى كشتوكاڵى

## ❖قۆرخكارى كشتوكاڵى و پرۆتۆكۆڵاتى پيلانگێرى جيهانى .

بەهۆى بەردەوام پێويستى مرۆڤايەتى بۆ نەوت و پترۆڵ كۆمپانياكانى وزە پارەيەكى خەياڵى قازانجەكەن ، ئەو كۆمپانيانە دەستيان گرتوە بەسەر بەرووبومى كشتوكاڵى وڵاتاندا بۆئەوەى نەک تەنها كەرتى وزە بەڵكو دەسگرن بەسەر بەرهەمە كوشتوكاڵيەكانى جيهاندا ... و كۆنترۆڵى نرخى نەوت و بەروبومە كوشتوكاڵيەكان

( جۆ و گەنم ...هتد ) دەكەن ئەوان لە پشتى كۆمپانياكانى وزەوەن , بەڵام ئايا چۆن ئەم كۆمپانيانەى وزە كۆنترۆڵى كەرتى كشتوكاڵ دەكەن پەيوەندى نێوان ئەم دوانە چيە ؟

ئيمپراتۆريەتى ڕۆكفلێر دەستى كرد بە ئيش لەبوارى نەوتدا لەساڵى 1870 دا كاتێک دكتۆر "جۆن دى ڕۆكفلێر "هەستا بە دانانى كۆمپانيا "ستاندارت ئۆيل "هەر خۆشى بوو بە يەكەمين مليارديرى ئەمريكى دواتر "ستاندە ئۆيل" گۆڕدرا بۆ" ئێكسۆن مۆبيل ...هتد "، لەڕێگاى كەرتى نەوتەوە ڕۆكفلێر دەستى گرتووە بەسەر خۆراكيشدا ئەوان بەرپرسن لە گۆڕانى زەوى لە كشتوكاڵێكى سادەوە بۆ كشتوكاڵێكى پشت بەستوو بەپترۆڵ ، شۆرشى سەوز لە شەستەكان و حفتاكانى سەدەى پێشوودا سەرى هەڵدا لەئەنجامى هەوڵدانەكانى" بەشى زانستى سروشتى" بوو لە دامەزراوەى ڕۆكفلێر بەهاوبەشى لەگەڵ ڕێخراوە كشتوكاڵى پشت ،" cargil ,bunge كشتوكاڵيەكانى ديكە وەک" بەستو بە پترۆڵ ، جۆرێكى ديكەى نوێيە لە قۆرخكارى سەر لەسەر ڕووى زەويدا ، كۆمپانياكانى كەرتى وزەى ئەمريكا كردە باڵادەسترين كۆمپانياكان ، لەهەمان كاتيشدا ئەو كشتوكاڵە نەيتوانى كێشەى برسێتى جيهانى و كەرتى پزيشكى جيهان تەواوبكات لەساڵى 2008 دا لەكۆى

7کەسی دانیشتوانی زەوی یەکیان خواردنی پێویستی دەسناکاوت بەتایبەت لە وڵاتانی قارەی ئەفریقیدا ..

دکتۆرvandana shiva  دەڵێ  کۆمپانیا گەورەکان کە لەگەڵ خۆیدا ئەو هەموو مادە کیمیانەی بۆ کشتوکاڵی پیشەسازی کیمیایی هێنا باس لەوە دەکەن باس لە دوو ئامراز دەکەن بۆ پڕکردنەوەی زنجیرەی خۆراکی  جیهانی یانی بەشێوەیەکی سادە و نۆرماڵ خۆراکی سەر رووی زەوی دابین ناکرێت بەڵکو بە فشارێکی زۆرە لەسەر رووی زەوی  ئەو ئامرازانەش ...

یەکەم : ئەندازیاری بۆماوەی وەک هۆکاریک بۆ دەسگرتنە سەر بەرهەمەکان لەرێگایەوە کۆنترۆڵی شێواز و جینی بەروبومەکانی پێدەکەن و جۆری جیاواز دێننە بوون

دووهەم : تۆمارکردنی دانەوێلە و بەرهەمەکان و دانانی بە موڵکی تایبەت ، مامەڵەکردن لەگەڵ جوتیارەکان کاتێک دانەوێلەکان لای خۆیان دەپارێزن وەک تاوانباریک لەڕێگای ڕێکەوتنی بازرگانی ئازادەوە

ئەوان پشگیری جوتیارە سادەکان ناکەن بەڵکو پشگیری سەرانی سەرمایەدار دەکەن خاوەنی ملیۆنان هێکتارە زەوین لەناو ئەوروپادا چون ئەوان بەرهەمەکانیان بەدەیان و سەدان شێوازی ناسروشتی دێننە بوون بۆ پەیدابوونی داهاتێکی خەیاڵی ...

دروستکردنی میکانیزمی بۆ ئیبادەکردنی تۆو و دانەوێلەکان بۆ ئەوەی مرۆڤایەتی تەنها لەکۆمەڵی کۆمپانیاوە دانەوێلە و تۆوەکانی دەسکەوی ، بۆیەکەمین جار مرۆڤایەتی شێوازێکی نوێی داگیرکاری بەخۆیەوە بینی ئەویش لەرێگای تۆو و دانەوێلەکان و پەینی کیمیایەوە !

کێسنجەری دەڵێ کێ سەرچاوەکانی خۆراکی گەلان کۆنترۆڵ بکا ئەوا کۆنترۆڵی گەلەکەش دەکات ، کێ کۆنترۆڵی وزە و پترۆڵ بکات کۆنترۆڵی کیشوەرەکە دەکات !!

"مارتن هاوس لینگ " ئەندامی گرووپی حیزبی سەوزە لە پەرلەمانی ئەوروپی نیگەرانە لەوەی کە کەرتی کشتوکاڵی لە ئەوروپا زیان بە ژینگە ئەو کیشوەرە دەگەیەنێ لەداهاتوودا و داوا دەکات لە 20% کشتوکاڵی ئەوروپی کەم بکرێتەوە چون پێ وایە سەرمایەدارەکان و سەرانی دەسەڵات بەهۆی باج وەرگرتن و نەویستی بەهێز بوونی کەرتی کشتوکاڵی هیچ وڵاتێکی دیکە زیان بە داهاتوی کیشوەرەکە دەگەینن ئەو پێی وایە پەرلەمانی ئەوروپی دەعم و پارەکانی بۆ ئەو کەسانەیە خاوەنی زۆرترین زەوین دەشلێ ئەوانەی زۆرترین زەویان هەیە سەرمایەدارەکانن و خاوەنی کۆمپانیاکانن

بەڵام کەسانێک هەن وەک" ئەلبێرت بێس" ئەندامی پەرلەمانی ئەوروپی و سەرۆکی کۆمپانیای" بایرۆنلاند"ی ئەڵمانی دەڵێن ئێمە ناتوانین واز لە 20% زەویەکانمان بێنین بۆ ژینگە چونکە ئێمە ڕێگە نادەین بەوەی کە وڵاتەکانی دیکە ببنە خاوەنی بەرهەم ، چون کێ خۆراکی لابێ کۆنترۆڵی گەلەکان دەکات !!!

لێرەوە دەزانین نوخبەیەکی خراپەکار هەیە کۆنترۆڵی بەرهەمەکان دەکات هەمان دەستە کۆنترۆڵی نەوت و پترۆڵی کردووە کۆنترۆڵی خۆراکی جیهانی کردووە لەرێگای گۆرینی کشتوکاڵ بۆ کشتوکاڵ بەپترۆڵ واتا گرێدانی نەوت و کشتوکاڵ بەیەکدی بۆیە جیهانی کشتوکاڵیش قۆرخکراوە...

❖ پرۆتۆکۆڵاتی پیلانگێری جیهانی

ئەمە چیرۆکیکی نویَ نیە , سەرەتاکانی هەزار ساڵ پێش ئێستا دەرکەوتن لەئەنجامی هەوڵەکانی کۆمەڵیَ زانای جولەکەی ئەزموونداراەوە بۆیەک ئامانج کە نەگۆرە و ناگۆری لە سەرەتاوە هەتا ئێستە ئەویش دروستکردنی "دەوڵەتی گەورەی جولەکەیە " ئەو دەوڵەتەی کە کۆنترۆڵی جیهانی دەویَ ، جیهانێکی لاواز و بێهێز ، ماوەی 10 سەدە بەبەردەوامی ئامادەکاریان بۆ دەکرد بۆ ئەوەی پیلانەکان و جەنگەکان لەکۆتا سەدەیدا , سەدەی بیستەم ئەو سەدەی بە فەرمی دەسپێکی موئامەرەگەورەکە بوو ، سەرەتاکانی بە ئامادەکاری و ریکخستنەوە بوو لەرێگای 24 بەندی سەرەکیەوە  ئەو بەندانە کۆکرانەوە و ناسێنران بەناوی بەندەکانی زاناکانی زایۆن....

ساڵی 1901 دا ژنێکی فەرەنسی  بەناوی " یولیانا گلینگا " کۆمەڵە کاغەزێکی هەڵگرتەوە کە کۆمەڵێک بەڵگانامەی کۆنبوو لەیەک لە گەورە زاناکانی زایۆنیزم  لەیەکیَ لە کۆبوونەوەکانیان  لەفەرەنسا دەستی کەوتبوو ، دوای چوار ساڵ و لەساڵی 1905دا ئەم بەڵگەنامانە گەشتەوە دەستی لێکۆڵەر و نوسەری رووسی "مات فی جۆڤێنسکی" ئەویش لێکۆڵینەوەی لێکرد و کورتیکردەوە و کتێبێکی لەسەر نوسی ئەو بەڵگەنامانە  لە 24 پرۆتۆکۆڵ پێکهاتبوو ئەم پرۆتۆکۆلانە ئەوە نیشان دەدات کە دەبیَ جیَ بەجیَ بکریَ بۆ هێنانە دی دەوڵەتی گەورەی جولەکە  و کۆنترۆڵی فیکری و سەربازی بەسەر جیهاندا  ئەم ئامانجەش بە دابەشکردنی گەلەکان بەدی دێت کە پێی دەڵێن ( گۆیم )ً واتا گەلانی جگە جولەکە  جگە ئەمانە هەوڵدەن بۆ دروستکردنی کێشە سیاسی  و ئابووری و جوگرافیەکان و دروستکردنی جەنگەکان  ئەم کێشانەش بەهۆی جێنیشیەنەکانی خۆیانەوە دروستی دەکەن هەروەها گەلان لە قەرزدا ڕۆدەچێنن ، خەڵکی دەبنە کۆیلەیان بەحەزی خۆیان ئەوەش بەهۆی دەسەڵاتدارانان و گەوجاندنی گۆیمەوە کە خەڵکی بەرەوە یەک حکومەت هاندەدەن  ئەوەش حکومەتی نوێی جیهانیە بەپشتیوانی پیلانگێری رۆژئاوا و لایەنگرانی شەیتان بۆ  هاتنەوەی سەرۆکی کۆتایان ، بەپییَ کتێبە دروستکراوەکانی جولەکە سەرۆکی هەمیشەیان لەکۆتا زەماندا دێت بۆ ڕاگەیاندنی دەوڵەتی گەورەکەیان

بەڵام پێشا دەبێ ئامادەکاری بکرێ بۆ دەرچونی ، ئامادەکاریەکە سەرەتا بەسێ جەنگی جیهانی دەبێ و سێ شۆرشی زۆر گەورە حاڵی حازر سێ شۆرشکە ڕوویداوە و دووجەنگیش ڕوویداوە ئەوەی ماوە جەنگی جیهانی سێیەمە .... ئەوەش وا سەرەتاکی دەبینن ..

لێرەشەوە ئەو بەڵگەنامانە ئەو ژنە دزی کە لە 24 پرۆتۆکوڵ پێک هاتبوو بۆتان شیدەکەینەوە کە وەک ئامادەکاریە بۆ دەوڵەتی گەورەی جولەکە

☜پرۆتۆکۆڵی یەکەم

( ئازادی ☜ ئاژاوە ☜ شۆرش ،☜جەنگ )

- ئازادی سیاسی درۆیەکە بۆ سەرنج ڕاکێشانی خەڵکی عەوام

- بەکار هێنانی پارە بۆ کۆنترۆڵی وڵاتان

- دەسەڵات دارێکی بەرەوشت سیاسیەکی لێزان و کارامە نیە

- دڵسۆزی و دەستپاکی شتانێکی بێ بەهان لە سیاسەتدا

- ئامانجەکانی جولەکە بەهانەن بۆ هەر خراپەکاریە بیکەن

- شیعارمان هەمووی هۆکارەکانی چاوبەست و فێلکردنە

ـ گۆیم یان عەوامی نەزان هەموو مرۆڤایەتین جگە جولەکە

ـ هێز و سەپاندن ئامرازی سەرەکین لە داوەریدا و ئازادی و یەکسانی و راسگۆی وشانێکن مێشکانێکی نەزان دەیلێنەوە

☜پرۆتۆکلی دووەم

( کۆنترۆڵی فێربوون و دەسەڵات و ڕاگەیاندن )

ـ پشت بەستن بە نەزانین و بێ ئاگای گۆیم کۆنترۆڵی مەنهەجی خوێندن دەکەین

ـ کۆنترۆڵی ڕاگەیاندن بەهۆی پارەوە

ـ دانانی کۆمەڵێ دەسەڵاتداری لە گەلەکان خۆیان پارێزگاری کردن لێیان بە سەربازەکانی خۆیان

☜پرۆتۆکلی سێیەم

( ڕوخانی پاشایەتی)

ـ دانانی سۆشیالیزم و شیوعیەت و پیشاندانیان بەرێبازێک کە دەبێتە هۆی جێبەجێ گەیاندنی داواکاریەکانی مرۆڤ

ـ دروستکردنی حیزبی سیاسی چەکداری میلیشیایی  بەکار هێنانی بۆ جەنگی نیوو خۆی و پەرتەوازەکردن

ـ کۆنترۆڵی گەلان لەڕێگای قۆستنەوەی هەستەکانی ئیرەیی و عاتفیەکانەوە

ـ ئیستغلال کردنی داواکاریەکانی خەڵکی و هەژاران بۆ کردنیان بە هێزی خۆیان و پاسەوانی سیستەمەکەیان

ـ ئاڕاستەکردنی گەلان لە نائومێدیەوە بۆ نائومێدی زیاتر  وەک ئامادەکارێەک هەتا لەتاو نائوومێدی دا قبووڵی پاشای چاوەڕوانکراویان بکەن ..

☜پرۆتۆکۆلی چوارەم

( لەناوبردنی دین و کۆنترۆڵی بازرگانی )

ـ سەرقاڵکردنی خەڵکی بە بەرژەوەندیە بازڕگانی و ئابووریەکانەوە  بۆ ئەوەی ئاگای لە دووژمنی هاوبەشیان نەبێت

ـ بازرگانی لەسەر بنچینەی باج و بڵاوکردنەوەی ریبا و سوو لەنێوان خەڵکی بۆ شێواندنی کۆمەڵگا

- تێکدانی وێنای ئازادی بۆ ڕووتوبوونەوە و ئاڵودەبوون و تێکچوونی ڕەوشتی خەڵکی

- دروسکردنی دووژمنداریێتی لەنێوان چینەکانی کۆمەڵگا بۆ کۆنترۆڵکردنی شۆرشەکانی ئابووری

☜پرۆتۆکۆلی پێنجەم

( بەتاڵکردنەوەی سیاسەت لە ناوەڕۆکەکەی)

- دروستکردنی دووژمنداریێتی لەنێوان گەلان و وڵاتانی دراوسێ هەتا یەک نەبنەوە

- بڵاوکردنەوەی بەرتیل لەنێو کۆمەڵگا

- بڵاوکردنەوەی دەمارگیری دینی و نەتەوەیی و نەژادی لەنێوان کۆمەڵگادا

- کۆنترۆڵکردنی هەموو پەیمانامەکانی نێوان گەلان

- کۆنترۆڵی نهێنی لە کەرتی پیشەسازی و بازرگانی لەرێگا بریکار و کۆمپانیاکانەوە

ـ نەهێشتنی چەک بەدەست کۆمەڵگاوە بۆ نەهێشتنی ئازایەتی لەدڵەکانیان

ـ داماڵینی هەستی بیرکردنەوەی خەڵکی و زوو باوەڕهێنانیان بە قسەی ناوبۆش

ـ نغرۆکردنی گەلان لە راو بۆچونی زۆر جیاواز و پێچەوانەدا  هەتا وای لێدی هیچ رەئێکیان  نەبێت تەنها حەزەکان نەبێت

☜پرۆتۆکوڵی شەشەم

( کۆنترۆڵی کشتوکاڵ و پیشەسازی )

ـ  رێکخستنەوەی قۆرخکاریە جیهانیەکان بۆ مژینی سامانی ژێر و سەر زەوی گەلان

ـ کۆنترۆڵی تەواوەتی پیشەسازی و بازرگانی

ـ فەرزکردنی باج و رسوومات لەسەر خەڵکی

ـ بەرزکردنەوەی نرخی مادەکانی کشتوکاڵ و هەبوونی بەتەنها لای کۆمپانیاکانی خۆیان

ـ زیادکردنی باج لەسەر زەویەکانی کشتوکاڵ بۆ زیاتر بوونی داهات

☜پرۆتۆکولی حەوتەم

( دروستکردنی جەنگی جیهانی )

- بەکار هێنانی ئاژاوە و ناکۆکی لەنێوان لایەنەکان بۆ کۆنترۆڵکردنیان

- دروستکردنی جەنگ لەنێوان وڵاتانی هاوسنور

- حوکمدان بە تیرۆر بەسەر خەڵکی وەسیلەیەکە بۆ وڵامدانەوەیان و ناشرین کردنیان لەپێش چاوی گۆیم

بەڵێ بەڕێزان بەردەوامین لە خستنەڕووی پرۆتۆکۆلاتی جولەکە بۆ گێڕانەوەی دەوڵەتی گەورەی جولەکە لەنیلەوە بۆ فورات و هێنانەوەی پاشای ئەبەدیان ...

☜پرۆتۆکۆڵی هەشتەم

(بەتاڵکردنەوەی یاساکان لەناوەرۆکیان )

- دروستکردنی یاساکان بۆ ملکەچکردنی خەڵک و مرۆڤایەتی

ـ پێدانی دەسەڵات و پۆستی گەلان بۆ جگە جولەکە بۆ کەسانێک ڕابردوویەکی ناشرین و خراپیان هەیە هەتا گەر بەگوێیان نەکردنین زیندانیان بکەین بەهۆی مێژوویانەوە

ـ قایمکردنی حکومەتی جولەکە بەسوپایەکی ئابووری و بانکی گەورە لە گۆیم .

☜پرۆتۆکۆڵی نۆیەم

( داماڵینی ڕەوشت و ئەخلاق و بڵاوکردنەوەی عەمیلەکان )

ـ گۆڕینی ڕەوشتی خەڵکی بە پلە بەندی

ـ گەڕاندنەوەی بانگەشەکانی ماسۆنیەت ( ئازادی ، یەکسانی ، برایەتی )

ـ پێویستی جولەکە بۆ کۆمەڵی کەس  کە دژایەتی نەوەی سام  بکات ، بۆ ئەوەی  هەرکەس دژیەتی حکومەتی جولەکە بکات بە دژکاری نەوەی سام لەقەڵەم بدرێ

ـ نیشاندانی جولەکە وەک گەلی زوڵملێکراو

ـ بەردەسکردنی سوپایەک لە گۆیم بۆ زامن کردنی پیلانەکانمان

ـ ئاشتی ڕانا گەیەنین لەگەڵ هیچ وڵاتێک کە دان بە دەوڵەتەکەمان نەنێت

ـ هەڵخەڵەتاندنی جیلە تازەکان بە تیۆر و بیردۆزی ناراست

ـ دروستکردنی بەربەستێکی ڕق و کینە لەنێوان هێزی دەسەڵات و گەلدا بۆئەوەی قەت یەک نەبنەوە

☜پرۆتۆکۆڵی دەیەم

( دروستکردنی دەستورەکان )

ـ ڕێگانەدان بەئاشکرا کردنی عەقیدە و باوەڕ ڕێگە دان بە گەشەسەندن فیکرە دروستکراوەکان (فێمینیزم ، ئیلحاد..)

ـ دەستور و یاسا دەسکردەکان قوتابخانەیەکن بۆ خەڵکی دەبێتە مەرجەعیان

ـ دەبێ سەرۆک و دەسەڵاتداران دۆستانی دەوڵەتی جولەکە بن و دوورخستنەوەی هەر دەسەڵاتداری داواکانمان جێبەجێ نەکات

ـ شەرعیەتدان بە پێدانی دەسەڵاتی سوپا بە سەرۆکی وڵات بۆ بەکارهێنانی بۆ ویستەکانی جولەکە

ـ هێشتنەوەی جیاوازی و کێشەکانی نێوان گەلان و حکومەتەکان و هێشتنەوەی برسێتی و هەژاری وەک چەکی گۆیمی پێ دەترسێنین

☜پرۆتۆکۆڵی یانزەهەم

(سیستەمی نوێی جیهانی )

ـ دروستکردنی بابەتە بێ سوود و وەرزشی و هونەری و ...هتد بۆبێئاگا کردنی خەڵکی لە ڕاستی جیهان

ـ گۆیم ڕانە مەڕن و جولەکەش گورگەکانن

ـ ئەسڵ لە پیلانگێری جیهانی ئەووەیە جولەکە گەلێکن بڵاو بوونەتەوە بە جیهان و کەمن ناگەنە لوتکە جگە فێل و شێووازی نهێنی نەبێ

ـ بڵاوبوونەوەی جولەکە نهێنی سەرکەوتنیانە پێچەوانەی هەندێک وەک شکست دەبیینن

☜پرۆتۆکۆڵی دوانزەهەم

(کۆنترۆڵی ڕاگەیاندن )

ـ ئازادی خۆمان پێناسەی دەکەین و هەر کارێکە کە یاساکانمان ڕێگای بدات

ـ ئێمەین ڕێگادەین چی بلاوکرێتەوە و چیش بڵاونەکرێتەوە

ـ هەر کەسێ پێچەوانەی یاساکانی ڕاگەیاندنمان بێت رێگا نادرێ قسەبکات ، وەلا دەنرێ

ـ ڕاگەیاندنی فەرمی وڵاتان دەبێت بەراستەوخۆ لەگەڵمان بێت و پشتیوانی پرۆژەکانمان بکات

ـ ڕێگانادەین هیچکات کارەکانمان لەرێگای ڕاگەیاندنەوە بە تیرۆر و خراپەکاری بناسێنرێت هەتا خەڵکی وابزانیت ئەوی ئێمە دەیکەین باشەیە و پێچەوانەکەی خراپە و تیرۆر

☜پرۆتۆکۆڵی سینازەهەم

( نەهێشتنی ئاگایی گەلان )

ـ سازدانی کۆمەڵێک چالاکی و جوڵە و حەز بۆ گەلان وەک وەرزش و فیلم و هونەر .. هەتا بێ ئاگابن لە واقعی جیهان

☜پرۆتۆکۆڵی چواردەهەم

(بڵاوکردنەوەی ئیلحاد )

ـ لەناودانی دینەکان جگە جولەکە

ـ دروستکردنی کۆمەڵی بەرنامە بۆ دژایەتی دینەکان جگە جولەکە

ـ پشت بەستن بەوەی دینی جولەکە دینێکی نهێنیە و ئاشکرا ناکرێ

☜پرۆتۆکۆڵی پانزەهەم

( ئینقلاب و شانە نوستوەکان )

ـ ئینقلاب بەناوی گەلەوە دژی هەر دەسەڵاتێک دژمان بێت

ـ لەناوبردنی هەر شانە و گروپێ دژایەتیمان بکات و بێنرخ کردنیان بە سوکایەتی کردن و پشت گوێخستن و ناشرینکردنیان

☜پرۆتۆکۆلی شانزەهەم

(تێکدانی فێربوون )

ـ لەناودانی مێشکی گەنجان گۆرینی فکریان بۆ منداڵ و گۆرینی سیفاتیان بۆ شێوازی مێینە !

ـ دروستکردنی مەنهاجی پەروەدە و فێربونیان لەسەر ئەساسی کۆمەڵی بیردۆز بۆ دروستکردنی جیلێکی گوماناوی و لادەر لە دین

☜پرۆتۆکۆڵی حەڤدەهەم

(لەناودانی دەسەڵاتی دینی )

ـ شکاندن و ناشرینی کردنی سیما دینیەکان و کەسانی خاوەن زانستی دینی لەچاوی خەڵکی

ـ شەرکردن و دژایەتی هەر کەسێ بیەوێ دەسەڵاتی دین بگەڕێنێتەوە بۆ جیهانە نوێیەکەمان

☜پرۆتۆکولی هەژدەهەم

(بڵاوکردنەوەی خراپەکاری )

ـ کۆنترۆڵکردنی هەموو ماڵێک بەشێوازی پۆلیس ئاسا

ـ بەکارهێنانی دەسەڵاتدارانی وڵاتان بۆ بڵاوکردنەوەی خراپەکاری و مەست کردنی گەلەکانیان

☜پرۆتۆکولی نۆزدەهەم

( دروستکردنی حەزەکان )

ـ داهێنانی حەزی نوێ و گۆڕینی ڕەفتار و ئەسڵی مرۆڤ بۆ شتانێک کە لە پێشتردا نەبووبێت

☜پرۆتۆکوڵی بیستەم

(نغرۆکردنی وڵاتان لە قەرزدا )

ـ بردنی سامانی وڵاتان
ـ فەرزکردنی باج لەسەر سەرمایەدارەکان
ـ ناچارکردنی وڵاتان  بە قەرز
ـ دەرهێنانی زێر لەدەستی وڵاتان و گۆڕینەوەی بە کاغەز

☜پرۆتۆکوڵی بیست ویەک

(نغرۆکردنی وڵاتان بەقەرزی نێوخۆی )

☜پرۆتۆکوڵی بیست ودوو

(ئاڵتون )

ـ دەبێ زێری جیهان لای ئێمە بێت و گۆیمیش تەنها کاغەزیان لابێت

☜پرۆتۆکۆڵی بیست وسێ

(دروسکردنی دەوڵەتی جولەکە)

ـ کەمکردنەوەی مادەی گرانبەها لەنێو وڵاتی جولەکەدا

ـ ڕێگانەدان بە ئارەقخواردنەوە لە وڵاتەتازەکەمان دروستی کەین

ـ خەڵکی کۆنترۆڵ ناکرێت مەگەر بەدەسڵاتیکی سەرکوتکەر نەبێت

ـ هەموو ئەو لایەن و مەبدائەنەی جگە جولەکە ئیشیان بۆمانکردووە لەناوەبرێن چون پێیان وایە خائین و خۆفرۆشن

☜پرۆتۆکوڵی بیست و چوار و کۆتا

(دەوڵەتی ملک داود )

ـ دانانی پاشای وڵاتان بە هەڵبژاردن نەک بۆماوە ئەوانەی کە نهێنی هونەری سیاسی و ئاژاوە و دووبەرەکی دەزانن

ـ هیچ کەس شێوازی دەقیقی پیلانەکان نازانێ جگە حاکم و چوار دەورەکانی نەبێت لە جولەکە

ـ دەبێ پاشا و چواردەوەکانی بەشێوازی زۆر بەهێزانە بن و خەڵکی بەویستی خۆیان بەگوێیان بکەن ...

**لەوانەیە هەندێک بڵێن چۆن ئەم زانیاریانە ئاوها دزراوە یان براوە بەڵام ئەمانە بەشێوازی سادە خۆیان بۆ خەڵکی بڵاویکەنەوە ، هۆکارەکەشی خۆیان دەیڵێین کە بەهۆی بەهێزی جولەکەو لاوازی دووژمنەکانی ترسیک نیە بۆ جولەکە ، هەروەها وەک ئەوەی بەخەڵکی بڵێیت ئێوە دژایەتیمان بکەن یان نا ئێمە وابەجێی دەگەیەنین ، کاتێک باردووخ گونجاویش بێ بۆ دەوڵەتی گەورەی جولەکە ئەوا بەرەسمی بانگەشەی بۆدەکەن بەبێ ترس و نهێنیەک هەروەک لە تلموودیشدا باسی دەکەن دەبێ جیهان ببێتە دووبەرەوە ، بەرەی ئێمە کە ئەوانەن لەگەڵمانن و هاوپەیمانن و بەرەی دژمان ! هەروەج جۆرج بۆشیش ئەمەی بەجوانی وت لەساڵی 2001 دا ! ، کاتێ کتێبێ ئەم نوسەرە روسیە ساڵی 1951 بلاوبووەوە ڕۆژهەڵاتی ناوەراستدا زورێک پەیدا بوون ئەم کتێبە بەدروخەنەوە بەڵام واقعی رۆژ و هاتنی جیهانی مۆدێرن و هاتنە دی یەکە بەیەکە بەندەکان سەلماندی کە قسەی ئەوانەی دژایەتی بیردۆزی پلانگێری دەکەن هیچ بوو ، ئەو راگەیاندنانەی کە دژایەتی بیردۆزی پلانگێری دەکەن بۆخۆیان دروستکراوی دەستی بیردۆزەکەن**

**وەنبێ چۆناو چۆن ئەمینن و پارێزراون لەدەستی ئیبلیس و هاوکارەکانی !!!**

**(وَإِذْ يَمْكُرُ بِكَ الَّذِينَ كَفَرُوا لِيُثْبِتُوكَ أَوْ يَقْتُلُوكَ أَوْ يُخْرِجُوكَ ۚ وَيَمْكُرُونَ وَيَمْكُرُ اللَّهُ ۖ وَاللَّهُ خَيْرُ الْمَاكِرِينَ)الانفال:30.**

# ١٠ _ فرۆید مەرجەعیەتی جیهانی مۆدێرن

فرۆید مەرجەعیەتی جیهانی مۆدێرن.

سەرەتا ئەوەی لە ئامانجی ئەم نوسینەدا هەیە ئاشکراکردنی پیلانێکە کە سەدەیەکە بەناوی زانستەوە دەفرۆشێتەوە بەمرۆڤایەتی بۆیە شایەنی گرنگی پێدانە...!

نامۆ نیە بۆ کەسێ کە شارەزای مێژووی بێت سەدەی بیستەم وەک زنجیرەیەکی ئامادەکاری بوو بۆ پەرەیەکی نوێ لە مرۆڤایەتیدا ببینێت پەرەیەک نوسەرەکەی ئیبلیس بێت ! تێیدا تەکنیکەکان ئاشکرابوو و زانستەکان بەرەوپیشەوە چوون ، بەهەمان شێوە ئەم بەرەو پێشچوونەش لە درۆ و چەواشەکاری بەدەر نەبووە ! چونکە ئەم سەدەیە خێرێکی کەمی پێبوو پێچەوانە زۆرترین خراپەی هەڵگرتبوو تێیدا ئیلحاد و ڕووتبونەوە ناوەکانی گۆڕا بۆ زانست و ئازادی ! گەر ئێمە پەرەکانی نێوان سەدەی بیست و بیست و یەک هەڵبەینەوە ناوی سیگومۆند فرۆیدا دەبینینەوە ! نهێنی فرۆید چیە وای لێکرد ببێتە بەناوبانگترین زاناکانی دەروناسی ؟ چۆن کەسێک زۆرینە زاناکانی سەردەمی خۆی و چاو ڕۆژشنانی ئەم سەردەمە رەتیان کردۆتەوە وا ئێستە بیرۆکەکان بووە بە مەناهاجێک بۆ قوتبخانە و زانکۆکان !

ئایا بەراستی فرۆید کۆدی نهێنی زانستی دەرونزانی پێشکەش بە مرۆڤایەتی کردووە ؟ یان تەنها بوکەڵەیەکی نۆستیسمی نهێنی بووە ؟ دەتانبەینەوە بۆ سەرەتاکانی سەدەی بیستەم بۆ ئاشکراکردنی بەڵگەنامەیەکی کۆنی بیرکراو ! لەمرۆدا یەک بەیەکی بەندەکانی فرۆید جێ بەجێ دەکرێت ! هەر ئەو بەند بۆچونانەش بوون دواتر شۆرشی جنسی گەورەی لەسەر بنیاد نرا ، بەدەسپێکی سیاسەتی وێرانکردنی کۆمەڵگا بە تێکدانی فکر و حەزەکان تا گەشتن بە زانست و گریمانەکان

و ڕاستیه تیۆریەکان ! بۆ بنیادنانی سیستەمی نوێی جیهانی لەسەر تێورەکانی چیرۆکی سیگمۆند فرۆید !

بەخێربێن بۆچیرۆکی یەکێک لەگەورەترین پیاوەکانی ئیبلیس سیگمۆند فرۆید !

لە "مۆرافیا" کە ناوچەیەک بوو سەر ئیمپراتۆریەتی نەمسای کۆن ، لە بنەماڵەیەک جولەکە لەدایک بوو لەساڵی 1856دا ، گەورە بوونی لەگەڵ حەوت براکەیدا بوو ، هێمنترینیان بوو و نزیکترینیان بوو لەباوکیەوە لەتەمەنی حەوت ساڵیدا لەیەکەم قوتابخانە بەناوی "کۆمۆناڵ ری" دەستی بەخوێندن کرد ، قوتابخانەیەکی راقی زۆرینە جولەکە بوو ساڵی 1873 بەنمرەیەکی بەرزەوە کۆتای بەخوێندن لەو قوتابخانە هێنا، هەتا تەمەنی 17ساڵی حەزی لەقانون بوو تاوەکو بە بیرۆکەکانی داروین گەشت ، ئەو بیرۆکەکانەی کە جیاکەرەوەی دینە لە ژیان ! زۆرجار فرۆید دەیوت یەهوودیم بەڵام هیچ کات پشگیری تەشریعی دینی ناکەم ، بۆیە رۆشتە کۆلێژی پزیشکی لە زانکۆی ڤیەنا لەژێر دەستی "کارڵ کراوس" کە بەرگریکاری سەرسەختی پەرەسندنە خوێندوویەتی ، لەماوەی خوێندیدا لەسەر رێبازی داروینیزم پەروەدەبووە ، چەندین سیمینار و راپۆرتی بۆ پشگیری ئەو چەمکەش لەزانکۆ کردوە بەڵام لێکۆلینەوەکانی لە ئاژەڵی "کەنگەردا " بەتایبەتی لە کۆئەندامی زاوزێیدا شکستی دەهێنا و لێکدانەوەی پێنەبوو بۆی ...

هەروەک لەکتێبەکانیدا دەگێریتەوە هەرگیز بیری لەوەنەکردووتەوە کە ببێتە دکتۆرێک ، سەرەرای خوێندنی" زانستی توێکاری " پزیشکی وای دەبینی ئەم بواری توێکاریە سنورداره بەهۆی رەگەزپەرستیەکەیەوە کە ڕەگەزی جولەکە هەوڵی چنگ خستنی سامان و پارە دەدات بۆیە ئەو بوارە پارەیەکی زۆری بۆ ناهێنایەوە سەرەنجام ڕوویکردە زانستی "دەمار ناسی و مێشک" لەساڵی 1881دا ،

لێرشەوە گەشتی فرۆید بەرەو زانستی دەروونزانی دەستی پێکرد .
لەساڵانی 1880بۆ 1890 دا فرۆید دکتۆر "جۆزیف برۆیر" ناسی کە یەکێک بوو لە دکتۆرە بەناوبانگەکانی ڤیەنا ، کەوتبووە ژێر کاریگەریەوە و بوو بە هاورێی نزیکیشی ، زۆر سەرسام بوو بە چارەسەرە نوێیەکەی بۆ نەخۆشی هیستریا کەئەویش

نەخۆشیەکی دەروونیە بەگۆڕان وەسف دەکرێت. ئەو نەخۆشیە بەزۆری تووشی مێینە دەبێت و بەکۆنترین نەخۆشی دەروونی دادەنرێت دیارترین شێوەی هیستریا ئەوەیە، کەسی توشبوو لە حاڵەتێکدایە کە ناتوانێت بە ڕێگەی سروشتی ئەو شتەی دەیەوێت بەدەستی بهێنێ بۆیە ئارەزووەکەی بۆ نەخۆشی و ڕۆل گێران دەگۆڕێت بەمەبەستی سەرنج ڕاکێشانی کەسانی تر بۆ ئەوەی گرنگی بەکەسەکە بدەن واتە نەخۆش لەحالەتی دەروونیەوە دەگۆڕێت بۆ جەستەیی و بەشێوەیەکی

خۆنەویستانە بەڵام هۆکارەکە هە دەڕوونیە !

چارەسەری "دکتۆر جۆزیف" برۆیەر بریتی بوو لە

ئەویش (خەواندنی موگناتیسی) بوو ساڵێک دوای ئاشنا بوونی بەم چارەسەرە فرۆید لە نەخۆشخانەی سەرەکی ڤیەنا کاری دەکرد ، چەن لێکۆلینەوە و بەحسی لەسەر نەخۆشیە دەرونیەکان بڵاوەکردەوە لەبەر ئەم بەحسانەش روویکردە زانکۆی سابریەر لەپاریس بۆ لای دکتۆر "جان مارتن شاکۆ" کە ئەویش (خەواندنی موگناتیسی )بەکاردەهێنا بۆ چارەسەری هیستریا ئەم گەشتەی بۆ پاریس خاڵی وەرچەرخان بوو لە ژیانی فرۆیدا ، شەوێک گوێی لە دکتۆر" جان " بوو باسی یەکێ نەخۆشەکان بۆ فرۆید دەکرد کە هیستریای هەبوو جان دەیوت کێشەی سەرەکی ئەو نەخۆشەم جنسە بەڵام توشی هیستریا بووە ، فرۆید بیری کردەوە چی پەیوەندی لەنیوان کێشە سێکسیەکان یان جنسیەکان و هیستریا هەیە ؟ کێشەی ئەم نەخۆشەی کردە خاڵێکی بۆ هەموو سێرچەکانی لەسەر هیستریا ، لەوکاتە بەدواوە بە ئەنقەست دەیوت هەموو کێشە هیستریەکان هۆکاری جنسە ، بۆیە وتی هیستریا

نەخۆشیەکی دەرونیە نەک جەستەیی چون بەهۆی کێشە جنسیەکانەوە لە زهنی مرۆڤدا دێتە بوون ،

فرۆید دەیوت هۆکارەکانی هیستریا هەستەکانی مرۆڤە و بەتایبەتیش بێدەنگکردنی حەزە شاراوە سێکسیەکانە ! سالّی 1896گەڕاوە ڤیەنا هەوڵیدا قەناعەت بە چواردەوری و هاوڕێیکانی و زاناکانی ڤیەنا بکات کە کپکردن و شاردنەوەی حەزە سێکسیەکان دەبێتە هۆی هیستریا بەڵام چواردەورەکەی لەوکاتەدا دژی وەستانەوە ، زانستی ئەمرۆ پێمان دەڵی هەرچەن مێشک چالاک بێت لە بەحس و سێرچ و زانیندا ئەوا دەمارە هاندەرەکانی سێکسی لە مێشکی مرۆڤدا کەمترەبنەوە ، کە زۆرجار ئەم دەمارە هاندەرە سکێسیانە بەدوای هەلێکدا دەگەڕێن هانبدرێت و ئەکتیڤ ببن ئەم دەمارەنە لە مێشکی مرۆڤدا لەڕێگای بیستن و بینین و دەسلێدانەوە دەوروژێن بەشی سێکسی لەمێشکی مرۆڤدا دەخەنەکار لەسەر حسابی بەشی بیرکردنەوە و زانین کە وروژاندنی بەشی سێکی لاواز دەبێت ! ،

بەڵام تیرۆی فرۆید پلانێک بوو بۆ تێرکردنی ئارەزووەکانی مرۆڤ بوو بەبێ رێگر و بەربەست و رێکخستن چون پێی وابوو گەر رێی لێ بگیری دەبێتە هۆی نەخۆشیە دەرونیەکا بەڵام بێ ئاگا لەوەی کە لەبەرامبەری ئەو تێرکردنە مرۆڤ چۆن عەقڵی لەدەستدا بەهەرحاڵ ئەم تیۆرە پلانگێریە بەتوندی ئاشکرای کرد وەک زانراوە و چەسپاوە لەزانستی مۆدێرنی ئەمرۆدا هەرکەس دەسبات بۆ پەیوەندی سێکسیە هەرەمەکیەکان لەدەرەوەی چوارچێوەی زەواج و هاوسەری خۆی توشی خەمۆکی و کەئابە دەبێت ، رۆشتن لە ژنێکەوە بۆ یەکێ تر دەبێتە هۆی هاندانی هورمۆنی دۆپامین کە هۆرمۆنی چێژ و خۆشی لەمێشکی مرۆڤدا لەکۆتایدا دەبێتە هۆی خەمۆکی چون زۆر دەردانی بۆشتانێک کە مرۆڤ وەک خۆشترین شتێک سەیری ئەو چێژانە دەکات وادەکات ئەو خۆشترین شتانە ئاسایی ببنەوە و کەمتر دۆپامین دەربدرێ ، واتا کۆمەڵە شتێک هەیە خودا وا مرۆڤی دروستکردووە چێژی لێ

**ببینی بەڵام بێتوو بەشێوازیکی ناسروشتی مرۆڤ بەرە رووی بروات بێگومان جەستەی مرۆڤ دەگۆرێت و وڵام دانەوەی دەبێ بۆی جۆری وڵام دانەوەکەش ( کەئابەیە) ئەو جۆرە مرۆڤانە سنور دانانێن بۆ چێژە سروشتیەکان  هەندێجار لەکۆتایدا خۆیان دەکوژن  بۆیە دەبێت سنور بۆ حەزەکان دابنرێت بۆ رێخستنەوە و سنوردار کردنی هۆرمۆنی دۆپامین نەک هەرەمەکیانە بۆ هەموو شتێ هۆرمۆنەکە بڕژێت ! هەر بۆیە شەرعی خواش باشترین و جوانترین سنوردارکردنە بۆ مرۆڤ  کەیەک بونێکی گەردوونی و جەستەیی دروستەکات لەنێوان جەستەو و کۆمەڵگا و زەوی و گەردووندا..**

**هەروەها فیلمیە رووتەکانیش هەمان کاریگەری سێکسی هەرەمەکی لەسەر مێشکی مرۆڤ هەیە ، لەڕووی نیورۆلۆجیەوە و دەمارزانیەوە تێرکردنی حەزە سێکسیەکان بە هەرەمەکی کاریگەری زۆر دەکاتە سەر تەندروستی مێشک و دەرون ، بەم چەشنەش مرۆڤ زیاتر لە ئاژەڵێک نزیک دەبێتەوە هەموو بەها ئەو بەهایانەی مرۆڤ لە ئاژەڵ جودا دەکاتەوە لەدەست دەدا  ، غەریزە و حەزەکانی کۆنترۆڵی دەکەن دەبێتە کۆیلەی ئەو حەزانە کە خۆشی دروستی نەکردووە بەڵکو بۆیان دروست دەکەن وەک جل و بەرگ و گۆرانی و هاورەگەزبازی ....**
**حەزە دروستکراوەکانی سیستەمی نوێی جیهانی گەلێ زۆرن ،  فرۆید باوەری بە گریمانەکەی خۆی هەبوو لەکاتێکدا  پێچەوانەی سروشتی مرۆڤە کە بانگەشەی تێربوونی حەزەکان دەکا بەبێ رێگر و سنورەکان ، دواتریش لەسەر ئەم گریمانە پوچانە گەورەترین شۆرشی سێکسی لەسەر بنیادنرا لە مێژووی مرۆڤدا لەساڵانی شەست و حەفتاکانی سەدەی پێشوو بێگومان وڵاتانی ئیسلامیش بێ بەش نەبوون لە بڵێسەی ئەم ئاگرە   ،  گەر بەجوانی لایەنەکانی ژیانی فرۆید دیراسە بکەین لە ژیانیدا دوو ڕووی دژ بەیەکی بەجوانی دەبینینەوە**

**لایەنی یەکەم**

( جیاکردنەوەی دین لە ژیان بەتەواوی و کردنی غەریزەکان و حەزەکانی مرۆڤ بە سەنتەر کە کۆنترۆڵی فیکر و کرداری مرۆڤەکەبکات ، چون بەبروای فرۆید مرۆڤ ناتوانی خۆی بەرامبەر حەزەکانی رابگرێت گەر بیشارێتەوە و کپی بکات توشی نەخۆشی دەروونی دەبێت )

لایەنی دووەم

( بەشداری کردنی فرۆید لە زانستی دەروناسی و شیکردنەوەی رەوشتەکان مرۆڤ ، کە بەهۆی ئەمەوە هاوکاریەکی زۆری نەخۆشیە دەرونیەکانی دەکرد )

کەواتا فرۆید خەڵتەیەکی لابوو لە زانست و پیلانگێری وەک ژەمە ڤاکسینێک بەسەر چینی خوێنەران و زانکۆکان بڵاویکردەوە بۆ جێبەجێ کردنی ئەجێنداکانی لایەنیکی نوستیسمی پیلانگێری بۆ ئیبادەکردن و گەڵحۆ کردنی گەلانی زەوی و سورخواردنەوەیان لەنێو حەزە دروستکراوەکان و ئەم باوەرانەش لەنێو زانکۆ و قوتابخانەکان هەم بەکرداری و هەم بە تیوریش دەبینریت و خەڵکیش لێی بێ ئاگایە وەک لەزۆر شتی کەش بێ ئاگایە

ئێستاش دەچینە نێو چۆنیەتی دروستکردنی سیتسەمی نوێی جیهان لەسەر ئەساسی گریمانەکانی فرۆید...

لەساڵی 1895 دا تێروانین و بیرۆکەکانی فرۆید بەئاشکرا دەرکەوتن کاتێک کە لێکۆلینەوەیەکی لەکتێبێکدا لەسەر هیستیریا بڵاوکردەوە ، لەگەڵ ئەوەی فرۆید وەک خاڵێکی زۆر گرنگ دانرێت لە چارەسەری نەخۆشیەکانی مێشک و دەروندا ، بەڵام ئەو راستیە زانستیانەی فرۆید پێی گەشت بوو دەیچەماندەوە بۆ خزمەتی بیرۆکەکانی بۆ ئازادکرنی

حەز و غەریزەکان و نەبەستنەوەیان بەهیچ ئاینێکەوە ، تەنها سەیرێکی کتێبەکانی بکەیت دەبینی چەن گرنگی بە ژیانی سۆزداری و سێکسی داوە بەمەبەستی تەندروستی مێشک بەڵی لەباری ئاسایدا منداڵ پێوستی بە چاودێری و سۆزداری دایک و باوکی هەیە و دایکیش پێویستی بەسۆزی منداڵەکانی هەیە ، هاوسەرەکانیش پێویستیان بەسۆز و بەزەیی و خۆشەویستی هەیە لەنێوان یەکدا .

فرۆید ئەم چەمکانەی بەپێی گریمانەو و بۆچونەکانی خۆی لێکدەداتەوە واتا خۆشەویستی منداڵ بۆدایک لەبەر ئەوەنیە ئەو دایکە بەڵکو لەبەر هەستە سێکسیەکانە بۆ هەموو پەیوەندیەکانی دیکەش هەمان شێوە ، دەڵێ هەستە سێکسیەکان گشتین و گەورەن لە هەموو لایەنەکانی ژیان ڕەنگدانەوەی هەیە هەتا هاورەگەزبازیش ! کپکردنی ئەم حەزانەش مێشکی مرۆڤ دەگۆرێ لە سروشتیەوە بۆ ناسروشتی دەبێتە هۆی نەخۆشیە دەرونیەکان نیشانەکانی هیستریا لەکەسەکە دەردەکەوێت

فرۆید بە بڵاوکردنەوەی بیرۆکەکانی خۆی تەنها نەوەستاوە بەڵکو بیرۆکەکانێ ئەو رەخنەی لە زانستی دەروناسی دەگرت لەسەردەمی خۆیدا کە ئێستا سەلماندویەتی شوێنکەوتنی حەز و ئارەزووەکان بەبێ هیچ بەربەستێک دەبێتە هۆی لەناوچونی دەروونی مرۆڤ ، بۆیە ئینکاری تەشریع و یاسا ئاسمانیەکان دەکات و بەستەمیان ناو دەبات ، بەکورتی ڕاستیە جێگیرە دەرونیەکان تێکەڵ بە گریمانە پلانگێریەکانی دەکات ئەمەش بەرونی لەوتەکەیدا ڕوون بۆتەوە کە دەڵێ :

( کۆمەڵێ گرێەک هەیە دروستەبی لە مرۆڤدا ڕێگری لێدەکات ، دروستەبێ ئەم گرێیە بەهۆی پێکدادانی حەز و غەریزە جنسیەکان لەگەڵ تێروانین و باوەڕە دینی و ئەخلاقیەکاندا ، ئەم گرێیەش دینە ! )

1oedipu- فرۆیدا دەڵێ حاڵەتیک هەیە لەمندالی کور پێی دەڵێن ئەویش ( دروستەبێ لە منداڵە کورەکان بەهۆی حەزی comlex

جنسیانەوە بۆدایکیان و رق لێبوونەوەیان لەباوکیان ، بەڵام ناتوانن ئەوان هیچ شتێ بکەن چونکە کلتور و دین و رەوشت رێگایان نادا بە ئاشکرا کردنی حەزەکانیان  بۆیە ئەم گرێی و تێکەڵەیە لەلای کورەکان دروستەبێ)

هەیە کە ( لەلای کچان  electra comlex 2- لە لەکچانیشدا دروستەبێت بەهۆی حەزی جنسیانەوە بۆ باوکیان بەهەمان شێواز بەهۆی رەوشت و کلتور و دینەوە ناتوانن هیچ بکەن  بۆیە ئەم گرێ و تێکەڵیە ئەم حاڵەتە نهێنیە دروستەبێت لەلای کچان )

ئەمە بانگەشەیەکی نهێنی و ئاماژەیە بەبەرگێکی زانستی  لەژێر پەردەی پاڵنەرە دەروونیەکاندا  و هەست و سۆزەکاندا بۆ زینا و جوتبوونی مەحرەمەکان بەپاساوی دروست نەبوونی نەخۆشیە دەرونیەکان !

ئەم بۆچونانە مناقەشە و قسەڵۆکی زۆری بەدوای خۆی هێنا و بەتوندی لەلایەن کەنیسەوە ڕەتکراوە ،   فرۆید پاساوە زانستیەکانی بەکار دەهێنا بۆ  ڕوخانی دین ، چون دین بوو بە بەربەست لەنێوان حەزەکانی خۆی لەلایەک و جێ بەجێ بوونی بیر و لێکۆڵینەوەکانی لەناو خەڵکی و واقعدا لەلایەکی دیکە  ، لەگەڵ ترسناکی و خراپی گریمانەکانی فرۆید لەسەر کۆمەڵگا و بەها ئەخلاقیەکان ، هەتا ئێستاش گریمانەکانی ئەم کەسە لەناو زانکۆ و مینهاجەکانی خوێندنی وڵاتاندا دەخوێنرێت و لەنێویشیان وڵاتە ئیسلامیەکان !

بۆیە فرۆید کەسی نۆستیسیمی نهێنی بووە ، سەرانی بانگەشەکەران بۆ ئازادی مرۆڤ و بەتایبەت فێمێنیزمەکان کردوویانەتە ڕابەرێک بۆ ئازادیەکەیان  ، لەم بوارەشدا "فێدرێک برۆز "  ڕەخنگری ئەمریکی لە کتبە نوێیەکەی لەسەر فرۆید بەشێوازی زۆر ئاشکرا بەکەسێکی

ساختەچی دەناسێنی ، زۆر بەڵگەو سەرچاوەی موقنعکار هەیە دەیسەلمێنی فرۆید کەسایەتیەکی تەواوی نەبووە، بەڵکو دەیناڵاند بەدەست ناسنامەیەکی تاڵەوە ، چون ڕەچەڵەک جولەکەبوو بەڵام خۆی لەسەر دینەکەینەبوو ، بوونی وەک جولەکەیەک ئاڵۆزیەکی زۆری لە گەڕان و لێکۆلینەوەکانی توشدەکرد ..

لەگەڵ ئەوەشدا زۆر بیری لەبابەتە سێکسیەکان دەکردەوە بەتایبەتیش دوای تاوانبارکردنی بە هەندێک پەیوەندی ناشەرعی لەگەڵ کەسە نزیکەکانیدا هەتا نوسەر "هانگس ساس" کە ژیانی شەخسی فرۆیدی بە پیاهەڵدان و شانازیەوە نوسیتەوە ، دەڵێ جۆرێک ستەمکاری لەناخیدا هەبووە ڕێگەی نادا بەهیچ پیاچونەوەیەک بە گریمانە تایبەتیەکانیدا و جگە بیرۆکەکانی خۆی هیچ هەڵبژاردەیەکی تری قبووڵنەبوو هەرچەند نزیک لەڕاستیش بایە یان دەبوو لەگەڵی بایت یان دژی چون دەیزانی خۆی ژەهر و هەنگوینی تێکەڵ یەک کردووە ! گوێگرتن لەبۆچونی بەرامبەری ڕەتکردەوە بەهەموو شێوەیەک عینادیەکی لە ڕادەبەدەری هەبوو لە بیرۆکەکانی دا....

فرۆید کەسایەتیەکی خۆسپەپێنی هەبووە باشترین بەڵگەش بۆ سەلماندنی ئەم قسەمان گفتوگۆیەتی لەگەڵ قوتابیەکی بەناوی "یۆنگ" کە بەتوندی دژایەتی بۆچونەکانی فرۆیدی دەکرد، فرۆید قوتابیەکەی بەدرۆزن و گومڕا لەقەڵەمدا دواتر نامەیەکی بۆ "ئێرنس جۆنس" سەرۆکی زانکۆ نارد نوسی تێیدا هەرکەسێک بەشێوازی یۆنگ بیردەکاتەوە لەزانکۆی لەندەن دەریبکەن .

فرۆید وای دەبینی شیکاری دەروونی بەدیلێکی مرۆڤگەری علمانیە بۆ دین ، دینیش لای فرۆید وهمێکی دەرونیە و هیچیکە ! ، ئەوەی کە کەمینەیەک خەڵکی دەیزانن فرۆید ئەندامی گرووپێ بووە بەناوی "بینای براید " کە گروپێکە تایبەتە بە جولەکە ئەم گرووپەش هەڵگری بیری" نۆستیسمی بەرپرسیاریە " یان بەناوەکەی دیکەی "کابالا "،

**مەبەدەکانی فرۆید روخاندنی دین و ئەخلاق بوو جێگرتنەوەی بە زانستێکی دروستکراو ! ئەمەش لە پایە سەرەکیەکانی گۆرانی کۆمەڵگایە بەرەو بڵاو بوونەوە و سەرهەڵدانی**

**" لیبیدۆ " یان حەز و ئارەزووی سێکسی لەنێوان مرۆڤ لەژێر پەردەی زانستی دەروونی و پاڵنەرەکان ! ، وەک نموونەیش بۆ ئەو رێخراوانەی لەژێر پرۆتۆکۆڵە گومڕاکانی فرۆیدن کۆمپانیای " نێتفلێکسە "**

**فرۆید کارەکان و چارەسەرەکانی بۆ نەخۆشی هیستریا بەردەوام پێدا بە پشت بەستن بە جگە خەواندنی موگناتیسی ، قسە کردن لەگەڵ نەخۆشەکانیدا بەراستەوخۆ ، دەستی کرد بە پرسیارکردن لەنەخۆش بۆ ئاشکراکردن و باسکردنی هەموو ختورەکانی دڵی ئەمەشی ناونا پێکەوەبەستنی ئازاد نێوان خۆی و نەخۆشەکان بە نەهێشتنی چاودێری دەروونی مرۆڤ لەسەر یادەووەری و یاساکان و بیر و باوەڕەکان ئەم رێگایە زۆر لەخەوی موگناتیسی کاریگەری تربوو ، داوای لەنەخۆشەکەی کرد ئەو خەوەی دوێنی شەو بینیوەتی بۆی بگێریتەوە کەڵکی لێووەرەگرت بۆچارەسەری کێشکەی ، ئەم تویژینەووەی پەرە پێدا و سەرەنجام کتێبێ "لێکدانەوەی خەوەکان"دانا لەسەری کە لەساڵی 1900 بڵاویکردەوە لەناوەندە زانستیەکاندا سەرکەوتنێکی زۆری بەدەستهێنا ، دواتر کتێبێ "زانستی دەروونزانی لەژیانی ڕۆژانە" نوسی دواتر شیکردنەوەی دەرونی مرۆڤ بوو بە قوتابخانەیەکی سایکۆلۆجی ئاشکرا .**

**فرۆید قوتابخانە سایکۆلۆجیەکەی لەسەر سێ پایە بنیاد نابوو ( سێکس و ماووەی تەمەنی منداڵی و کپکردن و دامرکاندنەوەی سێکس ) ئەمانەش کلیلە سایکۆلۆجیە فرۆیدیەکانن ، بەشێوەکی گشتی هەموو پاڵنەرەکانی ژیانی بە سێکسەوە بەستەوە ، بۆیە دەڵی:**

( منداڵ کاتێ پەنجەی دەمژێ ئەمە جۆرێک لە چێژ بردنی سێکسیە بەڵام بەدەم ، پیسیکردن و میزکردن لەلای منداڵ بەهەمان شیواز بە چێژێکی سێکسی دەبینێتەوە هەروەها دەڵێ جوڵە ڕێخراوەکانی دەستەکان و قاچەکانی منداڵان ئەمانە گوزراشتێکی سێکسی منداڵانەن )

لەلای فرۆید وەک بلێیت مرۆڤ بۆ چێژ و حەز دروستبووە ! دواتر دەڵێ" ڕێگری کردن لە پەیوەندی پێش زەواج دەبێتە هۆی نەبوونی چێژ لە زەواجدا " بەڵام ئەمە زانست ئەمرۆ پێچەوانەکەی سەڵماندووە !! ، هانی خەڵکی دەدا لە هەست نەکردنیان بە تاوان لەکاتی کردنی زینا و تاوانەکان و گوزراشت کردن لێی بەشتێکی سروشتی و دانان پێیدا بە هاندەرێکی سایکۆلۆجی و دەروونی (هاندەرێکی دەروونی هەیە بۆیە هاوڕەگەزبازە ! ) ، دواتر گەشت بە دەرەنجامێک بۆ ئەوەی وا لە خەڵکی بکات قبووڵی بیرۆکەکانی بکەن بۆیە دەڵێ :

( باوەرە دینیەکان گریمانە ، بەڵگە لەسەریان نیە ، بەشێکیان دوورن لەراستی و واقعی ژیانەوە ، لەلای من وەک وڕێنەیەکە )

فرۆید لای وایە کەسایەتی پێک هاتوە لەسێ میکانیزم ( ئەو"دژ ڕەگەز" ، من ، منی بڵند ) کەسایەتی هەرکەسێکیش رەنگدانەوەی ئەم سێ میکانیزمەیە واتا هەموو مرۆڤێک جوڵەکانی ژیانی بۆ چێژی خۆیەتی ، چێژیش بریتیە لە گەشتن بەڕەگەزی بەرامبەر ، بۆیە هەموو جوڵەکان دەگەڕێنەوە بۆ خاڵی سێکس ! دواتر دەڵێ کۆکاین کاریگەری ئیجابی هەیە لەسەر دەروون بۆیە یەکێ لە نەخۆشەکانی هەوڵیدا بەکۆکاین چارەسەربکات بەڵام مرد

فرۆید کتێبێکی هەیە بەناوی "هاورەگەزبازی" و " کتێبێ سەربکەوە بەسەر شەرمدا" ، ئەمانەش پەیامێکی شاراوەن بۆ تێکچوون و ڕووتکردنەوەی مێینە دووبارە لەژێر پەردەی پاڵنەر و هۆکارەکان !

دواتر کتێبی بەناوبانگی "سێکس لەلای فرۆید " بڵاوکردەوە و کتێبی "گریمانەکانی سێکس" دواتر کتێبی" مووسا و یەکتاپەرەستی" بڵاوکردەوە و کتێبی "زانین" دواتریش "رەوشت" ، سەدا شەستی کتێبەکانی تەرکیز دەخاتە سەر پاڵنەرە سێکسیەکان ئەم حەزە سێکسیانەش دەکاتە مەبدەئی بۆ شیکردنەوەی دەروونی و رەوشتی و تێگەشتن ، ئەوانیکەشی هێرش دەکاتە سەر مەبدەئە دینەکان بەڵام بەشێوازێکی ناراستەوخۆ ، لەسەر شێوازی کۆمەڵە شیکردنەوە و لێکدانەوە کە بێ ئاگایی و بێهۆشی عەقڵی مرۆڤ دەکاتە ئامانج ! ، کۆمپانیا جیهانیەکانی ئەمرۆش وەک " دیزنی" و "هۆڵیود" پشت بەم شێوازەی فرۆیدییە دەبەستن بۆ فریودانی خەڵکی بە داماڵینی بەها مرۆڤیەکان پیشاندانی وێنای زینا و پەیوەندیە سێکسیەکان بەهەموو شێوەو جۆرەکانیەوە بۆ بینەرانەکانیان وەک شتانێکی سروشتی و جوان و ئاسایی و ڕۆتینی و زەروری بۆ هەستەکانی مرۆڤ ! کۆمپانیاکانی ریکلام و فیسبوک و دامەزراوە جیهانی و هەتا ناوخۆیەکان لەسەر مەبدەئەکانی فرۆید هانی خەڵک دەدەن بۆ چێژ و بێ ئەخلاقی و خراپەکاری !

باوەڕەکانی فرۆید ئافرەت دەکاتە تابلۆیەک بۆ ئەوەی لەهەموو جێگایە وەک کاڵایەکی جوان و سەرنجراکێش مامەڵەی پێووە بکرێ بووە بە دانێک بۆ کۆمپانیاکان و سەرمایەداران ! کاتێکیش پێی دەلێیت تۆ "دانیت " دەڵێ ئازادی خۆمە ! ئازادیەک بۆ بوون بە کۆیلە !! دەبێ چ ئازادیەک بێت ...!

فرۆید لە بابەتەکانیدا ڕەچاوی کاریگەر دەروونی کۆمەڵگای نەکردووە لەسەر تاکەکان بەڵکو دەیبەستەوە سێکسەوە ! کتێبەکان و لێکدانەوەکان بیرۆکەکانی فرۆید بەشێوازیکی راستەوخۆ و ناراستەوخۆ و سەرەکی یارمەتیەکی زۆری شۆرشی گەورەی سێکسیدا لە سالآنی (1960-1980) لە ئەورووپا داوە بەهاوکاری دەزگاکانی ڕاگەیاندن و ئەو ڕۆژانامەی کە بابەتە بێ ئابرویەکانیان بڵاو دەکردەوە

و دەستەیەکی نهێنی لەنوسەرەکان ناسراون بە ئێرتیک لە میدیاکان ، لە ئێستادا نوسەرەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و میدیاکانی هاوشێوەی میدیا و نوسەرە ئەوروپیەکان چۆن بەهۆی بابەتەکانی ئافرەت و سێکس و جل و بەرگ لە ئەوروپا شۆرشی سێکسی سەری هەڵدا دەیانەوێ لێرەش بەهەمان شێوەی شۆرشێکی سێکسی دروست ببێت ! هاوشێوەی شۆرشی ئەوروپی ! بێگومان سوتەمەنی و خەڵۆزی ئەم شۆرشەش مۆدێل و گۆڕانیبێژ و ئافرەتە ! هەموو ئەم شۆرشانەش بنچەکەی دەگەڕێتەوە بیرۆکە تێکدەر و وێرانکەرەکانی فرۆید ! کە ئافرەت دەبێتە کاڵایە بێ نرخ و سوتەمەنی تێیدا !

ئەم بوارە سێکسیە ئابروبەرە تێکدەرانە لەئەوروپا شانازی پێوەدەکرێ بەناوی بواری ئەدەبی بێ ئابروویی کە کۆمەلە کەرەستەیەکی خەیاڵی و واقعی تیا بەکاردێت بۆ ڕاکێشانی سەرنجی سێکسی خوێنەرانی ئەم ئەدەبە بەشیوازی چیرۆک و شعر ...هتد

نەک تەنها شعر بەڵکو لەمرۆشدا بەئاشکرا بانگەشە بۆ سێکس دەکرێت لە فیلم و زنجیرە و گۆرانیەکان ئەمەش بووە هۆی شۆرشێکی جنسی و سێکسی لە ئەوروپاوە ئەگەر وانیە بۆچی زۆرینەی فیلمەکانی نێتفلێکس هاورەگەزبازێکی دەبێ تێیدابێت ! !

لەژێر پاساوی پاڵنەرە جەستەیەکان و ترسناکی کپرکردنی پاڵنەرە جەستەیەکان ! ئەمرۆش وا بە ئاشکرا دان دەنرێت بە هاورەگەزبازی نەک تەنها لە ئەوروپا وا لە ڕۆژهەڵاتی ناوەراستیش بەرەبەرە دەبینرێ ، وەک پاڵنەرێک بۆ ئازاد بوون و ئازادی مرۆڤ ، بۆیە ژن بەمانای فرۆید ئازاد کرا ! کرا بە کۆیلەی ویستەکان و حەزەکانی کۆمەڵیک زانا و یاسای ئیبلیسی بەڵام ئەم کۆیلە بوونە شێوازێکی مۆدیرن و موسەقەفانەیە ! کرا بە مۆدێل و گۆرانیبێژ و رێکلام بۆ جل و کاڵاکان پشاندەدرێت لە ڕاگەیاندنە ئیبلیسیەکەیان و گۆڤار و ریکلامەکانەوە پشاندەدرێت ! ئەگەر لەهەموو سیستەمەکانی دیکەدا ژن کۆیلە بێت ئەوا کۆیلەی یەک کەسە (وەلەو کۆیلەش نیە ئەم

**شێوازه) ، بەڵام ژن لە سیستمی فرۆیدا کۆیلەی هەموو پیاوێکە تەنانەت دایکایەتی و فیترەت و ئەخلاقە مرۆڤیەکان نابنە بەربەست !!**

**لێرەشەوە فرۆید بووەتە هەوڵی کەوتن و هەرەسهێنانی دین و رەوشت و فیترەتی پاکی مرۆڤ ئەدا ، ئەبینی ئەمرۆ دەیان ئافرەت بەزمانی خۆی شەر دەکات بۆ ئەوەی ببێتە کاڵایەک بۆ پشاندانی بەرهەمە رۆژئاوایەکان ! ، مۆدێل بوون بووە هۆکاری دەوڵەمەندی بەهۆی پشگیری دەسەڵاتیکی نوستیسم لە بیروکەکانی فرۆید کە ئیش دەکەن لەژێر ئەو ئەجێندایەدا ، هەروەها پێشکەشکار بوون بەهەمان شێواز بووە بەشانازی ئەمەش بەکار هێنانی ژنانە وەک داوێک بۆ گرتنی چاوی پیاو بەفێلی نوێ و مۆدێل ! تەنانەت ئەوانەشی حیجاب دەکەن دەبینی چەندین ستایل و نوێگەری بۆ دانراوە بۆ هەر پۆل و دەستەیک شێوازێکی نوێگەری هەیە! ئەمەش بە بەکار هێنانی بێ هۆشی کۆمەڵگا بۆ بەجێ گەیاندنی بیرۆکەکانی فرۆید ، داماڵینی جەستەیی و فیکری ئافرەتە بەهۆی رۆخاندنی پایەکانی رەوشت هەنگاو بەهەنگاو هەتا لەلایەن خەڵکیەوە قبووڵبکرێت ! هەرکەسیش بەرگری لە فیترەتی مرۆڤ بوونی بکات بە دواکەوتو و تیرۆ ..هتد دەناسرێت ... !!**

**لە سیەکانی سەدەی پێشوودا دوای بلاوەبوونی ئەم ڕووداوانە ، دواتر هێزی نازیەکان سەریهەڵدا وەک هێزیکی داپڵۆسێنەر فەرمانی دا هەموو بیرکردنەوەکان و گریمانەکانی ئەم بابەتانەی فرۆیدە دابخری و فەرمانی دا بە زیندانی هەرکەسی هانی خەڵکی بات بۆ بێ رەوشتی ! ، بۆیە بیرۆکەکانی فرۆید بەسەر نازیەکان زاڵ نەبوو و یەکانگیر نابووەوە چون ئەوان ترسناکی ئەو جۆرە بیرۆکانەی فرۆیدیزم دەزانی ! نەک هەرئەوە فەرمانی لەسێدارەدانی بۆ دەرچوو گەر لەناو خاکی ئەڵمانیدابایە بۆیە کۆتا قۆناغی ژیانی لە لەندەن بەسەر برد ، فرۆید بوو دەیویست بیشارێتەوە بەڵام (larynx)توشی سەرەتانی قورگ(**

**سوودی نەبوو بەپێی گێرانەوەکان زۆرجار هەوڵی خۆکوشتنی ! داوە بەهۆی ئەو دیلوژن و خەمۆکیەی هەیبووە .**

**ئەو نێرەی بانگەشەی ئەوەی کرد یەکێکە لە باشترین زاناکانی دەرونزانی مێژوو ، لەخۆی و جەستەی خۆی تێناگەشت و جەستەی خۆی بەشێوازیکی سروشتی قبووڵی خۆی ناکرد ! هەر لەبەر ئەمەش هەوڵی خۆکوشتنی داوە و بۆکۆتایی هێنان بە ژیانی خۆی کاتێک ئەم هەواڵانە بڵاو بووەوە زەڕبەیەکی گەورەی دا لەوەی ئایا بەراستی گریمانەو بۆچونەکانی لەسەر حەز و رەغبەی مرۆڤ بەجدی مرۆڤ بەرەو دڵ خۆشی دەبەن یان مردن ! خەڵکی بە لەناوبەری نەخۆشی دەرونیەکایان دەزانی بەڵام وا لەتاو دەروونیدا خۆی دەکوژێ و توشی خەمۆکی و دیلوژن دەبێت ! لەساڵی 1939 دا لەتەمەنی 83 ساڵیدا مرۆڤایەتی ڕزگاری لەیەکێک لە پیسترین مرۆڤەکان بوو ! ، بەشێک لە لێکدانەوە زانستیەکانی ئەمرۆ بەتەواوی بیرۆکەکان و تێڕوانیەکانی فرۆید بۆ سێکس رەتدەکەنەوە پێیان وایە راستیەکان پێچەوانەی ئەوانن بەتەواوەتی لەگەڵ ئەوەی کە زۆرینەی بیروکەکانی ڕەتکراوەیە بەڵام لەناو ناوەندەکانی خوێندن و زانکۆکان کراوە بە منهاجی خوێندن و شانازی پێووە دەکرێت ! شانازی بەکەسێکەوە دەکرێت هەوڵی تێکدانی نەک شارستانیەتی ئیسلامی بەڵکو مرۆڤایەتی داوە !! فرۆید مردووە بەڵام ئەمرۆ وا بیرۆکەکانی لەناو راگەیاندن و حکومەتەکانەوە کاری پێدەکرێ بۆ هەڵگیرسانی شۆرشێکی سێکسی !!**

**تۆدەزانی بوونی نێر و مێ لەناوەندەکانی خوێندن و زانکۆکان و شوێنەکانی دیکە پێکەوە لەسەر ئەساسی باوەرەکانی فرۆیدە ؟**
**باوەرەکانی فرۆید ئەمرۆ حکومەتەکان کاری لەسەر دەکەن بۆ ئەوەی زیاتر گەلان نغروی حەزەکان بکەن خۆ دەشزانن ئەم تێکەڵ بوونە دەبێتە پاڵنەری سێکسی بۆ هەردوولا بۆ زیادبوونی رەغبەتی سێکسی و چالاک بوونی بەشی سێکسی مرۆڤ ! لەسەر حسابی بەشی**

**بیرکردنەوە  بەڵام هەر دەسەڵاتی نوستیسم جێبەجێی دەکات چ بە خوێندن و ج بەجل و بەرگ و هەتا کۆتا هەوڵیان...!!**

**لەولاشەوە یەکێ دێ و دەڵێ ئیسلام بیری لای سێکسە ! کەسێک ئەو راپۆرتەی خوێندبێتەوە دەزانی کێیە بیری لای سێکسە ، توتیە فێمێنیزمەکان وەک توتی فێرکراون ئەوە بلێین پێیان دەوتری ئەگینا بیربکەنەوە دەزانن ! بەڵام کێشەی خەڵکی شوێن کەوتنی دڵ و وەلا نانی مێشکە !**

# ١١ _ كۆیلایەتی بەتامی ئازادی

کۆیلایەتی بریتیە لە ئازادی !

ئەم ڕستەیە یەکێکە لەدیارترین درووشمەکان کە دیکتاتۆریەت بەکاریهێناوە بۆ رازندنەوە کرداری کۆیلایەتی و فرۆشتنەوەی بەتامی ئازادی ! هەروەک لە گێرانەوە بەناوبانگەکەی "جۆرج ئۆروێل " لەساڵی1984 دیارە، باس لە هەوڵێکی ئەو دیکتاتۆرانە بۆ یاریکردن و گۆرینی دەستەواژە و وشەکان ، قەناعەت پێکردنی گەل بە دەستەواژە پێچەوانەکان واتا ڕازاندنەوە و جوانکردنی کۆیلایەتی ! دوورینی بەرگێکی ئازادی بۆی ..! ، بەڵام ئایا بەکۆیلەکردن ڕازی کردنی مرۆڤ بۆ کۆمەڵە سنور و ژیانێک پێویستی بە دەسەڵاتێکی دیکتاتۆر و زۆردار یان بەمانایەکی دیکە کردنی خەڵکی بەکۆیلە پێویستی بە یاری کردن و ڕازاندنەوە دەستەواژەکان هەیە ؟ بۆئەوەی خەڵکی قەناعەت بکات کە ئەوشێوازە کۆیلایەتیە بریتیە لە ئازادی ! یان کردنی خەڵکی بەکۆیلە و ژێر دەستەیی زۆر لەوە ئاسانتر هەتا ئەوکارانە بۆ ئەنجام بدرێت ! ، ئایا ئازادی کێشەبووە بۆ هەموو سەردەمەکان ؟

ئایا خەڵکی پێش هاتنی چەرخی مۆدێرن ئازاد نەبوون ؟

بۆئەوەی چەرخی مۆدێرن پێیان بڵی ئاوهابن هەتا ئازادبن ! شێوازی ژیانتان دەبێ وابێت هەتا کۆیلە نەبن !

کێ تۆی فێری پێناسی کۆیلایەتی و ئازادی کردووە ؟

دروستکردنی دەستەواژەی ئازادی !

زانای کۆمەڵناسی ناسراو "زیگمۆند باومان " پێمان دەڵێت :
(بەراستی ئازادی تاکەکەسی هەموو مرۆڤێک نابێ هەرەمەکی و بێ سنور بێت ، ئازادی دروستەبێ و لەناودەچێ لە کۆمەڵگایەیکی تایبەتدا ، کاتێک دەڵێ ئازادم کۆمەڵێ باوەر پاڵنت دەنێ بۆیە مانای

دەستەواژەی ئازادی لەبارێکی کۆمەڵایەتی و مێژوویەوە دروستەبێت نەک لەخۆوە وەنەبێ چۆن ئەم مرۆڤە خۆی دروست بووە ؟ )

هەروەک زانای ئۆنسرۆپۆلۆجی "دێیڤد گرێبەر" پێمان دەڵێ: ( سەرەتاکانی گفتۆکردنی فەیلەسوفەکان لەسەر "مافە سروشتیەکانی مرۆڤ" کە ئەم مافانە دامەزرێنەری بیرە لیبراڵیەکان و چەمکە ئازادیکەکانن ، دروشمی لیبرایەت و ئازادیخوازنیش لەسەرەتاوە بریتیبوو لە : مرۆڤی مافی ئازادی خاوەندارێتی هەیە بۆ فڵان شت )

وشەی "خاوەندارێتی" دەستەواژەیەکی بێزارکەرە ئایا مانای ئەوەنیە ئەوە ئازادی خۆمە و ویستی خۆمە ئازادی کەسێکی دیکە بیکڕم یان بیفرۆشم ویان پێشکەشی کەسێکی دیکەی بکەم بیەوێ ؟ !

"دێڤد گرێڤەر" دەڵێ: (لەرووی مێژوییەوە ئەوانەی بەرگری لە بیرۆکەی ( ئێمە بەشێوازێکی سروشتی خاوەنی ئازادی و مافەکانی خۆمانین) دەکەن زۆر گرنگیان بەوەدەدا کەدەبێ ئازادبن لەوەی کۆیلەکان بیانفرۆشین یان لەناویان بەین )

ئازادی لەکۆندا خەڵکی بەوە لێی تێگەشتبوو کە ئازادین لە کرینی کۆیلە و فرۆشتنیدا ! هەرکەس بلێت نابی بیفرۆشن و بیکرن ئازادی تاکەکەسی پێشێل کردووە ! هەر ئەو سیستەمەی ئازادی لەکۆندا پێناسە کردبوو ئەمرۆش بەشێوازێکی دیکە پێناسی دەکاتەوە لەبەرژەوەندی خۆی ! لەگەڵ ئەوەشدا کۆیلایەتی لەکۆن و نوێیدا دەرازاندەوە بە تامی ئازادی !

هەروەها "جێن جێرسۆن" سەرۆکی زانکۆی پاریس لەوتەیکدا لەساڵی 1400زاینیدا دەڵێت : ( ئازادی موڵکی مرۆڤە وەک هەر

موڵکێکی دیکە بۆیە بەهیچ شێوەیە کێشە و خراپە نیە کەسێک ئەم ئازادیەی خۆی بفرۆشێتە یەکێکی دیکە یان کەسێک ئازادی کەسێکی تر بکڕێت )

بۆیە ئەم شێوازە لە بیرکردنەوە و بۆچونانە لەسەر چەمکی ئازادی و مافە تاکەکەسیەکان بەزووی گەشەی کرد لە شارەکانی "ئەنتۆر و لیشبوونا " ، شارانێک دەکەوێتە ناوەندی بازرگانی کۆیلەیی جیهانیەوە ! ، بەهەمان شێوە "تۆماس هۆبس" بەهەمان پاساوی لیبراڵی بۆ بەکۆیلەکردنی خەڵک باسی چەمکی ئازادی و لۆژیکی مافی تاکەکەس دەکات و دەڵی :

(سەرکوتکردنی هاوڵاتیان لەلایەن دەوڵەتەوە و مامەڵەی دەسەڵاتداران لەگەڵ هاونیشتمانان بەشێوازێکی کۆیلە ئاسا بەپاساوی ئەوەی کە ئەم کۆیلە بوونە لەسەردەمێکی کۆنەوە ڕوویداوە و لەوکاتە خەڵکی دەسبەرداری هەندێک ئازادی خۆیان بوونە بۆ خاوەنی دەسەڵات و هێز )

ئێستا هێز و سنورەکانێ ئەو دەسەڵاتە بووە بەواقع ئەوان بوون بەکەسانی ئازادی ئەوەیان پێدراوە لەلایەن خەڵکیەوە کە یاسا بنوسنەوە و بۆیان دابنێین ! بوون بە خاوەن خاک و سامان و ئازادی خەڵکی ! هەموو ئەمانەش دەگەڕێتەوە بۆ تەنازوولی خەڵک لە ئازادی خۆی بۆ کۆمەڵێک کەس لە سەردەمێکی دیارکراودا ! بۆچەن سەدەیەک ئەم پاساوە هۆکارێکی سەرەکی بوو بۆ دروستکردنی کرێکار و نۆکەر و خزمەتکار بۆ کەسانی خانەدان و خاوەن هێز بەپاساوی وازهێنانی کۆیلە و خزمەتکار لەهەندێک ئازادی خۆی بۆ گەورەکەی بە ڕێکەوتێکی سەربەخۆ و بێ هیچ زۆرلێکردنێک ! ڕێکەوتنی کۆیلایەتی لەبەرامبەر پێدانی ژیاندا !

هەروەک "کارڵ مارکس" دەڵی: (بەڵێنامەی مرۆڤ بۆ خزمەتکردن و نۆکەری کردن لە سیفاتەکانی کەسیکی ئازاد نەبوو ، ئەو کاتەی کە خزمەتکارەکە ئازاد دەبوو لەدەستی خاوەن ئیشەکەی ، ڕاستەوخۆ هیوای دەخواستەوە دووبارە ببێتەوە خزمەتکار و کۆیلەی یەکێکی دیکە چونکە برسی دەبوو و پێویستی بە ژیان بوو !)

لەساڵی 1863 دا ڕۆژنامەی مۆرن ستار بابەتێکی بڵاوکردەوە دەڵی : ( کۆیلە سپیەکانمان بەهۆی زۆر کارکردنیانەوە و ئازاراوە دەمرن ! زۆرجار دەپوکێنەوە و دەمرن بەبێ دەنگە دەنگ ، مەبەستی کۆیلە سپیەکان خزمەتکارە ئازادەکان بوو ئەوانەی بۆ لەتێک نان دەبوونە خزمەتکارە دواتر دەڵێ زۆرێک لە ئێمە ئیشمان بە کچە گەنجەکان دەکرد هەتا مردن ، قامچی برسێتیمان بەکار دەهێنا لەجیاتی قامچیە ڕاستیەکە ! بۆ زۆرلێکردنیان ، ئێمە مافی ئەوەمان نیە کە بەئاگر و ئاسن خاوەندارێتی و خزمەتکاری بە ئەو جۆرە خێزانانە بکەین کە بەکۆیلەی لەدایک بوونە و لەچینی خزمەتکارانن لەم شێوازە کۆیلە بوونە خێزانیەدا بەباشی خواردنیان پێ دەدەین و کاری زۆر قورسیان پێناکەین ! )

وادیارە مەسەلەکە پێویستی بە گۆڕینی وشەکان نیە هەتا دیکتاتۆرێک وشەی کۆیلایەتی برازێنێتەوە ! بەڵکو واقع خەڵکی پاڵ دەنێت بۆ کۆیلایەتی ! لەتێک نان ! بۆیە دەستەواژەی کۆیلایەتی ئازادیە خەڵکی بۆخۆی بەکاری دەهێنیت لەوانەیە لەهەموو وردەکاریەکانی ژیان ئەم ڕازاندنەوە بەرچاوبکەوێ بەبێ ئەوەی بەواقعی خەڵکی بلێ ئێمە دەستەواژەکانمان گۆڕیووە !

بۆیە "جۆرج زێمڵ" پێمان دەڵی ( ئازادی تاکەکەسی کاتێ بەرهەم دێ کەکەسەکە دژکاری واقعی ژیانی خۆی بێت و قبووڵی نەبێت ! کاتێک کە مجازفە بە ژیانی خۆیەوە دەکات و لەواقعی ژیانی لادا بۆ دروستکردنی ئەو شێوازە ئازادیەی خۆی دەیەوێ بەڵام ناتوانی

**بەشێوەیەکی هەمیشەیی لادەر بیت لەکۆمەڵگا ئیلا دەبێ کۆمەڵێکی زۆر هەبن لەکۆمەڵگا وەک ئەو لادەر بن و وەک ئەو بیرکەنەوە بۆ ئەوەی ئەو شێوازە ئازادانە فەراهەمکەن خۆیان باوەڕیان پێیەتی دەبێ ئەو کەسانە دڵ خۆش و کەیف خۆشبن لەناخیان و دەرەوەیان بەو لادانە لەشێوازی ژیانی ئەو کۆمەڵگایە )**

**بەڵام زۆرجار ئەم مەرجی هەبوونی کۆمەڵە کەسێکی هاوشێوە نایەتە بوون لە کۆمەڵگاکان ، و ئەوهێز و دەسەڵاتدارانەی کە هێز و باری مرۆڤ دیاری دەکەن لە پرەنسیڤ و مەبدەئـ و بیرکردنەوەدا لەگەڵ بیرکردنەوەی تاک بەتاکی کۆمەڵگا یەکسان نین چ بەچەندێتی و چۆنیەتی ، بۆیە ئەو جۆرە ئازادیەی ئەم حکومەتانە دروستی ئەکات کۆمەڵە مرۆڤێک ئیستغلالی ئازادیەکە دەکات لەسەر حسابی کۆمەڵێکی زۆر لەخەڵک ، ئیستغلالی ئازادیەکەش بە ئیستغلاکردنی لاواز و گەمژەکانە لەلایەن زیرەک و بەهێزەکانەوە و ئیستغلالی ترسنۆک لەلایەن بوێرەکانەوە .**

**سەرەنجام واقعێکی نەگۆر دڕوستەبێت کە خەڵکی پێی وایە نەگۆرە بۆیە دەڵێن دەبێ لەو چوارچێوەدا بیرێک لەگۆران کاری بکەینەوە... !!**

**■ئازادی لەکۆندا بەها و نرخ و شێوازەکەی زۆر جیاوازتر بوو لەشێوەکەی ئێستەی ، چونکە کۆن ئازادی ئاماژەو بۆ گەورەیەکی ئازاد و دەسەڵاتی بەسەر کۆیلەکانی ، هەروەها لەچاخەکانی ناوڕاستیش ئازادی ئاماژەبوو بۆ هێز و بەدەستهێنانی لە بەربەرەکانێی خانەدان و بەگزادەکان و پاشاکان بۆیە دەستەواژەی خانەدان بوو بە پێناسی ئازادی ، لە کۆتایدا سەردەمی نوێی سەرمایەداری هات ئازادیەکان لە ئازادی مەبدەئـی کۆمەڵگاکانەوە گۆڕی بۆ ئازادی تاکەکەسی ، ئازادیەکی تاک کەسی لە جوڵەکردن و سەفەرکردن و کۆچکردن و رێکەوتن ! کێ پارەی زیاتر هەبێت زیاتر جوڵەدەکات سەفەر دەکات ! ئازادی سەرمایەدارانە ! واتا چینانیەتی کۆمەڵگا زەق و قوڵدەکاتەوە هەریەکەیان لەکۆمەڵێک چوارچێوەدا دەهێلیتەوە دواتریش ماف دەداتە**

**هەندێک ئازادی هەندێک کەسی دیکە بکڕن و قۆرخی بکەن بەهۆی پاساوی هەبوونی کاغەزێک !**

**هەروەک "فریدریک ئێنگلیز" دەڵی ( لەگەڵ دەرکەوتی شارەکاندا دەبوو ویستی ئازادی وردە وردە دروست ببێت کە ئازادیش مەرجێکە بۆ بوونی سەرمایەداری )**

**ئازادیەکەی مرۆڤی ئازادی خواز !**

**چەمکی کۆیلایەتی زۆر گۆرانکاری بەسەردا نەهاتووە لەنێوان سەردەمی پیشەسازی (1760) و سەردەمی پێشکەوتوی ئێستا ! کە مرۆڤەکانی ئەم سەردەمە لەهەموو لایەکەوە دەڵێن ئازادی ئازادی ! بەڵکو هەموو ئەو ئازادیەی کۆیلە سپی پێستەکەی ئەمرۆ بەدەستی هێناوە بەشداری کردنی خۆ ویستانەی خۆیانە بۆ دانانی کۆمەڵە سنورێک بۆ چاودێریکردنی خۆیان ئەمەش لەبەر ئەوەی نابێ هیچ شتێ ببێتە بەربەست و مەترسی بۆ ئازادی !!**

**هەروەک "زێگمۆن باوماند" دەڵێ ( هەرچەن خواستی ئازادی زیاد بکات ، ئەوەندەش داواکاری بۆ ئاسایش لەپێناو جێ بەجێ بوونی ئازادیدا زیاتر دەبێت ، هەرچەن ئازادی تاکەکەسی زیاد بکات لەبەرامبەردا ناسنامە کۆمەڵایەتیەکان کە لەکۆندا لەنێو کومەڵگا هەبوون کەم دەکاتەوە ، واتا هەرچەن تاکەکانی کۆمەڵگا تەرکیزیان لەسەر ئازادی تاکەکەسیان بێت ، ئازادی گشتیان کەم دەبێتەوە ! )**

**هەروەک مێشێل فۆکۆ دەڵی (دەتوانین بڵێین تەرکیزی ليبراڵییەت هەمووکات ژیانە لە ترسی لەدەستدانی ئازادی ! )**

واتا هەموو کات تاکەکان لە بارێکی ترس و دڵەڕاوکێن ، یان تاکەکان دەخرێنە بارێکی ترسناکەوە لەلایەن سەرانی لیبرالیەتەوە یان بەمانایەکی دیکە ژیان و حاڵ و ئێستا و داهاتویان مەرجدارەکەن بە ئازادی بەپاساوی ئەوەی هەموو لەمەترسیدایە واتا ئەو ژیانە هەتانە لەسەرچاوەی ئازادیەوە دروست بووە بۆیە کۆت و بەند دابنێین بۆ ئازادی تاوەکو ئازادیەکەمان لەناو نەچێت ! هەتا ژیانتان و داهاتوتان نەفەوتێت ! ، ئەم پاساوی ترساندنە بە مەترسی و نائارامی ژیانە یەکێکە لە تایبەت مەندیە گەورەکانی لیبراڵیەت ! لەهەموو جێیەک ئەم وروژاندنە بەترسە هەیە بەشێوازێک بووە کە ترس لە لەدەستدانی ئازادی بووە مەرجێک بۆ پەیوەندیە دەروونیەکان و ڕۆشنبیریەتە ناوخۆیەکانی تاکی لیبرالیەت بۆیە بەبێ میکانیزمی ترس و تۆقاندن لیبرالیەت بوونی نیە ئەنجامی ئەم لیبرالیەتەش کشانێکی زۆرە لە چاودرێری کردن و پشکنین و زاڵبوونە بەهێز و کۆت ئەمەش ڕووی دووەمی ئازادیە وەک دەرەنجامێکی سروشتیش بۆ ئەمە ئازادی بووە بە کاڵایەکی بەکار هێنراو دەتوانرێت بکڕدرێت بەپارە !

یان وەک زێگمۆن باوماند دەڵێ ( ئەگەڕ ئازادی مانای ئەوەبێ هەرشتێکت حەزت لێ بوو و ئامانجت بوو حەڵاڵی بکەیت و بیکەیت ، ئەوا نموونەی سیستەمی بەکارهێنراوی مۆدێری ئەمرۆ ئەو ئازادیە ڕەت دەکاتەوە چون لەژیانی مرۆڤ ئازادیەک بۆ گشتی فەراهەم دەکات ، بەڵام جێبەجێی دەکات بە شێوازیکی زۆرینە و هەڵبژاردن نەک ئازادی تەواوی ! )

یان وەکو بیرمەند نۆمچۆمسکی دەڵی ( لەسەردەمی سەرمایەداریدا ئازادی بووە بە کاڵا هەتا دەوڵەمندتر بیت زیاترت هەیە لە ئازادی ! )

چۆن فێلیان لێت کردووە ؟

گەر بێتو ئازادی تەنها وشەیەکی دیکەیەی رازوەبێ چی ؟ ، گەر بێتو پاساوێکی ئایدۆلۆجی بێت بۆ کۆمەڵێ بیر و لایەن چی ؟ بەڵکو سنورەکانی پاراستنی ئازادی ویستی کۆمەڵێک مرۆڤی زاڵ و سەرکەوتوە بەسەر کۆمەڵێ کەسی لاواز لەحاڵەتی دیارکراودا نەزیاد و نەکەم وەنەبێ چۆن مرۆڤ گەشت بەوەی قەناعەت بەوەبکات بەتەواوی ئازادە ؟؟ لەکاتێکدا خاوەنی کۆمەڵێ ئایدیایە !

دێڤت هارڤی زانای کۆمەڵناس وڵامان دەداتەوە و دەڵێ ( بۆ ئەوەی باوەڕێکی ئایدۆلۆژی زاڵ ببێت بەسەر گەلێکدا دەبێ ئالیەتێکی تێگەشتن دروستت بکرێت نێوان ئەو گەل و ئایدۆلۆژیای حوکمدار کە ئەو ئالیەتە تێگەشتنە قبووڵکراو و ڕێگەپێدراو بێ لەلایەن فیترەتی مرۆڤەوە ، گونجاوبێت لەگەڵ بەهاکان و حەزەکانمان هەروەها ، هەروەها دەبێ ئەو ئالیەتە یەکانگیر بێت لەگەڵ وزەو توانا ناوەکیەکانی کۆمەڵگا ، گەر سەرکەوتوبوو ئەم ئالیەتە دەبێتە بڵێسەیەک بۆ فیترەتە پاک و نەشێواوەکەمان ! ئەوکات دانی پێدا دەنرێت بە شێوازێکی گفتوگۆ ! وە ڕووبەرووی هیچ ترسێکی واقعی نابێتەوە ، هەربۆیەش دانەرانی فیکری نیولیبرالی هەڵوێستی سیاسیان داهێنا بۆ پاراستنی شکۆی مرۆڤ و ئازادی و ئایدیا جیاوازەکان وەک ئەوەی هەڵوێستی سیاسی ببێتە نموونەی بەها و بنچەیەی بۆ ناوەندی شارستانیەتی مۆدێرن ، لەم ڕووە ڕاستیان کردووە چون ئەم شێوازە هەموو لایەک قەناعەت پێکات کە قبووڵی بکەن ! )

چی وای لەئێمە کردووە وابزانین ئەو شێوازە سیاسەتە لە قبووڵکردنی یەکتر راستیەکی مەنتیقی و تەواوە و دەبوو مرۆڤایەتی لە سەرەتاوە شوێنی بکەوتنایە؟!

ئێمەی خەڵکی ئەم سەردەمە هاتوین پێیان بڵێین ئێوە هەڵەبوون لە ملیملانێ و جەنگەکانتان ! دەبوو سیاسەتان کردبا !

ڕۆژنامەی "هاڤینگ تۆم پۆست" زۆڕ زیاتر باس دەکات بابەتێکی هێناوە و لەسەر باسەکەیدا دەڵێ (هەموو مناڵبازێک توشی نەخۆشی دەروونی نەهاتووە )

درێژەی بابەتەکە دەڵێ ئەکرێ حەزی مناڵبازی لەکەسێکی ئاسایی توش نەبوو بەنەخۆشی دەروونی دروست ببێت ئەمەش ئاماژەیە بۆ سرینەوەی مناڵبازی لەنەخۆشی دەروونی و گۆرینی بۆ کارێکی سروشتی و ئاسایی کە مرۆڤ ئەنجامی دەدات !!

هەروەها "ستێڤن کرێشنەر" مامۆستای فەلسەفە لەزانکۆی نیۆرۆک کتێبیکی هەیە بەناونیشانی( مناڵبازی و منداڵان) لەو کتێبەدا بەشێکی تایبەتی جیاکردووەتەوە بەناونیشانی ( تەحلیلیکی فەلسەفی بۆ بیدۆفێلیا )کە تێیدا بەرگری لەئەو کەسانە دەکات بەکەسانێکی سروشتیان لەقەڵەم دەدا رەتی دەکاتەوە نەخۆشی دەروونی بن

تاکو ئێرە بەرگیریەکی هەرەمەکیە لەم لا و لەولاوە بەبێ هیچ کۆدەنگیەکی ئاشکرا

بەڵام یەکێک لەنوسەرە مناڵبازەکان بەناوی (ئێندر وێگن) .. وتارێکی بڵاوکردووتەوە لەسەر تۆرەکەی بەناویشانی

(بەڵی قبووڵ دەکرێین .. قبووڵی منداڵبازی دەکرێت لەلایەن کۆمەڵگاوە هەر بەزۆرداری )

لەو وتارە باسی ئەو وتارە پۆزەتیفانە دەکات کە لەسەر بیدۆفێلیا بلاوکراونتەوە ..دەڵێ

ساڵی 2010 تەنها یەک وتاری پۆزەتیف لەسەر منداڵبازی بڵاوکراوەتەوە

بەڵام ساڵی 2012 بوو بە 7وتاری پۆزەتیف

**ساڵی 2015 بوو بە 15وتار**

**ساڵی 2016 بوو بە 63 وتار**

**ئەم هەموو وتارە پۆزەتیڤانە لەسەر بێدۆفیلیا نوسەری منداڵبازەکە دەیگەرێنیتەوە بو هەوڵ و کۆششی رێخراوە منداڵبازەکان...**

**رێخراوە منداڵبازەکان لەسەر تاسەری جیهان لەلایەن حکومەتە عەلمانیەکانەوە پشگیری لێدەکرێت عەلمانیەتیش چەکی سیستەمی نوێی جیهانیە کە رێخۆشکەری تەواوەتی دەکات بۆ هاتنی دەجال ...چون دەجال پێویستی بە تێکچوونی ئەخلاقی و فیتری و مرۆڤایەتی هەیە تاکو وەک ئاژەڵێک شوێنی حەزەکانیان بکەون ...!**

**چل ساڵ پێش ئێستا هیچ رێکخراوێک نەبوو بەناوی منداڵبازی بەدیاریکراوی لەهەشتاکانی رابردوودا نزیکە چل رێخراوی منداڵبازی داخراون لە وڵاتانی (نەرویج و دانیمارک و ئیتاڵیا و ئوستراليا ..هتد) لەخودی ئەوروپاش تەنانەت دەسگیر دەکران و وەک تاوان و جەریمە دەبینرا بەڵام وا ئەمرۆ بەئاشکرا لە رۆژنامەکان دەرەکەون دێنە سەر ستەیج و گۆڤارەکان و بەئاشکرا ئیعلانی مناڵبازی خۆیان دەکەن باشە بۆچی ...!!!**

**"ئێدوار برۆ گرێسما" مامۆستای قانونی هۆڵندی کە نوسەرێکی مناڵبازە و لەبەر مناڵبازی دەسگیرکرابوو پێشتر**

**لێکۆلینەوەیەکی بڵاوکراوەتەوە بەئاشکرا بەناوی( خۆشەویستی منداڵان و لێکۆڵینەوەیک لەسەریان )**

ئێستاش لات وایە شتەکان ئاسایین پرۆژەکە دەجالی نییە !!؟

ئێمە ئێستا لە قۆناغی کۆتاییداین دوای ئەوەی فکرەکە بڵاوکراوەتەوە دواتر جێبەجێکردنی ئەم حەزە جنسیە پاشان لەروی یاسایەوە دەیشەرعێنن بەپاساوی لێکۆڵینەوەی زانستی کە گوایە هۆیەکی جینی بایلوجی هەیە لەو کەسانە

هەربۆیە جوڵانەوە مناڵبازەکان هەوڵ بۆ سێ خاڵی سەرەکی ئەدەن بەکورتی ئەیلێم ..

یەکەم : سرینەوەی تەمەنی پەیوەندی جنسی لەیاساکانی خۆیان کەلەتەمەنێکی دیاریکراودا دەتوانن جنس بکەن لەگەڵیان

دووەم: سرینەوە ئەو بۆچونەی ئەڵێ بیدوفیلیا ناتەواوی دەروونیە بەڵکو هۆکاری بایلۆجی بکرێتە پاساوی تاکو وابینرێت لائیرادیە و کەسەکە بەدەست خۆی نییە حەزی لەمنداڵە

سێیەم : رەمەزاندنی منداڵەکە لەسەر پەیوەندیەکە ببێتە مەرجێک و پێویستی بەکەسی تر نەبێ بۆ دروستکردن ئەم پەیوەندیە ..

لەپێناو چەسپاندن ئەم خاڵانەدا چەندین ملیۆن دۆلار و چەندین رێخراو دەخرێنە کارەوە لەلایەن سیستەمی نوێی جیهانیەوە تاکو بەتەواوی ئەمانە بەدەست بهێنرێت

هەروەها چەندین ملیۆن دۆلار  سەرف دەکرێ بۆ دروستکردنی توێژینەوە و  پاساوی علمی بۆ بیدۆفیلیا هەروەها چەندین رێخراو و سایتی جیهانی دروست کراون بۆ پاڵپشتی لەکەسانی مناڵباز لەجیهاندا

بۆی لێنگس ، بۆی ویکی ، سپیک ئاوت فۆ ، IBCEلەو سایتانەش ( بۆیس )

لەسەروی هەمووشیانەوە رێخراوی منالّبازی و هاورەگەزبازی دێت کە گەورەترین رێخراوی بەرگری کاری منالّبازیە NAMBALA لەدوونیادا

لێرەووە دەزانین کە مەترسی بیدۆفیلیا بووە بە شتێکی جدی و و واقعی و لەدەرگای مرۆڤایەتیدا وەستاوە چاوەرێی لایەنێکە دەرگای بۆ بکاتەوە ! بەدووریشی نازانین کۆشکی سپی دەرگای لێبکاتەوە و ئاهەنگی زەواجێکی نوێ بگێرن ئەویش زەواجی منالّبازیە ! هەروەک چۆن بۆ هاورەگەزبازیش ئاهەنگیان گێرا

ئەمە ئەو جیهانە دەجالیە کە منالّبازی کردووە بە حەزێکی جنسی سروشتی چونکە لەنێوان ئاژەڵەکاندا ڕوودەدات و بەدووریشی نازانین منالّبازەکان مەیمونی "بابۆن" نەکەن بەپاوساوێک بۆ ئەم کردارە دزێوەیان کە نزیکترین جینی هەیە لەمرۆڤەوە بەپێی بیردۆزی پەرەسەندن لەکاتێکدا کە فرەژنی جگە لەروی زانستیەوە سەلمێنراوە بەسوودە لەلایەنی کۆمەڵایەتیشەوە قبووڵکراوە بەڵام ئەبینی هیچ پشگیریەکی بکرێت ..!؟ بەڵکو بەیاسا دژایەتیشی دەکەن قەدەغەی دەکەن ..! خۆ ئاژەڵەکانیش فرەژنی دەکەن ئەدی بۆچی لەمەدا چاو لێکەری ئەوان نابن !! وڵامەکەی روونە لەلای کەسی تێگەشتوو لە علمانیەت و سیستەمی نوێی جیهانی .. بەڵی هەمووشتی بۆ مرۆڤ حەڵاڵە کاتێک کە وەک ئاژەڵێک سەیر دەکرێت چونکە مرۆڤ لە زنجیرەیەکی پەرەسندەوە دروست بووە لەلایان نە فیترەت بوونی هەیە نە پێوەر و نە قەدەغەکراو و نە ئەخلاق بەڵکو ئاژەڵێکە و سور دەخوات بەدەوری حەزە ئاژەڵیەکانیدا ...

# ١٥ _ دینی پاش علمانیەت

لە یەکی ئۆکتۆبەری ساڵی2018 ناوەندی "بیۆ" ئەمریکی تایبەت بە لێکۆڵینەوە فکریەکان بابەتیکی بڵاوکردەوە بەناوی دینی"حركة العصر الجديد پەرەدەستێنی لەنێوان دیندار و بێدینەکاندا"...

لێکۆڵینەوەکە ئەوەی ئاشکراکرد کە بەلایەنی کەمەوە62% ئەمریکیەکان باوەڕیان بەیەکێک لە مەبدەئەکانی ئەم جوڵانەوە نوێیە هەیە

بۆیە مەوسوعەی بەریتانیا دەڵێ جوڵانەوەی سەردەمی نوێ "حركة العصر الجديد" بووە بەیەکێک لە دیاردەکان لەنێو تاکی ڕۆژئاواییدا

ئەم جوڵانەوە چییە و چۆن گەیشتە ئەوروپا و دواتریش چۆن گەیشت بە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست...؟

پاش کۆتایی هاتنی دین دواتریش علمانیەت...

لە حەفتاکانی سەدەی پیشوو ئینسانی ڕۆژئاوایی لە جەنگیکی دەروونی بوو لەگەڵ هەبوونی خۆیدا دوای ڕوخانی مەنزوومەی دینی مەسیحی بەڕامبەر بە ڕۆشنگەریەکان و زانستگەراکان و مایەپوچی مەسیحیەتی گۆڕاو لەبەرامبەر زانستدا وە پاش لەدەستدانی متمانە بە علمانیەت..ئینسانی ڕۆژئاوایی بەسەرکەشی و سەرلێشێواوی خۆی بینیەوە لە ژیاندا بەبێ دینێک مایەوە متمانەی پێبکات و دوور کەوتەوە لە علمانیەت چون لایەنی ڕۆحی تێر نەدەکرد چونکە عەلمانیەت مەنزوومەی ئیلاهی لەنێو فکر و ژیان دەرهێنا مرۆڤێکی بێ رۆحی دروست کرد کە ئەو مرۆڤەش بەردەوام بەدوای لایەنی ڕۆحیدا وێڵ و سەرگەردان بوو نەخۆشی دەروونی وەک درمێک بەناو رۆژئاوادا

بڵاودەبوویەوە بەهۆی نەبوونی رۆحیانەتێکی متمانە پێکراو ...
لەسەرووی ئەوەشەوە بەرهەمهێنانی دەرمانی دەرونی بوو
بەگەورەترین تیجارەت و بازرگانی بەسەر ئینسانی رۆژئاواییەوە ..
کەسانێکی بێ مەبدەئـ و بێ بەرنامە دروست بوون کە وەک ئاژەڵ دوای
حەزە جەستەیەکان دەکەوتن لایەنی رۆحیان بەتەواوی پشت گوێ
دەخست تاکو کار گەشتە ئەوەی لەتاو ئازاری نەفس و رۆحیان بەدوای
بەرنامەیەکی دیکە بگەرێن لایەنی رۆحیان زامن بکات و تێر بکات....

لەم سەرکەشیەی تاکی رۆژئاواییدا ئاراستەی فکری ڕۆژئاوایی نیازی
دروستکردنی فیکرێکی نوێی هەبوو هەربۆیە لایکردەوە بە ئاراستەی
ئەوپەری ڕۆژهەڵات بەرەو مەعبەدەکانی هندووس و بوزییەکان ..!

دوای سەدەیەک لە داخل بوونی هندوسی بۆ ئەمریکا لەسەر دەستی
چەند گرووپێک وەک (سیۆسۆفی و جوڵانەوەی روحانی) .. کە دواتر
هندۆسی بوو بەهۆی بەرهەمهێنانی فکرێکی نوێی مۆدێرن بۆ تاکی
رۆژئاوایی مەسیحی کە ببێتە بەدیلی علمانیەت و ببێت بە بزوێنەری
جوڵانەوەی فیکرێکی نوێ .ئەو فیکرە مۆدێرنە شتێکی تازە نییە وەک
لەناوەکەیەوە دەرەکەوێ بەڵکو کۆکراوەی فیکریکی وەسەنی چەن
مەزهەبێکی هەمەجۆری شەرقییە کۆکراوەتەوە لە قاڵبێکی رۆحانی و
کرداری نوێدا ، ئەم فکرە نوێیە خاوەنی بنچینەیەکی مەرکەزی نەگۆر
نییە ، بەڵکو تێکەڵەیەکە لە مەبدەئی روحی وەک (وحدەت الوجود و
تناسخ الارواح و نەبونی جیاوزی نێوان دینەکان) ئەم خەزەع بەلاتانە
کە رۆحیانەتی فکری رۆژئاوایی پێ پر دەکرێتەوە ...

لەوەی سەرەوە بۆت دەرەکەوێ جوڵانەوەی فکری نوێ "حركة العصر
الجديد" گەرانەوەی فکر و مەنهاجی چەن دینێکی کۆنی رۆژهەڵاتییە
کە تێکەڵکراون بۆ چنگەوتنی فکرێک کە رۆحیانەتی رۆژئاوایی پی
تێربکەن وە چونکە جیاوازی نێوان دینەکان نییە بۆیە بەلایانەوە
گرنگ نییە شوێن کەوتو خاوەنی چی دینێکە بەڵکو گرنگی بەوە دەن

که رۆژانه چالاکیەکانی تایبەت به (حركة العصر الجديد )زیاد بکەن بۆ ژیانی شوێنکەتوان که بەتێپەرینی زەمەنیش ئەم چالاکیانه دین و فکری کەسەکه دەگۆرێ...!

لەبەر ئەم هۆکاره بەرنامه و ئەدەبیات و تەعریفاتی ئەم فیکره نوێیه بەشێوازێک دانراوه ئەسڵ و راستی فکرەکه که وەسەنیەته بشارێتەوه بەشێوازێک باسی لێوەدەکەن که ئەسڵ و بنچینه فەلسەفیەکانی فیکرەکه دەشارنەوه بەڵکو بەشێوازێک وێنای دەکەن که تەندروستی و دڵخۆشی بەردەوام دەهێنت بۆ شوێنکەوتوانی بێ باسکردنی باتن و پشتەوه ئەم فیکره ...

لەباوەرەکانی (حركة العصر الجديد) دا وای دانێ زەمەنی وەرگرتنی فیکر و بوچون لەچاوگێیکی خارجیەوه وەک "خودا و دین" کۆتایی پێهاتووه

وه مرۆڤ دەتوانێ ژیان و داهاتووی دروست بکات بەهەر شێوازێک ئەیەوێ بەیارمەتی هێزی سروشت و مێشک و تواناکانی..!

"دیپاک شۆبرا" یەکێک له شوێنکەوتوان و بانگەشەکارانی ئەم فکره ئەڵی من مولحد بووم تاکو زانیم من خوودام ..!

چونکه ئەساسی فیکرەکه ئەوەیه مرۆڤ دەکات بەخوودای خۆی و دەبێته سەنتەر بۆ بریارەکانی ...

ئەم جۆره فکره خەزەعبەلاتانه بەهۆی تینوێتی رۆحی تاکی رۆژئاواییەوه زۆر پەرەی سەند و بڵاوبووەوه هەربۆیه فکره سەنەمیەکانی شەرق کراوه به بەدیلی علمانیەت و هەروەها پارێزگاریشی له لەزەته دنیایەکان کردووه بۆ تاکی رۆژئاوایی....

**لەڕووە بایلۆجییەکەوە غەریزە ئاژەڵیەکانیان بۆ فەراهم دەکا دواتر پارێزگاری لە لایەنی رۆحیان دەکات .. بەڵام رۆحیانەتێکی ساختە کە مرۆڤەکە دەکاتە خاوەن ئازادیەکی رەها وەک ئەوەی  خودای خۆی بی مرۆڤەکە  هیچ کۆت  بەربەستێک لەپێش غەریزەکانیدا دروست ناکات هەربۆیەش ئەم فکرە زوو قبووڵ کرا لەلایەن تاکی رۆژئاواییەوە بەتایبەتی دوای ئەوەی شوێنکەوتوانی هەوڵیاندا کە زانست کوێر بکەن لەئاستی بنچینەکانی ئەم فکرە کە ( بەخت گردنەوە و فاڵچێتی و بورجەکان و سحرن) ، هەوڵی ئەوەیان دا کە بنچینەیەکی علمی دروست بکەن بۆ پشتگیری زیاتری فیکرەکەیان ..**

**هەربۆیەش کەسانێکی بەناو رۆشنبیر لەسەر ستەیجەکان دەرکەوتن کە ئەم فکرەیان بەمەنهەجێکی علمی ناوزەد کرد بنەچەکەیان گەراندەوە بۆ( وزەی کەون و خەیاڵی باتن و بیرکردەوەی پێشکەوتنخوازی و بەکارهێنانی یاسای کێشکردن) ...**

**بەڵام ئەم پاساو و قسانە لەلایەن ناوەندەکانی زانستەوە بەتوندی رەتکرانەوە دوای ئەوەی پشتیوانی لایەنی زانستی**

**بەدەست نەهێنا خەڵکی لێی هەڵگەراوە لەو کەسانەش هەڵگەرانەوە وەک " دوورین فێرچۆ و ستیڤن بانکرس " یەکێک بوون لەسەرخەران و بانگەشەکارانی فکری نوێگەری دواتر گەرانەوە بو فکری مەسیحی..**

**دنیای ئیسلامی بەهەمان شێوەی دنیایی مەسیحی بوو بە مەنزڵگەی ئەم جۆرە فکرانە لەرێگای کتێبە وەرگێردراوەکان و بەرنامە تەلفزیۆنیەکان و فیلمەکان و چەندین کەس پەیدابوون بە خیتاب و بانگەشەی دینی هەوڵی بڵاوکردنەوەی فکری "حركة العصر الجديد " دەدەن لەژێر چەتری**

"Neuro-Linguistic Programming(زانستی وزه و یۆگا و و یاساکانی عەقڵی باتن و راکێشانی هەست و سۆزی هاوسەر و بورجەکان و وزەی ژیانی و خۆچارەسەکردن)

ئەمەش لەرێگای چەن کەسانێکی بەناوبانگ خۆیان بەم زانستە پوچانەوەهەڵواسیووە زۆرێک لە راهێنەری گەشەپێدانی مرۆیەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەراست هەوڵی ئەوەدەن رێگایەکی تێکەڵ کردن و بەیەکگەشتن بدۆزنەوە لەنێوان گەشەپێدانی مرۆیی و دیندا چون دەزانن دین گرنگترینە لەزهنی خەڵکی موسڵماندا....

بۆیە گەشەپێدانی مرۆیی ناتوانرێ لەسەر بنەچەیکی دینی دابمەزرێ چون گەشەپێدانی مرۆیی مۆدێرن تێکەڵ بەهیچ فیکرێک ناکرێت چون وای نابینی بەدەستهێنانی ئامانجەکانی شەخسی و کۆمەڵایەتیەکان بەهۆی دینەوە دروست ببێت بەڵکو وای دەبینی دەبێ کەسێکی بێ باوەر بیت خودای خۆی بێت و بێ باوەر بێت لەگەڵ چواردەوردا ئەوکات سەرکەوتووەبیت بەپێی یاساکانی وزە

ئەوەش هەموو پێچەوانە و دژبەیەکیە لەنێوان ئیسلام و فیکرە نوێیانەدا چون دین وزەی کەونی پشت بەستوو بە دار و بەرد و کەسەکان بە وەسەنیەت ناوزەد دەکا بەڵام لەلای ئەو فیکرە نوێیە مەرکەزی فکرەکەیە پێچەوانەی ئەوەی باسی دەکەن کە گرنگی بە فەلسەفە و دینەکان نادەن و خزمەت رۆحیانەتێ مرۆڤ دەکەن .بەڵکو فکرەکەیان هەر لەسەر ئەساسیکی کۆمەڵە دینێکی شەرقی دامەزراوە و بەرگێکی علمی کراوە بەریدا تاکو قبووڵ بکرێ لایەن تاکی رۆژئاوایی سەرلێشواوە ....

# ١٦ _ علمانیەت ڕوخاندنی فیترەتی مرۆڤایەتی (مرۆڤەسەگەکان)

**دۆکۆمێنتاریەکی "firecraker لەساڵی 2016 دا پێگەی" بڵاوکردەوە بەناونیشانی ( ژیانی نهێنی مرۆڤە سەگەکان secret life of huiman pops)**

**دوکۆمێنتارییەکی جیاواز لە دۆکۆمێنتارییەکانی پێشوو چون تۆ بینەری شێرێک نیت کە ئاسکێک راو دەکات یاخود ڕاو کردنی ماسیەکی تونە لەدەریادا ..هتد بەڵکو چاودێری رۆتینی رۆژانەی کۆمەڵە مرۆڤێک دەکەیت کە جلێکی تەسک و ماسکێکی سەگیان لەبەر کردووە لەسەر چوار پەلیان دەڕۆن بەرێگادا و هیچ قسەیەک ناکەن جگە " وەڕین " نەبێ ... لەجەستەدا ئەوان مرۆڤن بەڵام بەسەگ خۆیان دەناسێنن هەروەک ئەو نێرەی دەڵی لەناوەوە " مێم " یان ئەو ئافرەتەی کە دەڵی هەستم بۆ ئافرەت هەیە لەناوە" نێرم "...!**

**ئەم جۆرە سەگانە چین و چۆن لەناو مرۆڤدا ئەم جۆرە فکرە قێزەونە دەرکەوتووە کێ بەرپرسە لەم داخزانە ئەخلاقی و فیتریانەی مرۆڤ ..؟**

**لە دیبەیتێکدا لەگەڵ یەکێک لە مرۆڤەسەگەکان! لەرۆژنامەی "گاردیانی" بەریتانی ئەم سەگە دەڵی : ( زۆر دڵخۆشم ژیانم وەک سەگ وایە هەرچەن بەتەواوەتیش وەک سەگ نییە چون سەگ گرنگی بە ئیش و پارە و نان نادات کێشەکانی مرۆڤی مۆدێرنیان نییە هەربۆیە حەزم لەژیانی سەگە ..)**

**جلێکی سپی خاڵ رەشی لەبەر کردووە و ماسکێکی سەگ ..**

بەڵام سەیرتر لەوە ئەوەیە کە خاوەنەکەی ئەو ئافرەتە بوو پێشتر دەسگیرانی بوو رەتیکردەوە زەواجی لەگەڵ بکات بۆیە بوو بەسەگی ..!

خۆشەویستەکەشی کێشەی نەبوو وەک سەگێگ لەگەڵی بێت ..!

سەگەکەش دەڵی پەیوەندی نێوانمان توندتر بوو لەپێشوو ..!

تەنیا لە بەریتانیا نزیکەی (دەهەزار) مرۆڤی سەگ هەیە بەرەسمی جگە هەزاران تر لەئەوروپا دەژین ... بەشێوازێکی دیکە فیترەتی مرۆڤیان شکاندووە ...

هەرچەن تاکوو ئێستا قبووڵنەکراون بەتەواوی لەئەوروپا بەڵام هاوشێوەی ئەو ترانسجێندەرانە قبووڵکردنی ئەم جۆرە مرۆڤەش نزیکە لە کۆمەڵگای رۆژئاواییدا...

بەپێی راپۆرتێکی "سکای نیوزی عەرەبی" زاناکانی دەرونزانی زانکۆی لەندەن دەڵێن ئەم کەسانە توشبووی نەخۆشی( avoidant personality disorder بوون واتا نەخۆشی دەرونی بەرهەڵستکاری)

لەنیشانەکانیشی ئەم نەخۆشییە رسواکردنی خۆی و تەعزیبدانی خۆی لەگەڵ هەستکردنی بە نەتوانین و خۆشنەویستی خەڵکی بۆی

هەربۆیە یەکێک لەسەگە مرۆڤەکان دەڵێت (هەموو خەڵکی سەگیان خۆشەوێ گەر منیش سەگ بم هەمووان خۆشمیان دەوێت)

لەگەڵ ئەوەشدا چەن تەفسیریکی تری دەرونزانی پەیدابوون لەوەسفی ئەم حاڵەتەدا..

"ولیام وێگناڵی" نوسەر دەڵی:

( پاڵنەری جنسی لەڕادەبەدەر وا لەکەسەکە دەکات توشی ئەم حاڵەتە ببێت ئەو پاڵنەرە جنسیە وادەکات کەسەکە حەز لە ئیهانەکردن و ئازاردان دەکات لەلایەن بەرامبەرەوە و خۆی بەموڵکی هاوبەشی ژیانی دەزانیت و ئەویش چی بویێت پێی دەکات .. چەن تەفسیریکی تریشی هەیە وەک راکردن لەواقعی ژیان ..هتد )

ئەوەش والەمرۆڤەکە دەکات کە لە رەگەزە مرۆڤیەکەی رابکات و هیچ مەسولیاتێک هەڵنەگرێت ببێت بە شتێک کە هیچ شتێکی لەسەر نەبێ و هیچ کێشەیەکی توش نەبێ ..!

هەربۆیە یەکێک لەسەگەکان ئەڵێ ( گەر تۆ سەگ بیت تۆ مولزەم نیت تەعامل لەگەڵ خەڵکی بکەیت وەک مرۆڤێک و نارۆیتە ژێری هیچ یاسایەکی کۆمەڵایەتی مرۆڤەوە دەتوانی باز بدەیت و داوای شتیان لێبکەیت بێ ئەوەی توشی هیچ عەیب و عارێک ببیت)

تەنیا تەفسیری نەفسی بەس نییە بۆ تێگەشتن لەم دیاردە دزێووە...

فەیلەسوفی عەدەمی بەناوبانگ "ئارسەر شۆبنهاوەر" دەڵی : ژیان وەک بەندوڵێک دەسورێتەوە لەنێوان ئازار و بێتاقەتی لەونێوەندا یاری دەکات ، جگە ئەوە هەرشتێکی تر گاڵتەیە )

لەژیانێکی وەهادا کەشۆپنهاوەڕ باسی دەکات لەزەت و چێژ دەبێتە سەنتەر بۆ مرۆڤەکە چونکە تاکە رێگای رزگار بوونە لە گوشاری ئازار و تاکە رێگایە بۆ هەڵهاتن لە گەردەلوولی بێزاری و بێتاقەتی ..

بەڵام لەراستیدا ئەو ژیانەی شۆبنهاوەر وێنای کردووە ژیانی کەسی عەلمانی مۆدێرنە ئەو مرۆڤەی خۆی لەدین داماڵیە و باوەری بەبوونی خوودا نەماوە

خۆی بووە بەخودای خۆی و هیچ شتێک لەسەرووی خۆیەوە دانانێت..

لەکتێبی" العلمانية طاعون العصر " (دکتۆر سامی عامری) دەڵیت : ( گۆرانی ئەسڵی لەرەگەزی مرۆڤدا ، دامەزراوەیی مرۆڤی تێکشاندووە لەزەمەنی کۆنترۆڵکردنی لەزەتەکاندا هەموویانی کردووە بەیەک جۆر مرۆڤ... لووس بێ موو ، کاڵ بەبێ رەنگ .. دووبارەوەبوو بەبێ شاز و تایبەتمەندی ... بۆیە مرۆڤی علمانی لە هەڵخەڵەتانێکی زۆر گەورەدا دەژی بەناوی ئازادی چی بووێ دەیکات و لە هەموو شتێکی نوێدا قووڵەبێتەوە و دوای دەکەوێ بەڵام لەراستیدا مرۆڤیکی ماڵیکراوە و چێژەکان سەرنجی رادەکێشیت و جووڵەی پێدەکات بۆ کوێی بوێ دەیبات )

لێرەوە دەزانین کە بۆچی زۆرینەی مرۆڤە سەگەکان پێشووتر هاورگەزبازبوون یاخود ترانسجێندەر بوون چون ئەوان دوای هەموو شتێکی نوێ دەکەون دەیکەن بەچێژ و خۆشی چونکە هیچ مبدەئـ و باوەریکیان نییە بۆ ژیانکردن

بەپێی چاوپێکەوتنێکی" لیام وێگنڵ " لە پێگەی دیسکەڤەری دەڵێ لەو سەگانەی چاوم پێکەوتن 30دانەیان هاورەگەز باز و ترانسجێندەربوون پێشووتر وایان داناوە سەگبوونیش جۆرێکی چالاکی سێکسیە درێژبوونەوەی هێلی شەهوەت و حەزەکانە کە سنوری بۆ نییە هەموو نوێیەک تاقی دەکرێتەوە بەبێ هیچ سنور و رێگریەک مادام بەها ئەخلاقیەکان بوونی نییە و ژیانیش بێ مانا و ئامانج بێ ئەوا چێژەکان دەبنە سەنتەر و مرکەز بۆ مرۆڤەکان )

گەر بڵێین ئەم دیاردە نەخۆشی دەرونییە کەوایا جیاوازی چییە لەنێوان مرۆڤیکی ترانسجێندەر کە گوایە ناوەوەی پێچەوانەی دەرەوەیەتی لەگەڵ مرۆڤە سەگەکان بۆچی ترانسجێندەرەکان لەیاسادا مافیان پێدراوە و سەگەکان هێشتا بێ ماف بن ..؟

لە دۆکۆمێنتاریەکدا "مات واڵش" پرسیاری ئەوە دەکات ئافرەت کێیە ؟ لەکۆمەڵگای ئەمریکیدا پرسیار دەکات لە پرۆفیسۆر و دکتۆر و شیکەرەوەکان لەکۆتایدا وڵامێکی روونی دەسنەکەوت لێڵیەکی زۆری بینیەوە لەناو وڵامەکاندا نەیان دەویست تەعریفی ژن و پیاو بکەن هەر نەیاندەویست جیاوازی بکەن لەنێوانیاندا لە ئەساسەوە...!

بەڵام "واڵش" بریاریدا سەردانی یەکێک لەهۆزە سەرەتای و دواکەوتەواکان بکات لە ئەفریقیا لەچەن چرکەیکدا وڵامی دراوە زۆر بەرونی هەموویان کۆک بون لەسەر وڵامەکە وتیان ئافرەت ئەوەیە ( بەمێیە دروست بووە )

لێرەوە دەگەرێینەوە بۆ دیاردەی سەگەکان بۆچی ئەو ترانسجێندەرانە ئازادن و ئەوانیش هێشتا ئازاد نین ئایا هەویەی بەشەری هێشتا لە رۆژئاوایەکی شێواودا هێشتا بەتوندی ماوەتەوە ..؟ ئایا دیاردەی سەگبوون شۆکهێنەرە تەنانەت بۆ عەلمانیەتە شێواوەش وەک بڵێیت زلەیەکی لە علمانیەت داوە پێی دەڵی چەن دونیا وێرانکردووە بەڵام نا !..

چون پێش چەن دەیەیەک هاورەگەزبازیش سزا و نایاسایی بوو بەڵام ئێستا گەورەترین ماف و ئازادی پێدراوە ..!

"زیگمۆند باوماند" دەڵی ( ئەو ژیانە شل و داڕوخاوەی ئەوروپا جیهانی توشی داروخان و کشان کردووە وەک راکردنە لەسەر لمی جوڵاو هەر داروخان و لادانێکی ئەخلاقی دانەیەکی تر بەدوای خۆیدا

دێنیت ، مادام ژیان بێ مەبدەئـ بێ نرخ و بەهایە هەر شتێک ئەمرۆ ناشرین بێ دەکرێ سبەینی ببێتە شتێکی خۆشویستراو تەنها شتەکە لەسەرئەوە وەستاوە چەن کەس پشگیری کردارەکە دەکات ، مرۆڤی رۆژئاوایی بووە بە خوودا بۆ نەفسی خۆی ، هەرچەندیش خوداکان زۆر بن بەشێکیان زاڵەبن بەسەر ئەوانی تردا ، بەم شێوازە گۆران و تازەگەری ئەبێتە چەسپاوی و بێ یەقینی دەبێتە یەقینی سەرەکی ...! )

پاڵنەری سەرەکی  نارونی پێناسەی ئافرەت لە نێوان کۆمەڵگای ئەمریکی و هۆزە سەرەتایەکانی ئەفریقیا عەلمانیەتە کە وردە وردە بەرەو لێواری کەندالێک مرۆڤایەتی دەبات کە کۆتایەکەی خزان و مەرگی کۆمەڵگاکانە سەرەرای پێشکەوتنی مادەگەرایی و بار و زرووفی مادی ..

هەربۆیە تاکە رێگایەک بۆ پارستنی فیترەتی مرۆڤ دینە کە وەک چەتریک دەیپارێزی لەهەموو لادان و ئینحرافەکان گەر هۆزەکانی ئەمازۆن و ئەفریقاش شوێن کەوتوەیەکی کوێرانەی ئەو لەزەتە دوونیایەکان بن بەبێ سنور و یاسایەک ئەوا رۆژێک دێت ماسک و جلی سەگەکان لەبەر دەکەن ... بۆیە تاکە رێگریەک لەپێش ئەو لادانانەدا بەها ئەخاقیەکانە بەبێ بوونی خووداش هیچ بەها و نرخێک لەژیان و جیهاندا بوونی نییە و ناشبێت ...

# ١٧ _ علمانیەت و ئیلحاد

- عەلمانیەت=ئیلحادی شاراوە.
- ئینسانیەتی عەلمانی.
- دینێکی شەیتانی.
- وێرانکاری زەوی.
- عەلمانیەت دژایەتی کردنی ئیسلام .
- عەلمانیەت دینی دەجال بۆ مرۆڤایەتی.

پەیوەندی نێوان علمانیەت و ئیلحاد چیە؟

بنەچەی علمانیەت بۆچی دانرا؟

ئیلحاد چیە و چۆن دۆستی علمانیەتە؟

ئیسلامی عەقڵانی پەیوەندی چیە بە ئیلحادەوە؟

پیلانی ژەهراوی عەلمانیەت چیە؟

علمانیەت و ئیسلامیەت گونجاون پێکەوە؟

کێن سەرخەرانی علمانیەت؟

لە ئۆکتۆبەری ساڵی 2007 فەیلەسوفی ئەڵمانی " مایکڵ سالمۆن " چیرۆکێکی بۆ منداڵان بەشێوازی وێنە بڵاوکردەوە ، کەمشت و مڕێکی زۆر گەورەی لە ئەڵمانیا بەرپاکرد تایتڵی چیرۆکەکە بریتی بوو لە:

کاتێک بەرازە بچوکەکە وتی بەیارمەتیت ڕێگای خودا کامەیە ؟ ؟؟

**" چیرۆکی بەراز و ژیشکەکە!! "**

**بەکورتی چیرۆکەکە دەربارەی بەرازێک و ژیشکێکی بچوکە کە وەرەقەیەکیان لە پشت دەرگای ماڵەوەیان دۆزیەوە لەسەری نوسرابوو ( گەر تۆ خودا نەناسی شتێکت لەدەستداوە !)**

**بەهۆی ئەو وەرەقەوە گەشتێکیان دەس پێکرد بەرەو گەشتن بەرێگای خوا ، سەرەتا سەردانی پەرستاگایەکی جولەکەیان کرد ، پیاوە ئاینیە جولەکەکە باسی ئەو خوایەی بۆیان دەکرد کە ئەو قەومانەی نوقم کرد کرد کە شتانێکی تریان دەپەرست جگە خودای راستی .....**

**بەرازەکە وتی هەموویان خنکان؟**

**دواتر وتی چۆن بزانین ئەو خودایەی تۆ دەیپەرستی ڕاستیە؟ لەوکاتدا حاخامەکە لێیان تووڕە بوو دەریانی کرد لە پەرستگاکە**

**دواتر چونە کەنیسەیەکەوە ، قەشەکە باسی عیسای دەکرد بۆیان کە لەخاچدراوە بۆ ڕەشبوونەوەی گوناهەکانی ئێمە ، ئێمەش یادی خوێن و جەستەی دەکەینەوە بەخوانێک خواردنی نان لەباتی گۆشت و شەراب لەباتی خوێنی عیسا( کە شێوازێک جەژنی مەسیحیەکانە) بێزار بوو بەرازەکە وتی ئەمانە گۆشتی مرۆڤ دەخۆن ، ئەگەر ئەمانە گۆشتی کوری خودایان بخۆن گۆشتی من چۆن ناخۆن ، لەکلێساکەش دەرکران**

**وێسگەی کۆتایان بریتی بوو لە ئیمامی مزگەوتێک ، ئیماماکە پێیانی وت بۆئەوەی خوا بناسین دەبێت ڕۆژی پێنجار نوێژ بکەین و پێش هەموو نوێژێک دەبێ دەسنوێژ هەڵبگرین ، ژیشکەکە وتی ئەمە 35 جار دەکات لە حەفتەیەکدا ، بۆئەوە پاک بم یەک جار خۆشۆردن بەسمە لەهەفتەیکدا ، بۆچی ئەم هەموو حەزە بۆ پاکی! من ئیشی ترم زۆر**

هەیە لەجیاتی ئەو هەموو دەس نوێژە و نوێژە ، لەمزگەوتیش دەرکران
.

ئایا ئەم چیرۆکە لەزەمانی کۆرۆنا بڵاوکرایتەوە ، ئایا نوسەرەکە دووبارە ڕەخنەی لە ئیسلام بۆ پاکی ئەگرت !! کە ئاو بەفیرۆدەدەن ! بۆپاک ڕاگتنی خۆیان بەبەردەوامی! بەهەرحاڵ چیرۆکەکە کۆتای هات و گەڕانەوە ماڵەوە وەرەقەی پشت دەرگاکەیان گۆڕی بە (ئەگەر تۆ خودا بناسی ، شتیکت لەدەست داوە)

چۆن تێگەشتی لەم چیرۆکە؟

پەیوەندی ئەم چیرۆکە بەبیری عەلمانیەتەوە چییە؟ لەڕاستیدا فەلسەفەی عەلمانیەت لەسەر ئەساسی سوورانەوە بەدەوری حەزەکانی مرۆڤ دروست بووە بۆیە هەرشتێک سوود بەو حەزە دوونیایەکان بگەینێت لەفەلسەفەی عەلمانیەتدا ئەوا شتێکی باشە ! هەرشتێکیش زەرەری لێبات خراپە ! ئەوان دین بەشێوازی ئەبینن کە گەر تۆ خودا (دین ) بناسی ئەوا تۆ شتێک ( ژیانت ) لەدەست ئەدەیت! بەمانایەکی دیکە ئەگەر تۆ شوێنی دین بکەویت ، ئەوا تۆ(عەقڵت) لەدەست داوە ، چوون لای ئەوان کەسێ دوای حەزەکانی دوونیا نەکەوێت بێ ئەقڵە ( دواکەوتوە ) ، هیچ یاسایەک نیە بیان وەستێنێ لە حەزەکانیان ، چوون لایان وایە دین وەهم و خەیاڵە یان بەواتایەکی تر دین مادەیەکی هۆشبەرە بۆ گەلەکان ! هەروەک ریچارد دۆکینس باسی چیرۆکەکە دەکات دەڵێ ( خەیاڵی خودا لەلای منداڵان ) !!

لەمانگی دوانزەی هەمان ساڵ لیژنەی باڵای منداڵان وگەنجان لە ئەڵمانیا بەرهەڵستی زۆری ئەم چیرۆکەی کرد ، هەروەها ئەنجومەنی باڵای جولەکە دژایەتی زۆری ئەم چیرۆکەی کرد بەهۆی ئەوەی دژایەتی (ڕەگەزی سامی ) دەکات ، لە مانگی 2ی ساڵی2008دا 22 ڕێخراو و لیژنەی یاسای و مرۆڤایەتی بەڵگنامەیاکەیان بڵاوکردەوە بۆ

پشتیوانی نوسەری چیرۆکەکە لەهەمان کاتدا چەندین پارێزەر و ماف ناسی جولەکە پشتیوانی سەختی چیرۆکەیان کرد دواتر و کشنانەوە لە دژایەتی کردنی و وتیان دژایەتی ڕەگەزی سامی ناکات بەڵکو دژایەتی سێ دینەکە دەکات!! ، چونکە جولەکە پێی خۆشە دین لە گەلان دابڕێت ! هۆکاری ئەم خواستەی جولەکە دواتر باس دەکەین ان شاءالله و یەکێک لە ئەندامەکانی پەرلەمانی ئەڵمانی وەسفی کتێبەکە دەکات بەوەی کە پشگیری بەها مرۆڤایەتیەکان و فێربوون دەکات لەکۆتایدا و لە مانگی شەش 2008 سکاڵاکان کشانەوە !! چیرۆکەکە تەشەنەیکرد ! چون سەرمایەدارانی جولەکە پشتیوانیان دەکرد لە بڵاوبوونەوەی بیری بیباوەری....

ئینسانیەتی عەلمانی.

عەلمانیەت بەشێکە لەبەشەکانی دینی ئینسانیەت (واتا ئینسانیەت بریتیە لەو رێبازانەی مرۆڤ دایهێناون لەمێژوودا وەک ئیلحاد ، عەلمانیەت ...) هیچ دەستەواژەیەک نیە بیسەلمێنی فۆرمی ئینسانیەت کەی و لەسەر دەستی کێ دامەزراوە هەتا "humanism" بۆخۆی هەڵگری چەن مانایەکە humanismدەستەواژەی کەدژایەتی یەکدی دەکەن ! بەڵام هەموو ئەو ڕوونکردنەوەکان سوردەخۆنەوە بەدەوری مرۆڤدا و توانای مرۆڤ بۆ ڕێک خستنی کاروبارەکان ژیانی و ڕەتکردنەوەی ئیمانی بەهەر فیکرێکی غەیبی هەست پێنەکراوی زانستی !(یانی هەر دینێک بروانە ژێر چەتری ئینسانیەت لەسەر ئەو بنەچەیە دادەمەزێت) !

بریتیە لە ئینسانیەتی humanism بەناوبانگترین مەزهەبەکانی عەلمانی ! عەلمانیەت وەک چارەسەرێ دروستکرا لەنێوان شەریعەتە دینیەکان لەلایە و فیکری کەسانی عەقڵانی و زانستی و داروینزمی کۆمەڵایەتی لەلایەکی دیکەوە کە هەموو خورەوشت و بەهایەکی مرۆڤ بوون ڕەتدەکەنەوە ! کەواتا عەلمانیەت ڕێگەئەدا بەوەی هەندێ !

خورەوشت مرۆڤ شەریعەتی دین وەربگیریت ( لەهەموو دینەکان ! نەک تەنها ئیسلام ، ئەوانەش کە وەریدەگرت بۆخۆی باوەری پێبوو نەک بەهۆی بەڕاست زانیینی دینەکەوە وەریگرتبێت ! ) بەڵام زۆر توندە لەسەر هەموو عەقیدە و فیکرەیەک و شەریعەتێکی دینی بەتەواوی ڕەت کاتەوە واتا تۆ کەمووسڵمانی بەهەموو باوەرەکەتەوە تۆ قبووڵناکات ! بەڵکو زۆر شتت هەیە رەتی دەکاتەوە !دواتر پشت بەخوا درێژە بەمەدەدەین ...

ئینسانیەتی عەلمانی لەدایک بوو بەمشێوەیە و ئیلحادی گردە باوەش وەک عەقیدەی خۆی و ئەو ململانێیە تەقلیدیانەی بەزاند و نەیهێشت کە لەنێوان ئیلحاد و دیندا هەبوو ( شەری دین و الحاد لەمێژوودا ) دین و الحاد لەسەر یەک سفرە کۆکرانەوە سرفەکەش ناوی لێنرا عەلمانیەت ! ، عەلمانیەت بوو بە بەدیلی دین , سیستەمێکی ژیانی تەواو لەباتی دین ! کەدامەزراو لەسەر ئینکاریکردنی هەمووجۆرە غەیبێکی هەست پێنەکراوی زانستی ! دامەزراوە لەسەر زانست و عەقڵ و مەنتیق و فەلسەفە ، سیستەمی عەلمانیەت کۆمەڵێک بەهاو ڕەوشت بۆ مرۆڤ دادەنا کە ئاسوودەیی ، حەساوەنەی مرۆڤ تەوەری سەرەکی ئەم ژیانە بێت هەربۆیەش دروشمەکانی عەلمانیەت ئایدۆلۆجیایەکی ئیجابی و پۆزتیڤ تر بوو بانگی مرۆڤی دەکرد بۆ پێکەوەبون وهەرەوەزی جوانتر و سەرنجراکێشتر بوو لەلای مرۆڤایەتی وەک لە "ئیلحاد" کە فکرێکی باوەری بەهیج نیە لەبەهای ئەخلاقی و رەوشتیەکان و لە عورفی کۆمەڵایتی و هەتای دوایە و بۆیە ئیلحاد توشی پێکدادان و ڕووبەروو بوونەوە دەبێتەوە لەگەڵ کۆمەڵگاکان ڕووبەرووی دابوونەریت یان ڕووبەرووی دینی کۆمەڵگاکان .... کۆمەڵگاکان هەتا ئەوانەی ڕۆژئاواش لەسەرەتادا دژایەتیەکی زۆری ئیلحادیان دەکرد هەروەها کۆمەڵگا بەناو ئیسلامیەکانیش زۆر دژی ئیلحادن ، کەواتا ئیلحاد فیکرێکە زۆر دژایەتی دەکرێ و لەهەر کوێیەک بەناو خۆیەوە دەرکەوێ خەڵک جەنگی دژ دەکا بەڵام بەهۆی عەلمانیەتەوە هیج جۆرە ڕووبەروبونەوەیەکی راستەوخۆی لەنێوان دین و ئیلحاد دروست نەبوو ! بۆیە دانەرانی فیکری عەلمانیەت کە خاوەنی فیکری ئیلحادن

زۆر زیرەکانە توانیان ڕووی راستی ئیلحاد بگۆرن و لەناوێکی دیکەدا بیکەن بەگەروی خەڵکیدا ! پەلەیان نەکرد لەدانانی فیکری عەلمانیەت لەڕێگای سێ کۆنفراسی گەورەی نێودەوڵەتیەوە کە نزیکەی 7 دەیەی خایاند بۆ دروست بوونی فیکری عەلمانیەت !

سەرەتا لەیەکەم لێدوانیاندا لەساڵی 1933 وشەی دینیان 30 جار بەکار هێنا و شیانکردەوە ، کە ستایشی زۆرێک لەخو و ڕەوشتەکانی دین دەکات و لێک تێگەشتن بۆ دین دروستەکات یانی لەیەکەم لێدوان و کۆبونوەیان خۆیان پاراست لە پێکدادانیان لەگەڵ دین بەپێچەوانەی لێدوانی و کۆبوونەوەی دواتریان لەساڵی 1973 کە چووە نێو دژایەتی بیری غەیب و بوونی خودا و دینەوە ! ئەمەش ڕێگای خۆشکردن بۆ دەرکردنی کۆتا لێدوانیان لەساڵی 2003 کە بەتەواوی جەنگی خۆیان لەگەڵ دین و خودا و غەیبیاتدا ڕاگەیاند . بۆ زانیاری خوێنەر دژایەتی ئەوان بۆ بوونی خودا و دیانەتەکان بەعامی هیچ پەیوەندی بە زانست و لێکۆلینەوە زانستیەکانەوە نیە ، بەڵکو مەسەلەکە زۆر لەوە گەورەترە جەنگە شتێکی دیکە ! ئاهەنگەکەیان لەشوێنێکی دیکەیە تەپل و زورناکەشیان لەشوێنکی ترە ! پشت بەخوا ئەمەش باسەکەین ئەسڵی ئینکاری خوایان لەچیەوەیە ڕەگەکەی ...

لیستی ئیمزاکارانی کۆبونەوەی ساڵی 2003 چەندین کەسایەتی بەناوبانگی فەلسەفی و ئەکادیمی و زانستی و نوسەر و زانای براوەی خەڵاتی نۆبڵی تێدابوو جگە لەمانەش لیستی دیکە لە کەسایەتی ئیمزایان کردووە ئەوانیش هونەرمەند و ئەکتەرەکانن کە فیکر و ڕێبازی عەلمانیەت دەگەینن بە هەوادارانیان بەشێوازی هونەر و فیلم و بەشێوەی ناراستەوخۆ...

کەواتە بەڕێزان عەلمانیەت شاڵاوێکی دیکەی زۆر گەورەی کۆڵۆنیاڵیزم و داگیرکارە بەبەرگێکی نوێیە هەر لە ئیعلامەوە هەتا گەورەترین سوڵتەی تەشریعی و یاسادانان لەلای خۆیانە لەخزمەتی بیر و بۆچوونی عەلمانیەتە ، ئەوان حوکمرانی خاکی مووسڵمانان دەکەن ، چوونکە لەساڵی 1918 کاتێ عووسمانیەکان لەلایەن ئینگلیزی و فەرەنسا و ڕووسیاوە داگیر کرا ، سوپاکانی ئەوان بۆ سەفرە و گەشت نەهاتن داگیری بکەن و برۆنەوە ! ئەوان هاتن بۆ داکوتانی ڕەگی خۆیان بەدانانی سیستەمێک ئەویش عەلمانیەت ، هەژموونی ئەوان هەتا ئێستەش لەسەر خاکی ڕۆژهەڵاتە نەک ئەوە تەنیا خۆشیان بەخاوەنی وڵاتانی ڕۆژهەڵات دەزانن وەک سوریاو عێراق و سعوودیە و قەتەر .. ئاوەدانی شارستانیەتی رۆژئاوایی لەسەر حسابی وڵاتانێکی ترە بەهۆی سیستەمێکەوە ئەویش عەلمانیەتە!!

لەجیهانی ئیسلامیشدا زۆرێک بەناو بانگخواز باوشیان بۆ مرۆڤگەری عەلمانی کردووەتەوە هەندێکیان بێدەنگ بوون و هەندێک بە کاریگەر بونیان بە دینی عەلمانیەت (شارستانیەتی ڕۆژئاوایی ) توشی دوورکەوتنەوە و دابران هاتن لە ئەسڵی بنچەی دینەکە ( معتەزیلەکان ) لایان وایە شارستانیەتی ڕۆژئاوایی بەهۆی عەلمانیەتەوە پێشکەوتووە ! من دەڵێم ڕاستدەکەن بەڵام نەک بەهۆی خودی بنەماکانی عەلمانیەتەوە ! بەڵکو علمانیەت هۆکارێکە بۆ داگیرکردنی وڵاتان و بردنی سامانی ژێر زەوی و سەرزەویان ! کەواتا علمانیەت بۆخۆی پێشکەوتوویی نیە وەک هەندێ وای دەبینن بەڵکو وەسیلەیەکە بۆ پێشکەوتن لەسەر حسابی وڵاتانی تر!!

ئەم دابڕانە و دوورکەوتنەوە واتا ئەم ئیسلامی عەقڵانیەتە( معتزیلە) وەک ئەو مووعتەزیلانەی کۆن نین بەڵکو موعتەزیلەکانی ئەم سەردەمە ملی نەس و نوسراوە شەرعیەکان دەچمێننەوە بەتەواوی بۆ عەقلی مەخلووق دەچەمێننەوە ، دروستکراوەکان دەکەنە داوەر بۆ خالق و دروستکەر لەوەی فەرمانی داوە بکرێت و نەکرێ ، قۆناغی دواتر هەر بەشێوەی لۆژیک و مەنتیق ئەم موعتەزیلانە چەمکی خودا ڕەتدەکەنەوە بەوەی کە پێویستیان پێ نیە و گەردوون و زانست کاملە

!!! لێرەیا پرسیارێک دێتە کایەوە ئەم پەیوەندیە نزیکە بۆچی هەیە لەنێوان ئیلحاد و عیلمانیەت ؟؟؟

وڵامەکەی ئەوەیە ئیلحاد بیروباوەری بەکاری دەهێنن بۆ تێکشانی دینەکان و فیکری مرۆڤەکان و عەلمانیەتیش بەکاردەهێنن بۆ ئاوەدانکردنەوە بنیادنانەوەی فیکرەی مرۆڤەکان و هەموو لایەنی قبووڵ دەکات ! لێرەشەوە هەوڵدەن پەنجەمۆرێک لەسەر دوونیا جێبهێلێت بۆیە هەوڵی بلاوکردنەوەی عەلمانیەت دەدەن لەجیاتی ئیلحاد ئەمەش ئیلحادێکی تر بەڵام بەتامێکی دیکە!!

عەلمانیەت=ئیلحادی شاراوە.

دینێکی شەیتانی

لەپێشدا مرۆڤ بە دواتر هەردینێک هەڵدەبژێری هەڵیبژێرە!

دەستەواژەیەکە زۆر جار دووبارەی دەکەنەوە بەنیەتێکی باشەوە بەمەبەستی کردنی رەفتاری چاک و مرۆڤانە ! یانی چەمکی مرۆڤبوون دەوەستێتە سەر ئەوەی کە کۆمەڵێک رەفتار و ئەخلاقی بەبەزیانە کە مرۆڤ لەڕێگای وروژاندنی هەستەکانیەوە ئەنجامی دەدا , بەمانایەکی دیکە هیچ کێشەیەک نیە لەوەی تۆ چەمکی مرۆڤبوون جێبەجێ بکەی و بیخەیە پێشەوەی چەمکی ئاینەوە و هەر ئاینێکیش هەڵدەبژێریت هەڵیبژێرە تەنیا مرۆڤبە ئیتر کێشە نیە !!

(بۆ کاروباری ژیانت پشت مەبەستە بە بەرنامەی دیکە جگە و مرۆڤگەری عەلمانی ) ئەمە لەبانگەشە و humanism
ـە humanismلێدوانەکانی سەرخەرانی

چالاکوانی مافەکانی مرۆڤ "ئێگوی"باس لەخۆی دەکا لەکاتی فێربوونی دینی مەسحیەت بۆ ئەوەی ببێتە قەشەیەک..

دەربارەی ئەوەی بۆی ڕوونبوەتەوە لە "ئایدیا جیاوازەکانی ژیان" قسەدەکا و دەڵی؛

( زۆر بیر وبۆچونی جیاوازم زانی دەربارەی ژیان ، بیر و بۆچونێک کە ئایدیا دینیەکان ڕەت دەکاتەوە ئەویش (مرۆڤگەری، humanism)

هەندێک لەوەیە بپرسن مرۆڤبوون یا مرۆڤگەری عەلمانی چیە ؟ مرۆڤگەری عەلمانی ڕێگایەکە بۆ بیرکردنەوە و ژیان جەخت دەکاتەوە لەسەر تواناکانی مرۆڤ ، مرۆڤگەری وای لەئێمە کردووە ڕوومان وەرگێرین بۆ ڕاستیەک کە ئێمە مرۆڤین دەتوانین ژیان بگۆڕین هێزی ئەوەمان هەیە ژیانمان بگۆڕین چ بەشێوەی تاک یان کۆمەڵ بەبێ پشت بەستن بە دید و بۆچونی دیکە جگە مرۆڤگەری !)

کەواتا عەلمانیەت تەنها دینێکی سادە نیە ! بەڵکو دەسەپێنرێت دەبێ ببێتە مەرجەعی یەکەمی خەڵک . دەبێت سەرچاوەی هەڵهێنجانی سەرەکی ژیانیان عەلمانیەت و مرۆڤگەری ( humanism) بێت

لەوانەیە هەندێک بڵێن ئەمە بۆچونی تایبەتی خۆیەتی کەواتا بابببینین خۆیان بەفەرمی چیدەڵێن !

لەخولێکی ڕاهێنان بەناونیشانی( چوونە ژوورەوە بۆ مرۆڤگەری دەستورێکی بێ دین بۆژیان) کە لەلایەن ڕێکراوی بەریتانی مرۆڤگەری عەلمانیەوە ئامادەکرابوو ، چوار وێنا بۆ چەمکی دینی باسکراوە هەتا هەڵوێستی مرۆڤگەری سەبارەت بەدین ڕوون ببێتەوە :

1- دین عەقیدیە (باوەڕ بە بەندەکانی دینەکە )

2- دین کەش و هەوای دینیە ( چالاکیەکان،وەک نوێژ..)

3- ناسنامەی دینی( واتا جێبەجێ کردنی عەقیدە ! )

4- کەلەپووری ڕۆشنبیری دینی(مێژووی دینەکە)

لەو خولەدا وتیان دەکرێ مرۆڤگەری لەگەڵ خاڵی دوو و چوار کۆببێتەوە! (واتا کێشەمان لەگەڵ ئەوەنیە دروشمە دینیەکانت وەک نوێژ و ڕۆژوو ...هتد جێبەجێ بکەی بەتەنها یان مزگەوت ، لەگەڵ باسکردنی مێژووی خۆت ودینەکەت ! )

بەڵام قەت نابێ لەشوێنێک و زەویەکدا عەقیدە و ڕەگەزنامەی دینی و مرۆڤگەری عەلمانی کۆببنەوە پێکەوە ( بەکورتی عەقیدەی ئیسلامی نامانەوێ بێتە دەرەوەی مزگەوت وداوای زیاتر بکات یان کەنیسەش بەهەمان شێوە نابێ لەدەرەوەی کەنیسە بیت ! ، مافی ئەوەت نیە داوای جێ بەجێ باوەڕەکەت بکەیت ! )

بۆنمونە زانای فیزیای جەمیل سادق بەریتانی بەرەگەز عێراقی چەند کتێب و محازەرەی هەیە کە لەسەر زانا کۆنەکان و مێژووی ئەم ئیسلامە بە شانازیەوە قسەدەکات لەولاشەوە سەرۆکی پێشووی ڕێخراوی مرۆڤگەری عەلمانی بووە لە ساڵی 2013-2016 !!!!! ، لێدوانی بۆ ڕۆژنامەی گاردیان ئەڵێ بەهۆی ئەوەی لە باوکێکی شیعی و دایکێکی مەسیحی لەدایک بووم ، هیچ ئاساوەرێکی دین لەمندا نەبووە یانی (هیچ باوەڕێ دینیم نیە )، دوای ئەوەی ساڵانی شەست و حەفتاکانم لە عیراق بەسەر برد ئێستا من دان ئەنێم بە مێژوو و کەلەپوور و عێراق و مووسڵمانان و شانازیە بۆمن !!!! ) کەواتا شانازی مێژوو و کەشووهەوای دینیەوە دەکا بەڵام ئەوانیکە چی !!؟؟!

**کەواتا بۆچی قورسە و ناکرێت کۆکردنەوی عەقیدە و بیروباوەری ئیسلامی و ئیمان بەخوا لەلایە و مرۆڤگەری عەلمانی لەلایەکی دیکە ؟**

**لەگەڵ ئەوەی چەند پێناسەیە جیاواز بۆ مرۆڤگەری هەیە بەڵام هەمووی لەچوار دەوری یەک بیر کردنەوە سووردەخواتەوە ئەویش ( توانای مرۆڤە تەنها مرۆڤ بۆ زانینی خراپە و باشە و هەڵە و چاکە ، بەبێ هیچ پێویستیەک بۆ هێزی شاراوە و غەیبی (خودا) ، بەئازاد کردنی ویست و ئیرادەی مرۆڤ بۆ دیارکردنی باش و خراپ ، مرۆڤەکان دەتوانن پێکەوە برۆن بەرەوە ژیانی کە داواکاریکانی مرۆڤ باڵابن تێیدا ، دڵخۆشی و حەزەکانی مرۆڤ ئامانج بێت ، ئەوان گرنگی نادەن بە رەتکردنەوە و سەلماندنی بوونی خودا چون ئەوان ئەسڵەن خودا بەلایانەوە گرنگ نیە ئەوان دەڵین ئێمە وەک مرۆڤ پێویستمان بەخودا نیە بۆدیاریکردنی شەر و خێر دەتوانین ژیان بکەین بەبێ پێویستی بۆ خودا )**

**دەبێ ئەم بۆچونانە لەکوێیەوە هاتبی ، تۆبلێی لەزانستەوە بێ یان لێکۆلینەوەکانیان؟!**

**باهەندێک بگەرێینە دواوە....**

**لەگەڵ لێکچوونێکی ڕووکەشی لەنێوان چیروکی ئادەم لەنێوان تەورات و قورئاندا بەڵام چەن جیاوازیەکی بچوک هەیە لەنێوانیان لەگەڵ تێپەرینی زەمەندا ئەو جیاوازیە دەرئەنجامێکی وێرانکەری بەرهەم هێناوە چیرۆکەکە لە ئیسحاقی سێ لە سفری تکوین ڕوونکردنەوەی زۆر وردی تێدایە کە لەقورئاندا پیرۆز باس نەکراوە ...**

وەک:

1- شەیتان "حەوائی" هەڵخەڵەتاند

2- هۆکاری حەرامبوونی دارەکە ئەوەبوو ، دارێک بوو هەرکەس لێی بخواردایە چاکە و باشەی لێک جوودا دەکردەوە ، ئەم توانایەش تەنها بۆ خودایە بەس گەر لێی بخۆن وەک خودا ئەبن چاکە و خراپە لێک جودا ئەکەنەوە

3- ژن بوو ئادەمی هەڵخەڵەتاند

4- ئادەم حەوائی تۆمەتبارکرد

5- سزای خوا بۆ ژنان ئەوەیە منالْیان ببێت و ژێر دەستی پیاو بن

6- سزای پیاویش ماندووبوونە لەژیان

7- خودای گەورە وتی ئینسان ئێستا باشە و خراپە لێک جوودا دەکاتەوە

لەبەر ئەوەی دینەکانی مرۆڤگەری وەک عەلمانیەت و ئیلحاد و فێمێنیزم و لیبرال بەرهەمی ڕۆژئاواین ، کەواتا لە بەرهەمەکانی شارستانیەتی پێشکەوتوی مەسیحی و جولەکەن ! بۆیە نابێ بێ ئاگا بین لە کاریگەری مەسیحیەت و جولەکە تێدا، کاتێ هەندی موسڵمان مەزهەبی بیرو باوەر لە رۆژئاواوە وەردەگرن لەڕاستیدا ئەوان فیکر و باوەرێک وەر دەگرن لەبیری مووسڵماندا نەبووە ! ڕۆژئاوا باوەڕیان

بەوە هەیە لەتەورات و ئینجیل هاتووە وەک ئەو چیرۆکەی ئادەم (واتا نوسراوی تەورات و ئینجیل دەدەنە پاڵ خودا دەسکاری کراو بێت نوسراوەکە یان نا ) ! کەواتا ئەوان لەژێر کاریگەری تەورات و ئینجیلدا ڕێبازەکانیان دەنوسنەوە ، کەواتا ڕێبازەکانی ئەوان کۆمەڵێک تۆوی ژەهراوین کە ئەو تۆوە داره ژەهراویە نەچێنراوە و ڕەگی دانەکوتاوە لەمێشکی موسڵمانی ڕۆژهەڵاتیدا و ئەو چاندنە شەیتانیە لە ژینگەی خۆیدا ڕوواوە و گەورەبووە بەپێی کات هەتا ئەوەی بەرهەم هێنا ئێستا هەیە (عەلمانیەت ، ئیلحاد ، فێمێنیزم ....هتد ) ئەم ڕێبازانەش دەڵێن بەعیلم و زانین ئێمە پێویستمان بەخودانابێ !! دەتوانین خێر و چاکە دیاری بکەین بەبێ پێویسیمان بە خودا چونکە ئیبلیس دارەکەی پێ نیشانداوین !!!! کەواتا ئینکاری کردنی خودا گرنگی نەدانیان پێی لەهۆی زانینەوە نیە ! بەڵکو مەسەلەکە قووڵە خۆ بەشێک فەیلەسووفەکان پێش زانستیش هەر بەوشێوازە ئینکاریان دەکرد دواتر باسی ئەمەش ئەکەین ان شاءالله

بزوتنەوە فێمێنیزمەکان کە دژایەتی دەسەڵاتی پیاو دەکات و دژایەتی خێزان و سیفاتە ژن بوونەکان دەکات وەک منداڵ بوون و دووگیانی وەکْ دژایەتیکردنی خوودا سەیریدەکەن ! و دژایەتی ئەو سزایەی خودا بۆ ژنی دیاریکردووە ، چوون پێیان وایە خودا لەتەوراتدا سزای داوین نابێ برۆینە ژێرئەو بارەوە ! من باسی عەوامی فێمێنیزم ناکەم بە قسەی باق و بریق هەڵخەڵەتاون بنچەی فیکرەکە لەسەر ئەو دژایەتیە خودا و پشتیوانی ئیبلیس دامەزراوە ! بەهەمان شێوە عەلمانیەت و ئیلحاد و ئەوانیتریش !!

لەکۆتایشدا سوپاسی ئیبلیس دەکەن کە داری زانینی خێر و شەری پێیان وت ، یانی پێیان وایە ئیلیس لەپێناو مرۆڤدا سزادراوە و لەرەحمەتی خودا دوورخرایەوە !! بەمانایەکی دیکە ئەو خۆبەزلزانیەی ئیبلیس بەرامبەر خودا پیرۆز رادەگرن !! پێیان وایە بەرگری لە ئێمە کردووە

وەک مرۆڤ !!! بۆئەوە مرۆڤ چاکە و خراپە بزانیت بەبێ پێویستی بەخودا!!

ئیبلیس باجی ئەوە دەدا دارەکەی بەئێمە نیشانداوە!!

ئەوکەسانەش کە باوەری بە یاسای ئیبلیس نیە دەبێ پیرۆزی رابگریت چوون ئیبلیس وای لە ئێمە کرد دینی مرۆڤگەری هەڵبژێرین! کەواتە بەخۆی و بەشەکانیەوە( ئیلحاد و عەلمانیەت و ...)   humanism مرۆڤایەتی ناچاری ئەوەدەکەن ئیبلیس پیرۆز بکەن و دژایەتی خودا بکەن

دینیکی (humanismبوەستە مرۆڤگەری )

شەیتانیە!!

عەلمانیەت=ئیلحادی شاراوەو وێرانکەری زەوی

luciendامەزرێنەری پەرستگای شەیتانی کەسێکە بەناوی " و هەمان کەسیش دامەزرێنەری گرووپێکە بەناوی     "greaves کە گرووپێکی بێ باوەرە بەڵام شەیتان  the satanic temple ناپەرستن بەپێچەوانەی گرووپە شەیتان پەرستەکانی دیکە و کەنیسە شەیتانیەکان .

بەڵام ئەم گرووپە ئیبلیس وەک سیمبوولی هەڵگەڕانەوە  لەدەسەڵاتی خوا و بەها کۆمەڵایەتیەکان(کلتور و ڕەوشتی گەلان)  پیرۆز دەکەن   ، ئەم گرووپە کۆمەڵیک بەها و رەوشتیان هەیە هاوشێوەیە لەگەڵ بەهۆی ئەم لێکچوونەوە بانگێشتی "  ،  humanismڕێبازەکانی کرا بۆ قسەکردن لە  کۆنگرەی دامەزراوەکانی  " greaves لەساڵی 2019 ،  دۆکۆمێنتاریەک لەسەر ئەم  humanism پەرستگایە کرا بەناوی ( ئیبلیس بەرز راگرن یان داهاتوو بۆ ئیبلیسە )

باس له رۆڵی پەرستگا شەیتانیەکە دەکات  بۆ گەیاندنی پەیامی ئازادی بە مرۆڤایەتی و ڕەتکردنەوەی باوەڕی مەسیەحیەت بەشێوەیەکی تایبەت ، تۆڕە مرۆڤگەریەکان و سۆشیاڵ میدیاکانیان لەسەر ئەم دۆکۆمێنتاریە و دامەزرێنی پەرستگای شەیتان (گرەیڤس)  دەڵێن :

( ڕێبازەکانی هوومانیزم (عەلمانیەت و ئیلحاد...)  تەنها هاورێیەک نین بەڵکو هاوبەشێکی دلسۆزی یەکترن پێکەوە لەگەڵ پەرستگای شەیتان لە هەمان سەنگەرن دژی تێگەشتنی مەسیحیەت بۆ خودا

وەک چۆن خودا دەسەڵاتێکی بەزۆر سەپێنراوە بەسەر مرۆڤدا ، ئیبلیس وەک یەکەمین بانگ بێژ مرۆڤی بۆ ئازادی و زانست بانگکردووە ، بۆیە یەکەمین چالاکوانی مافەکانی مرۆڤ  ئیبلیس بووە!  بۆیە دەبێ ڕوونی بکەینەوە کە پەرستی شەیتان بریتیە لەدینی مرۆڤگەری بەدرێژایی مێژوو!! )

بەمانایەکی دیکە ویستی ئیبلیس نەک سرینەوەی خواپەرستیە بەڵکو تێکدانی دابوونەریت و خوەکانی مرۆڤایەتیە ، کۆمەڵگاکان لەژێر ئیبلیس و لەژێر سایەی هومانیزم و عەلمانیەت کۆمەڵگاکان دەبنە یەک کۆمەڵگا جیاوازی نێوان کۆمەڵگایەکی ڕۆژهەڵاتی و کۆمەڵگایەکی ڕۆژئاوایی هەوڵەدەن نەمێنیت مەبەستمان کوالێتی و خۆشگوزەرانی و لایەنی مادی نیە بەڵکو ڕەفتارەکانە ، لێرەشەوە هەوڵەدەن بەها رەوشتیەکان و کلتوریەکان نەمێنی جیهان دەخەنە ژێر چەتری یەک سیستەمەوە کە عەلمانیەتە و یەک زمانەوە کە ئینگلیزە و یەک ڕەوشت و ئەخلاقەوە کە مرۆڤێکی بێرۆح و هەست  و خۆپەرستبێت ! هەموو ڕێبازەکانی ئیبلیس ( عەلمانیەت , ئیلحاد ، فێمێنیزم ، لیبراڵ ، ....)  کار بۆ ئەم شێوازە دەکەن و تا ئێستاش توانیویانە بەشێکی زۆری کارەکانیان بگەینە سەر بەڵام پرسیار لێرە ئەوەیە بۆچی ئەم کۆمەڵگایانە دەکەنە یەک کۆمەڵگا ؟؟؟

لەساڵی 2017 یەکێک لەڕێخراوە ئەمریکیە مرۆڤگەریەکان "گرەیڤس" سەرۆکی پەرستگای شەیتانی بانگێشت دەکەن بۆناساندنی گرەیڤس و ئامانجەکانی پەرستگای شەیتانی پێشکەشکارەکە بەمشێوازە وەسفی دەکات ( گرەیڤس کە وێنای پەرستگا شەیتانیەکەمان بۆ دەکات ئەوان وەک کەنیسە شەیتانیەکان نین ، ئەوانیش رێخراوێکی بێباوەرین بە خودا و خاوەنی کۆمەڵی پرەنسیڤی ئەخلاقی هاوبەشە لەگەڵ ئێمە واتا مرۆڤگەریەکان )

کاتێک پرسیار لە"گرەیڤس " دەکەن لەسەر ئەو خزمەتانەی دەیکا دەڵێ :

(بۆنموونە ئێمە خزمەتێکی زۆر بە منداڵان دەکەین وەک" یانەی دوای قوتابخانە بۆمنداڵان " ئەمە چالاکیەکی بەناوبانگە لە ڕۆژئاوا کەئەویش قوتابیان دوای قوتابخانە دەڕۆنە هەندێک جێگا بۆ زیاتر ئاشنا بوون بەو شوێنانە نزیک سەعاتێک لەو شوێنانە دەمێنەوە یەکێ لەو جێگایانەش قوتابیان دەبەن بۆی ئەم پەرستگایە ئەو دەڵی ئێمە هیچ پەروەردەی دینی پێشکەش ناکەین بەڵکو وایان لێدەکەین ئازاد بن ، هەندێ چالاکی چێژ بەخش و سەرنجڕاکێش ئەنجامەدەین)

مرۆڤگەری و ڕێبازەکان بەگشتی دروست بووە لەسەر ئەساسی ئەوەی مرۆڤ سەنتەرە بۆ گەردوون ( واتا زەوی لەچوارچێوەی حەزەکانی مرۆڤدا کۆدەکەنەوە بریارەکان دەگێرنەوە بۆ مرۆڤ ) بەڵام ئەم سەنتەریە سەرچاوەی گرتووە لەدونیا بینینی خودی مرۆڤەوە و هەستەکانی و پێوەرەکانی ، پێوەری کەسێک کە مرۆڤ سەنتەری بێت ئەوەیە هەرشتێ خزمەت بە حەزەکانی بکا باشەیە هەرشتێکیش خزمەتی نەکا خراپەیە ، بۆیە پێویست بوو بۆیان خوودا لەدیمەنەکانیان لابەن و خوودا نەکەنە سەنتەرێک چونکە ڕوانینێکی دیکە و کۆمەڵێ پێوەری ئیجباری دیکەی جیاواز دروستەکات ( واتا باشە و خراپە بەپێی حەزی مرۆڤ دیاری ناکات خوودا ) بۆیە

تێڕوانینی ئیسلام بۆ پێگەو شوێنی مرۆڤ لەسەر زەویدا بریتیە لە جێنیشینی ، بۆیە تەفسیری رەوشتی مرۆڤ بەسروشت و ژینگە بەتەنها ناکری چونکە خودا دروستی کردووە و رێزی لێناوە و کردوویەتی بەجێنیشن لەسەر زەویدا بەڵام بەم جێنیشینە مانای وانیە مرۆڤ سەنتەری گەردوونە ( واتا شەرعیەت نادەین بەمرۆڤ زەوی وێران بکات لەپێناو حەزەکانی ) ، ڕاستە لەمەرکەزی گەردوونە بەڵام مانای ئەوەنیە خاوەنی ژینگەیە ئەو تەنها جێ نیشینە تێدا

دینی مرۆڤگەری وادەزانی بەها مرۆڤیەکان هەمووی جوان و باشەیە ( پێشتر وتمان ئەوان پێوەرەکانی باشە و خراپە بەپێی حەزەکانیان لێکەدەنەوە نەک یاسایەکی ئاسمانی ) وەک بلێی ئەوەی گەلەکانی لەناوبرد و جەنگی هەڵگیرساند و بۆمبی تەقاندەوە ، ژینگە و ئاوی پیسکردو کەشووهەوای تێکدا و ئاژەڵەکانی قڕ کرد لەپێناو حەزی مرۆڤەکان دەستی داوە ڕاوکردن و بۆچێژ بینین و دروستکردنی جلی زۆر مارکە و پر کوالێتی وەک بلێیت ئەمانە بوونەوەرێکی دیکە جگە مرۆڤ کردبێتی دینی مرۆڤگەری و رێبازەکانی شەرعیەت ئەدەن بەو تاوانانە چون مرۆڤ سەنتەرە لەلایان !! ، مرۆڤ ئەو بوونەوەرەیە کە توانای هەڵسەنگاندنی پێدراوە بۆ شتەکان و توانای وڵام دانەوەی پێدراوە بۆ شتەکان یان وەک نیچە دەلێ ( ئاژەلێکە خاوەنی دوو ڕوومەتی سوورە ! )

کەواتا ئەگەر نرخێکی راستی بۆ مرۆڤ هەبیت ئەوا بریتیە

لەئازادی !یەکێ جیاوازیەکان نێوان ئاژەڵ و مرۆڤدا ئەم چەمکەیە ئازادی لەکردنی چاکە یان خراپە ئازادی لەکردنی سەرنجراکێشترین قوربانیدان یان لە ناشرینترین تاوانەکان

بەهۆی ئەو ئازادیشەوە شەرعیەت بەناشرینترین تاوانەکان دەدات و دەیفرۆشێتەوە بەجوانترین شتەکان !!

مرۆڤگەریەکان و ڕێبازەکانی دەڵێن مرۆڤ جێگرەوەی چەمکی خوایە نەک جێنیشێک لەلایەن خوداوە کەواتا باشە و خراپە لەدەستی مرۆڤدایە چی بوێت بەجوان و چیشی نەوێت بەناشرین وێنایەکات !!!

لێرەیا پرسیارێکیان لێدەکەین ئایا دەکرێت تەفسیری چەمکی مرۆڤ بکرێ بەبی خوودا ؟؟؟ ئایا دەکرێت تەفسیری ئەو زەویە بێ کەم وکورتیە بکرێ بەبێ خوودا ؟؟ ئینسان توانای خراپەیەکی وەهای هەیە هیچ ئاژەڵی نیەتی ! توانای باشەیەکی واشی هەیە هیچ ئاژەڵی نیەتی مرۆڤ ئازادی پێبخەشراوە کامیان هەڵدەبژێرێت ئایا تەفسیری ئەو هەمووە دەکرێت بەیاساکانی مادە؟

یان ئێمە پێویستیمان بە سیستەمێکی دیکەیە جگە سیستەمی مرۆڤ خۆی بۆ لێکدانەوەی ئەم مرۆڤە؟! سیستەمێک لەدەرەوەی گەردوونەوە لێکدانەوە بۆ گەردوون بکات....

عەلمانیەت=ئیلحادی شاراوەو دژایەتی کردنی ئیسلام

لە مانگی یەک لەساڵی 2007 دا یەکەمین ئەنجومەن لەجیهاندا بۆ ئەو کەسانە دروست کرا ئیسلامیان جێ هێشتووە ، بنکەی سەرەکی بۆ کەسانی هەڵگەراوە لە ئیسلام بەسەرۆکایەتی ( مینا ئەحادی) کە مێردەکەیان لە ئێران لەساڵی 1981 لەسێدارەدا و فەرمانی لەسێدارەدانیان بۆ خۆشی دەرچوو بەڵام بەزووی ئێرانی جێهیشت و ڕوویکردە ئەڵمانیا هەتا ئەمرۆش لەوێیە ، ئەم ئەنجومەنەیان بۆ دروستکرد ! , دواتر دوای چەن مانگی هەمان شێوازی ئەنجومەن بەڵام زۆر بەناو بانگتر لە بەریتانیا کراوە بەسەرۆکایەتی ( مەریەم نەمازی ئێرانی ) لەساڵی 2015 دا هەڵمەتێکی ڕاگەیاند کە وێنەی ئەو کەسانەی دەگرد وازیان لەئیسلام هێنابوو لەگەڵ هۆکاری جێهێشتنی ئیسلام .

**دواتر هەمان ڕێخراو بۆ ئەوکەسانەی ئیسلام جێ دەهێلن لەئەمریکا و ئوسترالیا و کەنەدا و بولگاریا و فەڕەنسا ، کۆتاجاریش لەسکۆتلاند ، لەجیهانی ئیسلامیشدا لەپاکستان لەساڵی 2012 ,مەغریب2013 , تورکیا 2014 , باکوری ئەفریقا و ئێران 2016 , ئودرن 2018 , کۆی هەمووی نزیکەی 30ئەنجومەن و ڕێخراو بۆ ئەوکەسانەی ئیسلام جێدەهێڵن کۆتا دانەیان هۆڵەندا 2019 بوو ، ئەمە جگە چەندین دامەزراوە بەناوبانگترینیان بەناوی( کۆماری ئیلحاد) لەلایەن ئارمین وابی ئێرانیەوە دامەزراوە ، و دامەزراوە**

**( لەئیمانەوە بۆ بێ ئیمانی) لەلایەن ( ئیمتیاز شەمسەوە ) لەبەریتانیا دامەزرا کە کەسێکی پاکستانیە ، ژیانی منداڵی لەسعوودیە بەسەربردووە ! ئەم گرووپانە هاوکاری هەر مووسڵمانی لەسەرانسەری دوونیا دەکات کەبیەوی واز لە ئیسلام بهێنی .**

**بۆنموونە : " ڕانا احمد " کچێکی سووری بوو لەسعوودیە دەژیا پەیوەندی بە ( کۆماری ئیلحادەوە کرد) و ڕۆشتە مەکە و نزیک کاعبە وێنەیکی بەدەستەوەیە نوسراوە ( کۆماری ئیلحاد) لەسەری و لەتۆڕە کۆمەڵایەتیەکان بڵاوی کردەوە ، دامەزراوەکەش (کۆماری ئیلحاد ) هاوکاری کرد لەڕاکردن لەسعوودیە بۆ ئەڵمانیا دواتر ڕەنا حیجاب و جلی ئیسلامی لابرد و چەندین چاوپێکەوتن و کۆبوونەوەدا دەرکەوت ، دواتر دۆکۆمێنتاریکیان لەسەری دروستکرد کە چۆن ئیسلامی جێهێشتووە !! گەشتەکەی ڕەنا بۆجێهێشتنی سعوودیە لە دووبەیەوە بۆ تورکیا و لەوێشەوە بۆ کەمپی پەنابەرانی سوری لە ئەڵمانیا بوو ، دوای گەشتنی بە ئەڵمانیا " ئارمین نوابی" هەڵمەتێکی ڕاگەیاند بۆ کۆکردنەوەی پارە بۆ**

**( ڕانا ) لەماوەیەکی کورتدا 5هەزار دۆلاری کۆکردەوە**

**( مریەم نەمازی ، مینا ئەحادی ) بەشێوازیکی تایبەت پەیوەندیان لەگەڵی بەست بۆ یارمەتیدانی !! " ئیمتیاز شەمس " گەشتی کرد بۆ ئەڵمانیا بۆ چاوپێکەوتنێکی لەگەڵی کرد بۆزانینی کێشەکەی و یارمەتی دانی!**

**ئێستا باپرسیارێ بکەین پەیوەندی نێوان ئەم دامەزراوانە چیە بەچیرۆکی بەرازە بچوکەکەوە کە لە ئەوەڵەوا گێرامانەوە بۆتان؟**

**"جۆردانۆ برۆنۆ" نوسەری چیرۆکی بەرازە بچوکەکەیە کابرایەکی قەشەی ئیتاڵی بوو کە دادگای ڕۆما بەتۆمەتی هەڵگەرانەوە لە مەسیحیەت لەسێدارەیدا بەهۆی ئینکاری کردنی سێ خودای و پاکێتی مریەم خاتون و هەڵیانواسی و سووتاندیان لەساڵی 1600 بووە یەکەمین کوژراوی ڕێگای ئیلحاد و بێباووەری بەخودا!!! "مایکڵ سالۆمۆن " ئەم چیرۆکی ئەم کەسەی بڵاوکردەوە سالۆمۆن وتەبێژی فەرمی " دامەزراوەی جۆردانۆ برۆنۆیە" لەساڵی 2004 دامەزار لەلایەن سەرمایەداری گەورەی ئەڵمانی بەناوی "هێربێرت ستیڤن" !**

**ئەم ڕێخراوە دەعمی ماددی ڕێخراوەکانی وازهێنانی لەئیسلام دەکات لەتەواوی جیهاندا ، جگە ڕێخراوی جۆڕدانۆ برۆنۆ چەندین دامەزراوەی دیکە دەعمی مادیان دەکات وەک( دامەزراوەی عەلمانیەتی نێودەوڵەتی ! ، دامەزراوی مرۆیی بەریتانی) دامەزراوەی " جۆردانۆ برۆنۆ" یارمەتی "ڕانا"دا بۆ بەدەستهێنانی ماڵیک و ئۆتۆمبێلێک و ڕەگەزنامەی ئەڵمانی و یارمەتی دەدا لە خوێندنی زانکۆکەیدا ، هەروەها یارمەتی ڕەنایدا بۆ دامەزراندنی**

**( دەستەی پەنابەرە بێ باوەرەکان ) لەئەڵمانیا لەساڵی 2017**

**لە دامەزراوەی ڕانادا هەوڵەدەن بەپێدانی پارە و ژیانی خۆش بەتایبەت بۆ ئافرەتان لەئیسلام و باوەر دووریان بخەنەوە دوای ساڵێک ڕانا توانی 73 پەنابەری سووری هەڵگەڕێنێتەوە لە ئیسلام ،لەساڵی 2018دا ڕانا کتێبێکی بلاوکردەوە بەئەڵمانی بەناوی (ژنان خەونیان نیە لەئێرە ، هەڵهاتنم لەسعوودیە و ڕێگای ئازادیم ) ڕێچارد دۆکینس پێشەکی ئەم کتێبەی نوسیە و چاوپێکەوتنیکی بەتایبەت لەسەر ئەم**

کتێبە لەگەڵی کردووە ، " مایکڵ سۆڵۆمۆن" ئامادەبوو لەکاتی ئیمیزاکردنی کتێب بۆ خستنە بازاریەوە .

خاڵی هاوبەشی هەموو ئەو ڕێخراو و نوسەر و ئەو دامەزراوانەی پشگیری دەکەن و ئەو سەرمایەدارنەی لەپشتی ئەم دامەزراوانەوەن دروستکردنی ( عەلمانیەتە ) لەلایەن کۆمەڵێک سەرمایەدارەوە کە بۆ دەوڵەمەند بوون و زیاتر بوونی داهاتیان بێگومان ئەمەش بەپشتیوانیەکی زۆری نەتەوەیەگرتووەکان و ڕێخراوەکانی مافی مرۆڤ ئەم سەرمایەدارانە بەم چالاکیانە هەڵدەستن ، لەبەجێ گەیاندنی کارەکانیان بۆخۆیان نایکەن بەڵکو بە کەسانی ڕۆژهەڵاتی دەکەن ! لێرەشەوە دەگەینە ئەوەی کە سیستەمێکی بەهێز و پتەو هەیە چ بەرێگای فیکری ( عەلمانیەت و ئیلحاد و.. ) چ بەرێگای زەمینی ( ئەمریکا و فەرەنسا و روسیا داگیرکردنی وڵاتان بەرێگای هێز ) ئەو سیستەمە هەوڵی لەناو دانی دینەکان دەکات و گەلان کۆدەکاتەوە لەژێر یەک چەتری فیکری و حەزو خولیادا بۆ گەیاندنی مرۆڤایەتی بەخاڵێک کەخۆی دەیەوێت...

ئەو سیستەمە کێیە؟

دەیەوێ مرۆڤایەتی بەرەو چ خاڵێک بەرێت؟

سیستەمی جیهانی نوێ بەسەرۆکایەتی دەجال

🎯عەلمانیەت......دینی دەجال بۆ مرۆڤایەتی.

لە 18ی مایۆی ساڵی 2022 (کۆمەڵەی ئەخلاقی تۆپی پێی فەرەنسی ) یاریزانی سەنگالی موسڵمان "ئیدریس غاناغای" بانگ کرد بۆ لێپێچینەوەی لە غیاب بوونی لە یاری هەڵبژاردەکەی(پاریس سانجێرمان) کە بۆ پشتیوانی لە هاورگەزبازەکان کرابوو.. بەهۆی

ئەوەی یاریزانەکە ڕەتی کردەوە کە بەرگی پەلکە زێرینە= قوندەری لەبەر بکات کە پێچەوانەی بیر و باوەری یاریزانە موسڵمانەکەیە داوایان لێکرد لە راگەیاندنەکانەوە دەرکەوێ پشتیوانی بۆ هاورگەزبازی دەربڕێت و تەعویزی ئەو هەڵەیە بکاتەوە و جلە پەلکە زێرینەکە لەبەربکات و وێنەیەکی خۆی لە ئیعلام و تۆرەکۆمەڵایەتیەکان بڵاوکاتەوە

ئەمە تەحەدایەکی ترسناکی هەموو مەفهوومەکانی دیموکراتی و لیبرالیەت و ئازادی تاکە کەس و رەخنەگری بوو لەئەوروپای لیبراڵ و دیمۆکراسی !! هەموو ئەم تەحقیقە بۆ ئەوەبوو وەک ئیحترامێک بۆ باوەرە دینیەکەی پشگیری ئەو گرووپە نا ئەخلاقیەی نەکردووە.

ئەی چی دەبێ گەر رەتی کاتەوە و رەخنە و تانە لەو رەفتارە پیسە بگرێت ..!!

ئەم بابەتە دیسانەوە پرسیارەکان دروستەکاتەوە دەربارەی مرۆڤایەتی و رێزگرتن لەهەموو جیاوازی و باوەرێک لە لای رۆژئاوا کە بە ڕوکەش ڕۆژئاوا هەموو جیاوازیەکی عورفی و عیرقی و فیکری سڕیوەتەوە و ئازادی تاکەکەسی دروست کردووە لەپێناو یەک کۆمەڵگای ئینسانی بۆ دروست بوونی کیانێک لەهەموو لایەنەکانی کۆمەڵگا....

لەگەڵ ئەوەی مەوقیفێکی ئینسانی لەنێو هەموو باوەرە جیاوازەکانی مێژووی مرۆڤایەتی بوونی واتە هیچ دینێک نیە تێڕوانینێکی مرۆڤ دۆستی نەبێت .

بەڵام ئەم مرۆڤگەریە نوێیەی کەلەسەر ئەساسێکی عەلمانی و داپڕاندنی دین دروست بووە وامان لێدەکات پرسیار بکەین

ئایا هەربەراستی عەلمانیەت رێز لە بۆچون و باوەرە جیاوازەکانی دینەکان دەگرێ وەک خۆی دەیڵێت ؟

یاخوود هەوڵ و کۆشش دەکات بۆ گۆرینی باوەرەکانی تر بۆ دینیکی نوێ و دینەکەی خۆی دەسەپێنیت؟

لەوەش گرنگتر ئەو ئیدعا درۆیانەی عەلمانیەت چیە کە باسی ئازادی تاکەکان و یەکسانی رەگەزەکان و نەکردنی جیاوازی لەنێوان باوەرەکان دەکات و بۆچی ئەم بانگەشانە بڵاو دەکاتەوە؟

ئایا ئیدعایەکی راستیە یان ماسکێکی ساختەیە بۆ جوانکردن..؟

دژی دین

ستیڤ لۆ... لەکتێبی مرۆڤگەری..... دەڵێ :

(عەلمانیەکان یان مولحیدن یان لا ادریەکان ئەوانەی کە گومانی هەبوونی خودا دەکەن یان گومانی هەبوونی شەیتان و مەلائیکە ..هتد دەکەن).

سەدەیە پێش ئێستا و بەتەحدیدی لەساڵی 1933

فەیلەسوف "روی وود سیلرز" لەگەڵ هاورێکەی "ریمۆن پراگ" .. بڵاوکراوەیەکی فیکریان بڵاوکردەوە بەناوی human (بەیانامەی مرۆڤگەری) پێناسەی مروڤگەری کردووە manifeto بەوەی " جوڵەیەکی دینیە هەدەفی برین و تێپەرینی دینەکانی پێشووە بەتایبەت ئەوانەی ئیلاهین )

لەساڵی 1973 "ئیدوین ویڵسن و پۆڵ کارتەر "بەیانمەیەکی دیکەیان بڵاوکردەوە کەبەیانامەی دووهەمی مرۆڤگەریە دەڵی: ( پێویستە هەموو دینەکان ڕەتکەینەوە لەناویشیاندا ئەو دینەی کە فەلسەفەی ئەخلاقی وابەستەی دین دەکات )

بەیانامەی سێیەم لەساڵی 2003 بڵاوکراوە

کە کۆمەڵەی مرۆڤگەری ئەمریکی بلاویکردووەتەوە لەژێر ناوی ( مرۆڤگەری و دەرکەوتنەکانی )

"بەشێوەیکی ڕەها باسی گۆرین و لەناودانی هەموو شتێکی دینی دەکات وە لەناودانی هەموو نرخێکی پیرۆزی ئینسان و ئەخلاق "

هەموو ئەم بەیانامانە دوای ئەوە دێن کە لەئەوروپا وابینراوە کە دین بەرپرسی هەموو جەهل و نەزانین و خراپەکاریەکە ئەوەش وایکرد لەناودانی دین یەکێک بێ لەپایەکانی دینی مرۆڤگەری عەلمانی و گۆرینی رووگەی مرۆڤ لەخوداوە بۆ خوودی ئینسان و سورانەوە بەچواردەوری مرۆڤ و رەغبەتەکانی ...

تاکی رۆژاوای مۆدێرنیش لەسەر ئەم ئەساسە عەلمانیە دروست بووە هەربۆیە ئینسانی غەربی مۆدێرن هەموو هەوڵێکی بۆ لەناودانی دینە

**دۆزینەوەی نهێنیەکانی کەون و داهێنانەکان هەموو ئەمانە وای کردووە تاکی ئەوروپی توشی غرور ببێت ئەوەش وایلێکرد  بڵی کاتی ئەوەیە عیبادەتی نەفسم بکەم**

**فەیلەسوفی ئەڵمانی "ئیرناس کەسیناى" دەڵی :**

**( تێروانینی فەیلەسوفەکان ئەوەیە کە  دین پێشکەوتنی فیکر و سەقافەتی دواخستوە لەبەرژەوەندی خۆیدا واتا دین جەهل و نەزانینی دەوی)**

**بەتائکید ئێرناس لەناو ژینگەیەکی مەسیحیدا گەورەبووە بۆیە ئاساییە ئەو تێروانیە نەزانیەی بۆ دین هەبێت چون**

**ئەو ئەوە دەڵی کە بینیویەتی لەکۆمەڵگای خۆیدا ..**

**"ستێڤن لۆو" ئەڵی :**

**(زۆرێک لە مرۆڤگەریە عەلمانیەکان واینابینن دین هەر درۆبێ بەتەنها بەڵکو بە مەترسی دەبینن بەڵکو بەشەر و خراپەکاریەکی زۆر گەورەی ئەبینن .. لەگەڵ ئەوەشدا ئەوان علمانین و قبوولی مەنزومەیەک و سیستەمێکی ئەخلاقی ئەکەن قبوولی ژیانێک ئەکەن لەغیابی خوودادا)**

**ستیڤ لۆ پێی سەیرە کەسانی عەلمانی خاوەن مەنزومەیە ئەخلاقی بن لەکاتێکدا ئەوان باوەریان بەبوونی خوودا نیە چون لەلای ئەقڵی مرۆڤ شتێکی ڕێژەیی نیە بگۆریت بەڵکو سابتە .. وەهیچ ڕەوشتێکیش سابت نابێ گەربێت زاتێکی بەرزتر لەمرۆڤ دیاری نەکات کەئەویش خوودایە .. بەمانایەکی دیکە مرۆڤ سەر دانانەوێ بۆ هیچ یاسایەکی ئەخلاقی کە خۆی دروستی کردبێ .. !!**

**بەڵام کۆمەڵیکی دیکە لەوانەی باوەریان بە دین هەیە و عەلمانین ئەڵین:**

**(دین شەرت نیە باوەڕێک بێ و بڕوای پێبکەیت و ئیماندار بیت یان کۆمەڵی واجباتی دین وەک نوێژ ..هتد بکەیت بەڵکو دین بریتیە لەدادوەری و سۆز و بەخشندەییی لەپێناو دڵخۆشبوونی مرۆڤایەتیدا)**

**عەلمانیەت پێی خۆشە دین لەچوارچێوەی کۆمەڵێک ئەخلاق و رەوشتی جواندا کۆکاتەوە نەک هەموو رەوشتێک بەڵکو ئەو رەوشتەی بە تێروانینی خوودی علمانیەت جوان و چاکە ئەمەش پێکدادانی راستەوخۆ لەگەڵ ئەو دینانە دروست دەکات کە داوای سوڵتەی تەشریعی دەکەن وەک ئیسلام !**

**"تۆماس کراون" لەکتێبی سەدەی عەقڵ ئەڵی :**

**( باوەر بەهیچ کەنیسەیە ناکەم زانستەکەم ڕەتی بکاتەوە .. تەنها مێشکم کەنیسەکەمە )**

**زۆر بەسادەیی لەوە تێدەگەین کە پەیرەوکارانی دینی مەسیحیەت دینەکەیان لەچەن شتێکی سادە کۆکردووتەوە هەر بۆیە زۆر ئاسان بوو بۆیان بنەچەکانی دین لابدەن و فرێبەن... هەربۆیە هەموو دینەکان دەسرانەوە لە بەرژەوەندی دینێک بەتەنها ... ئەو دینەش ئیسلام نیە کە هەموو دینەکانی پێش خۆی رەتکردەوە و هەموو درۆ و هەڵبەستراوەکانی پێشووی رەتدایەوە چون ئیسلام بۆ مرۆڤێک جێگای بایەخ نیە کە بەچواردەوری حەز و رەغبەتەکانی سوربخواتەوە و هیچ گرنگیەک بە ئاخیرەت نەدا مادەم هەدەفی ئەو مرۆڤە دونیایە کەواتا دینەکە دەبێت مرۆڤگەری عەلمانی بێت خوودی مرۆڤەکە خۆی**

**دەپەرستێت و ئەم جۆرە عەلمانیەتە هاوکێشە و وەزعەکان دەگۆرێت لەجیاتی ئەوەی مرۆڤ لەخزمەتی عەقیدە بجەنگێ و ژیان بکات .. عەقیدە و باوەرەکە دەبێت بەخزمەتکاری مرۆڤەکە**

دینێک لە چێشتخانەکەدا

دەڵێیت : david w ehrenfeld .١

(لەودەمەی عەلمانیەکان هێرشدەکەنە سەر دینەکان بەوەی دین کۆمەڵی گریمانەی ناقیاسی و ناعەقڵی هەیە هەمان کات خوودی عەلمانیەت کۆمەڵی گریمانەی ناقیاسی هەیە )

قامووسی ئۆکسفۆردی ئینگلیزی لەسەر مرۆڤگەری عەلمانی مۆدێرن پێماندەڵێت : (عەلمانیەت دینی مرۆڤایەتیە)

لێکۆڵەر "ئیبراهیم رەماح" ئەڵی :

(مرۆڤگەری عەلمانی مافی بەخۆیدا خۆی بەرزکاتەوە ..وە هەموو دینەکان لەناودات لەگەڵ ئەوەی خۆی لەزەویدا دروست بووە بۆیە تەوەقعکراو بوو ببێتە دینیکی نوێ ، هیچ جیاوازیەکی نەبێ لەگەڵ دینەکانی تر)

هەروەها دکتۆر" تەها عبدالرحمان" لەکتێبی شروود مابعد الدهرانیە دەڵی : ( هەموو خەڵکی دیندارن تەنانەت مولحیدەکانیش چون مرۆڤ هەموو کات پێویستی بەدینیک هەیە تاکو ئەو دیوی بەربەستەکە ببینیت ! جا هەرکات ئیمانی بەدین لەدەستدا خۆی بۆخۆی ئیمانێکی نوێ دروستەکات )

"رۆبەرت واگنەری" لێکۆڵەر دەڵی : (گەر عەلمانیەت دین نەبێ ..ئەوا هەر وەک دینیک مامەڵە دەکات ! )

**کەواتە عەلمانیەت گریمانەکانی لە باوەر و  یاساکانی ڕەوشت و میتافیزیا دەکاتە شەرعێک بۆ خەڵکی وەک بڵێی دینیک بێت دانرابێت لەلایەن خوودواوە بەڵام ئەم خوودایەی ئەوان عەلمانییە .. خوودایەک مرۆڤ دیاریکردووە بۆخۆی کە حەزەکان و خۆشیەکانی دەگەیەنیتە پلەی خوایەتی تاکو بەشوێنیدا وێل بێت و بەچواردەوریدا بسوریتەوە تاکو وای لێدێ هەرشتێک مرۆڤ دڵخۆشبکات ئەبێت بەدین وخوودای**

**"جۆن گرای" دەڵێت :**

**( مرۆڤگەری عەلمانی وای دانێت دینەکانی تێپەراندووە و خۆی بەبەرزتر دەبینی لەوان .. ئەو پرۆژە تەنویریەی کە بوو بەهۆی دروست بوونی مەزهەبی مرۆڤگەری عەلمانی و حەز پەرستی مرۆڤ بریتی بوو لە گۆڕینی ئەخلاقی ناوچەیی و عورفی و تەقلیدی و هەموو شێوەکانی ئیمان و باوەر....هەمووی گۆڕدرا  بە ئەخلاق و شتانێکی دیکەی نەقدی ئەقڵی کە دروستکراون بۆ بنیادنانی شارستانیەتێکی مرۆڤی تازەی مۆدێرن !)**

**و ئەو ئەخلاقە عەلمانیەش ئەسەپێنری بەسەر هەموو تاکێکدا لەلایەن ڕێخراوە ئینسانیەکان**

**تاکو وای لێدێت عەلمانیەت دەبێتە باوەر و عەقیدەی یونیسکۆ و نەتەوە یەکگرتووەکان**

**بۆیە عەلمانیەت دەبێتە هاورێ لەگەڵ فیکرێکی تردا وادەرەکەوی دژیبێ بەڵام لەراستیدا بۆ مەبەستێک و ئەنجامێکی باشتر لەگەڵیەتی ...عەلمانەت وادەکات مەسەلەی اخلاق ببێتە شتێکی نسبی و ڕێژەیی ئەوەش وادەکات باشەکان لەناوچن و پێوەرەکان هەڵوەشێنەوە لەبەرژەوەندی ئەوەی مرۆڤ دەیەوێ و حەزی پێدەکات .. هەربۆیە گلەییکردن لەنەبوونی ئەخلاق لەکەسی عەلمانیدا شتێکی بێمێشکانەیە**

**خۆگەر بێتو عەلمانیەت خۆی وەک دینێک بناسێنی و تێگەشتن و پێوەرەکان دابنێت ئەوا یەکێ لەپێوەرە سەرەکیەکانی باسکراوە لە کۆتا بەیانامەیان... ئەوەش بەها رەوشتیەکانی مرۆڤە کە پێیان وایە سەرچاوە دەگرێ لە پێداویستی و بەرژەوەندی مرۆڤەوە .. ! کەوایە عەلمانیەت جورئەتی ئەوەی نییە بەو راشکاوییە خۆی نیشانی مرۆڤایەتی بدا بەڵکو دەبێت ببێتە هاورێی دینەکانی دیکە تاکو لەسەر حسابی ئەو هاورێیەتیە و بەنهێنی خۆی بەرەو پێشبات ..**

**[[ئەوەش واتا معیاری یەکەم بۆ ئەخلاقی کەسی علمانی ئەوەیە هیچ پێوەرێک بۆ رەوشت و ئەخلاق نیە لەژیاندا ]]**

**بینائەن لەسەر ئەوە عەلمانیەکان وای ئەبینن کە ئەخلاق لەسەر دین دروست نابێ و ئەخلاق لەسەروی مادەوە نیە چون لای ئەوان ئەخلاق نرخی نیە و بوونی نیە بەڵکو سروشت و ئەزموون فەرزی کردووە بەمانایەکی دیکە پێیان وایە بەرژەوەندیەکانە وای لەمرۆڤ کردووە ئەخلاق دروست بکات بەم شیوەش ئیلحاد و ئەخلاق رەبتەبن بەیەکەوە یان بەمانایەکی تر نێوانێک بۆ عەلمانیەت و ئەخلاق دروستەکەن ...**

**بەم شێوازە ئینسان شوێنی دینی گرتەوە تاکو مرۆڤ خۆی بوو بە سەرچاوەی کۆتایی بۆ چنگ کەوتنی ئەخلاق هەروەک لۆک فێری دەیلێت...**

**هەربۆیە دین و ئیمان نابنە پێوەری جیاکەرەوە بۆدیارکردنی ئەوەی چی شتێک ئەخلاقیە لەلای عەلمانیەت**

لەتەنیشت مەوقیفی ڕوونی دینی و شەرعی لەم باسەدا .. بەڵام مەوقیفی عەقڵی ئینسان هەرگیز نسبیەتی ئەخلاق بەباش و چاکە لەقەڵەم نادات...!

خۆگەر وابێ پیاوکوژەکانی مێژوو و زاڵم و دڕندەکان بۆچی دەبنە کەسێکی خراپ ! هیتلەر بۆ دەبێتە کەسێکی خراپ ! یان ستالین..! هەموو ئەوانە کەسانێک بوون پیاوخراپیەکەیان بۆ چووەتە سەر چ پێویستیان بەرەوشت و رێز بووە ..!

"نوسەری چینی یۆن چانگ " ئەڵی :

( گەر خوودایەکت نەبوو لەژیانت ئەوا خووداى تۆ سیستەمی کۆمەڵگایە و ئەگەر ئەو کۆمەڵگایەش سەراوژێر ببێتەوە ئەوا سیستەمی ئەخلاقی تۆش لەگەڵ کۆمەڵگادا سەرواژێر ئەبیتەوە ..!!)

"جۆرج باتۆنی یاسا ناسی" ئەمریکی ئەڵی :

(تاکە رێگا بۆ گەشتن بە پێوەرێک و معیاریکی موتڵەق و کۆتایی بۆ دانانی یاسایەک ئەویش دان نانە بەوحی ئاسمانی بەوەی یاسا بێت )

تەنانەت یەکێک لە فەیلەسوفەکانی نوێگەری و تەنویری کە عەلمانیەتی ئەمرۆ زۆر باسی ئەکەن ئەویش "جۆن لۆکە"  ئەڵی :

( دروست نیە لێخۆشبوون لەو کەسەی ئینکاری بوونی خوودا دەکات چونکە[ پەیمان و سوێنخواردن و عەهد ] پەیوەندی نێوان تاکەکانی کۆمەڵگای مرۆڤ رێکەخەن و ئەوانەش هیچ نرخێکی نیە بۆ کەسی مولحید .. جابۆیە هەموو ئەو ئالاتانەی کۆمەڵگا بەکاری دینن بۆ پەیوەندی نیوانیان بەبێ بونی خوودا و سەرچاوەیەکی جێگیری ئەخلاقی هەمووی ئەتوێنتەوە !!! )

واتا به نەبوونی پێوەریکی دروست و سابتی ئەخلاقی و دینی  هەموو نرخێکی مرۆڤ و مرۆڤایەتی لەناوەچێت لەکاتێکدا  کە ئەونرخە بەردەوام عەلمانیەت بەدوایدا وێلە بەڵام خۆی لەناوی دەدات !!

ئەوان وادەزانن بە لادانی هەموو پێوەریکی ئەخلاقی دەگەنە نرخی راستی مرۆڤ بەڵام نازانن بەبێ رەوشت و ئەخلاق مرۆڤ مادەیەک و هیچی تر ... هەر بۆیە  یاسا ئەخلاقیە گەورەکان دیارنامێنن لەپێش چاو حەزەکانی تاکی مرۆڤ چونکە هەموو تاکێک حەزە تایبەتەکانی خۆی ئەپەرستیت گەرچی لەسەر حسابی براکەشی بێت !! یان بەهۆی ئەو حەزەیەوە خێزانەکەی لێکهەڵوەشێتەوە یان کۆمەڵگاکەی داتەپێ .. !
هەربۆیە موومکین نیە لەکۆتایدا دەبێ سنوریک بۆ حەز و ویستە خراپەکان دانرێت سنورێک ببێتە جێگای قەناعەت بۆ هەموو تاکێکی مرۆڤایەتی ، سنورێک لەسەروی مێشکی ئادەمیزادەوە دانرابێت ..

هەربۆیە" دێڤد هیوم"  ئەم سیفاتەی مرۆڤ تەئکید دەکاتەوە و ئەڵی:
(عەقڵی من نکۆڵی لەوەناکات کە پێم باشترە هەموو زەوی کاول ببێ بەس پەنجەیەکی من نەروشێت !!)

عەلمانیەت.. چەکی پیاوی سپی ئەوروپی .. !!

"دێفد ئاتتنبرا" دەڵی :
(بوەستن لەخواردن پێدان بە نەتەوەکانی وڵاتانی جیهانی سێهەم بۆکەم بوونەوەی رێژەی دانیشتوان)

لەیەکی نوسینەکانی بەناوی " لوتبەرزی عەلمانیەکان " بەراشکاوی "نۆرم ئاڵن" ئەڵی :

( زۆرێک لە مرۆڤە عەلمانیە سپی پێستەکان باوەریان وایە کە شارستانیەتی رۆژئاوا معیار و پێوەری ئاڵتونی عەقڵانیەتە  و بروایان وایە ئەوان پاکن لەهەر جۆرە رەگەزپەرستی  و توندرەویەک ، و باوەریان وایە ئەوان مێژووی رەشی خۆیان جێهێشتووە و لەدەرەوەی کاریگەری سلبی پاشماوە مێژوویەکانیانن ..!!)

ئەو پاشماوەی ئالین مەبەستیەتی پەیوەندی بەمێژووی نەژادی ئەو رێخراوەیە کە بەرگری لێکات

"رێخراوی ئەمریکا -ئەفریقا لەپێناوی ئینسانیەت "

ئەو ئەفریقیانەی کە پیاوی سپی پێست گواستیانیەوە لەنەتەوەکانی خۆیانەوە بەروتی و کۆت و کەلپچە لەدەست بەدەریادا بۆ ئاوادانکردنەوەی موستەعمەرەیەکی نوێیی ئەمریکی ... مێژووی رەشیان شاهیدی هەزاران چیرۆکی وەحشی گەرایە بەرامبەر  هندیە سوورەکان و ئەفریقیەکان

یەکێ لەتۆمارە مێژوویەکاندا باسی یەکی لە سەربازگە فەرەنسیەکان دەکا لەدۆمێنیکان لەناوچەی کاریبی کە نامەیەکی ئاگادارکردنەوەیان نارد بۆ سەرۆک رامیل کە سەربازگەکە هیچ خۆراک و زەخیرەیەکی نیە بۆ تێرکردنی سەگەکان ئەوانیش وڵامیان داوە بەوەی تێریان بکەن بەگۆشتی رەشپێستەکان ئەمە مێژوو بوو بەڵام ئەوەی ئێستا زور روون و وازحترە کە "ریچارد دۆکینز" گەورە مولحیدی رۆژئاوا پێمان دەڵی : ئەوانەی سنورەکانی مافی مرۆڤ دەبەزێنن  و رەگەز پەرستن لەجیهانی رۆژئاوا  لەگەلانێکەوە هاتون کەخاوەنی مافی مرۆڤ نەبوون هەرگیز

هەربۆیە ئەبێ مەمنون و سەرشۆری بەردەم پیاوی سپی بن!

فەیلەسوفی نەمساوی "پۆل فیلابان" ئەڵی :

( کەسانێکی ئەورووپی هەن وابیرەکەنەوە ئەوان مرۆڤایەتیان خۆشەوێ بەڵام ئەم خۆشەویستیە خێرا دەپووکێتەوە کاتی هەندێ دەموچاوی تایبەت دەبینن لەنێو هەندێ جەستەی تایبەتدا وەک ئەو دەمەی رەشپێستەکان دەبینن ..!)

هەربۆیە ئەورووپیەکان لەمنداڵیەوە فیری ئەوەدەکرێن ئەوانسەنتەرن بۆ مرۆڤایەتی و گەردوون بەو مانایەی جیهان لەچواردەوی تاکی ئەورووپیدا دەسوریتەوە !! لەخزمەتی ئەودابێ !!

بۆیە بیرمەندی میسری "عبدالوهاب مسێری" ئەڵی:

( کاتی تاکی ئەورووپی باسی سەردەمی تاریکی یان سەردەمی داهێنان دەکات تەنها باسی سەردەمی خۆی دەکات وادەزانی مێژوو هەرخۆیەتی و جیهان لەدەرەوەی هاوکێشەکەیە .. یان جیهان لەچاوەروانیدا وەستان بووە تاکو تاکی سپی پێستی ئەورووپی دەست بکات بەداهێنان و بەپێشخستنی )

بەرونی سەنتەربوونی پیاوی سپی دیارە لە ململانێەکانی رۆژئاوا بەرامبەری گەلانی دیکەی زەوی تەنانەت ئەو رەگەزپەرستیە گەشتە بەرادیەک کە وای لە پاشای بەلجیکی "لیوبۆڵدی دووەم" کرد کە باخچەیەکی مرڤی کردەوە لەجیاتی ئاژەڵان کۆیلە کۆنگۆلیایەکانی تێدا نیشانی پیاوی سپی دەدا وەک چۆن ئاژەڵیک نیشان دەدرێ وە بینائەن لەسەر ئەم مەرکەزیەی پیاوی سپی دووبارە "ویلیام کاڤانۆ "وایەبینیت

کە تاکی ئەوروپی توندرەویەکەی رووبەرووی کەسی بەرابمەر ئەکاتەوە بەحوجە و بەڵگەی عەقڵانی و پاراستنی ئاشتی و ئازادی ... !

بەڵام توندرەویەکی دیکە کە بەرگریە لە نەفس و خاکی خۆت دەبێتە توندیەکی هەرەمەکی و ئاژەڵی !!! دەبیتە تیرۆرست و ئیرهابی ! هەربۆیە رۆژئاوا وایدەبینن کە مەجبوورن ئەو خەڵکە بتەقیننەوە بەساروخ و بۆمبەکانیان تاکو ببنە دیموکراتی و بەئاشتیانە تەسلیمی پیاوی سپی ببن !

سەیرتر لەهەموو ئەوانە رەشنوسی ئیعلام و راگەیاندنی جیهانی بۆ مافەکانی مرۆڤە کە لە 10ی دیسەمبەری ساڵی 1948 دەرچوو زۆربەی وڵاتانی جیهان بەشداریان نەکرد لە دانانی ئەو رەشنوسەدا چونکە لەلایەن پیاوی سپیەوە داگیرکرابوون ئیتر چۆن بەشدار بن !!

هەر لەودەمەشدا هەموو یاسایەکی ئیعلام لەبەرژەوەندی پیاوی سپی ئەورورپی نوسراوەتەوە !!

"ریمۆن ئاروۆنی " زانای کۆمەڵناس دەڵی : ( راگەیاندنی هەر مافێکی مرۆڤ لەکوتایدا گوزارشت و تەعبیری نیزامێکی سیاسی یان کۆمەڵایەتیەکی دیاریکراوە کە چینێک یان شارستانیەتیەکی تایبەت ئەیەوێ فەرزی ئەو مافانە بکات بەسەر هەموو جیهاندا )

بەم شێوازەیە عەلمانیەتی رۆژئاوا کە رووی خۆی جوان دەکات بە قسەی باق و بریقی وەک سۆز و مهرەبانی و خۆشەویستی .. لەولاشەوە هەموو یاساکانی رەوشتی و ئەخلاقی خۆی دەسەپێنی بەسەر هەموو گەلانی دوونیادا !

**لەلایەکی دیکشەوە دینەکان تۆمەتبارەکات بەتوندرەوی و شەڕ و کوشتن**

**لەکاتێکدا خۆی دینیکی بۆخۆی دروستکردووە کە هیچ شتێک نابینی جگە یەک ڕەنگ نەبێ**

**وەهیچ نەتەوەیەک نابینی جگە نەتەوەی ئەوروپی نەبێ !**

**دینێک بانگی شوێنکەوتوەکانی دەکات بۆ پەلکەزێرینە...**

**دینێک مرۆڤێکی ڕەشپێست کە لەبرسا مردووە و خاکەکەیی داگیرکراوە سامان و مێژووەکەی دزراوە نابینیت**

**دینێک ئیجباری یاریزانێکی ئەفریقی دەکات قێزەونترین ڕەفتار ئەنجام بدات**

**لەولاشەوە باسی ئازادی تاک و نەتەوە و عرقدەکات**

**ئەوە ئەو دینە کوێرەیە کەبانگمانی بۆدەکەن شوێنی کەوین پێش شوێن کەوتنمان بۆ دینەکانی دیکە**

**ئەوە دینی عەلمانیەتە**

# ١٨ _ گەردونێکی دروستکراو

📖(ئیلحاد)
گەردوونێکی دروستکراو.

(هەرکاتێک لێکۆلێنەوەیەک لەسەر گەردوون دەکەم بەڵگەی زۆر گەورەم دەس دەکەوێ کە وەک بڵێیت گەردوون بەشێوازێک دەیزانی ئێمە بەرێوەین ! )

فریمان جایسۆن ( فیزیاناسی بەناوبانگی ئەمریکی)

دەگێرنەوە پیاوێک هاتە لای جەعفەر کوری محمدی سادق رەزای خوای لێبێت پرسیاری لێکرد بەڵگە چیە لەسەر خوودا؟ باسی زەوی و گێرانەوەکان و ناوەڕۆکەکانی کتێبەکانم بۆ مەکە ..!

وڵامی داوە وتی ئایا گەشتت کردووە لەدەریادا؟

پیاوەکە :بەڵی

جەعفەر :ئایا با و بارانی توند لێتانی هەڵکردووە هەتا ترستان لە نقوم بونی کەشتیەکە لا دروست ببێ؟

پیاوەکە : بەڵی

جەعفەر : ئایا قەت هەبووە ئومێدت بە کەشتی و دەریاوانەکان نەمێنی لەتاو بەهێزی شەپۆلەکان ؟

**پیاوەکە: بەڵی**

**جەعفەر : ئایا دەروونت هیوایەکی هەبووە جگە ئەوانەی چواردەورت کە کەسێک تۆ رزگار دەکات؟**

**پیاوەکە ؛ بەڵی**

**جەعفەر : دەی ئەوەیە خوودا ! دەی ئەوە خودایە !**

**ئەو پیاوەی داوای بەڵگەیەکی لۆژیکی ئیمانی کرد دوور لە بەڵگە گەردوونیەکان و دروست بوونی جیهان ، سەرنجی ئەوەی نەدابوو کە فیترەتی باوەری بەخوا هەیە بێ ئەوەی خۆشی بزانی بەو هەستەی ! لەمێشکیدا گومانی هەبوو بەڵام فیترەتی یەقینی بە وجودی خودا کردبوو**

**ئیماندار دەزانی خودا کارزان و کار بەرێخەرە و بەبەزەیی و بەرەحمە ئایا گەردوون و ئاسۆکانی دەتوانن ئەم سیفاتانەی خوودا بسەلمێنن ؟**

**گەردوون دروستکرا یان لەخۆوە دروستبوو ؟!**

**بیرکەوە هاورێکەت کەمێ خۆڵی لە پێشماڵتان هەڵگرت و بردی دواتر بردی بۆ شوێنی نازانی کوێیە و پێت نالێ دواتر دەڵێ بیدۆزەوە بۆم ئایا پێت وایە دەتوانی بیدۆزیتەوە !**

باشە باواز لەو نموونە سادە بێنین با بڕۆینە ئەمریکا باکور بەهەندێک پارچە دیناری کانزایەوە هەمووی یەک شێواز گریمانەی ئەوە بکە کە کیشووەرەکە بە دراوی کانزایە داپۆشین بەتەواوی لەنزمترین شوێنەوە تا ڕووی مانگ بە دراوی کانزایی داپۆشین ، پاشان گریمانەی ئەوە بکە یەک ملیار کیشوەری دیکە بەهەمان شێوەو قەبارەی ئەمریکای باکور بە دراوی کانزای داپۆشین لەنێو هەموویان من دراوێکی سوور دەشارمەوە دواتر چاویشت دابخە و دراوە سوورە کانزایمان بۆ دەربێنە لەنێو ئەو شاخە دراوانەدا !

پێت وایە موستەحیلە شتی وا ؟ باشە دەی وەرە بۆ شیکاریەکی سادە .

ئەگەری دەرهێنانی تۆپێکی سوور لەنێوان سێ تۆپی سپیدا چەنە ئەگەرەکەی ؟

- 4/1 بێگومان

بابرۆینەوە بۆ ئەو خۆڵەی هاورێکەت شاردیەوە ئەگەری دۆزینەوەی تۆ بۆ دۆزینەوەی ئەو خۆڵە یەک بەشە لە 10بەتوانی 19 بەش واتا یەک ئەگەر لەکۆی 10000000000000000000 ئەگەر !!!

بەڵام ئەگەری دەرهێنانی دراوە سورەکە یەک ئەگەرە لەکۆی 10 بەتوانی 37 !!

دواتر بیرکەوە ئەگەری دروستبوونی ئەم گەردوونە گەورەیە بە سووتفە بەپێی زانای بیرکاری ناسی سویسری "چارلز بۆگینگوای" یەک ئەگەرە لەکۆی دە بەتوانی 160 ئەگەر !!

**واتا یەک ئەگەر لە کۆی ژمارەیەک کە نە ناوی ئەو ژمارەمان ناوە و نە بیرمان لێ کردۆتەوە و نە بەخەیاڵماندا هاتووە ! لەراستیشدا قەت بە ئەگەر نایتە ئەژما ئەم گریمانە چون رادە و ڕێژەی سەرەکی ئەوپەری هەبوونی ئەگەرەکان**

**1×10 بەتوانی 150 ! ئەمەش ژمارەیەکە کە مستحیلە واقع پشت راستی بکاتەوە ! ئەی چی ئەگەر توانی 160 بێت !!!!**

**ئایا بێزاری کردی شیکاریەکان !**

**بیرکەوە لەوەی ئەم گەردوونە فروانە زاتێک دروستی کردووە و چاودێری کردووە هەتا تۆ لەدایک بیت و بۆت شیاو بیت سروشتەکە !**

**تۆش بەزانینی ئەم دقە بەرزە لە چاودێری کردنە باوەر دێنیت کە بەراستی ئەو کارەکانی بۆت رێخستوە بۆ هەبوونت !**

**ئەمە ئاسانترین رێگایە بۆ زانینی ئەوەی گەردوون دروستکاریکی هەیە بێگومان !**

**با سەیری ناوەوەی ئەم گەردوونە بکەین  ئایا پێمان ئاشنا دەکا دروستکارەکەی !؟**

**بەسەیرکردنی لایەنێک لە ژیان دەبینینەوە کە ئەم گەردوونە رێخراوە بەکۆمەڵی یاسا کە رێکیانی خستووە کە ئەو رێکخستنەش وای لە ئێمە کردووە لە رووداوەکان تێبگەین و زانستەکان دابهێنین ! ئەو زانستانە و رێخستانە ئەنجامی دروستکارێکی کارزانە هەر ئەمەش پێمانی وتووە زانای فیزیایی بەناوبانگ "بۆڵ دێفیز "**

( یاساکانی گەردوون زۆر پەیوەندارن بەیەکەوە بە ڕێژەیەک کە بۆنموونە گۆرانیکی زۆر بچووک لە پەیوەندی نێوان کارۆموگناتیسی و کێشکردن گەر ئەو گۆرانە زۆر کەمیش بێ بەڕادەی 1×10 بەتوانی 36 بەسە بۆ ڕۆچونی ئەم گەردوونەی ئێستە لەسەرین بەتەواوی ! بۆیە هەر وردەکاریەک لەم بونەدا درێژە بە مەبەستێک دەدا بۆئەوەی بمێنیتەوە بەبێ هیچ سوودفەیەک و هاکەزایی و گرژیەک! )

دەڵی : ( history of time📖" ستیڤن هۆکینگ" لەکتێبی راستیەک هەیە کە بەچاو دەبینرێت ئەویش ئەوەیە کە جێگیربوونی ئەم ڕێژە دەقیقانە لە گەردوون بەوێنەیەکی زۆر ورد جێگیرکراوە بۆ ئەوەی پەرەسەندنی ژیان دروست ببێت بۆنموونە بارگەی کارەبایی ئەلیکرتۆن کەمێک جیاواز بوایە لەوەی ئێستا هەیەتی ئەوا ئەستێرەکان توانای سووتاندنی هایدرۆجین و هیلیۆمیان نابوو یان تەقینەوەیان نەدەبوو ئەمەش دەبووە هۆی لەدەست دانی وزیەکی زۆر کە راستی دروستبوونی زەوی بەتەواوی دەگۆڕی ، دواتر سەیری بیگ بانگ بکە کە گەردوونی لێیووە دروست بووە ، خەیاڵبکە کە ماوەی فروان بوونی ئەم گەردوونە بچوک تر بایە لە ئێستا بەرێژەیەکی زۆر کەم بۆنموونە یەک لە سەد هەزار ملیۆن ملیۆن بەش ئەوا گەردوون داروخا پێش بوونی ئێمە بەڵام گەر بەهەمان رێژە فروانتر بوایە ئەوا ئێستا بۆش و بەتاڵ دەبوو ، ئەمەش هۆکینگی توشی سەرسورمان کردووە سەرەرای ئیلحادەکەی دەڵێ : زۆر قورسە بۆمان لێکدانەوە بۆ ئەوەی بکەین بۆچی دەبوایە گەردوون تەنها بەوشێوازە دەستی پێکردایە ، زۆر بەئاسانی دەکرا لابدا لە رێرەوی و ماڵەکەمان دروست نەبایە بەڵام ئیلا دەبێ بلێین ئەمە کاری خودایە بەهۆی نیازی بەدروستکردنی بوونەوەرێکی وەک ئێمە )

ئێمە لەپێش بەڵگانێکی زۆر گەورەترین لەوەی چاوەکان نەیبینن و بێ ئاگابن لێی ، بەڵگەکانی خودایەک کە چاودێری گەردون دەکات و کاری

وردترین شتەکان ڕێکدەخات  ئەوانەی مرۆڤ درکیان پێ ناکات ! ئەم گەردوونە لەتەمەنی پێشووتریدا کە بەشێک دەڵێن 13 ملیار ساڵە هەر یەک کەمیش لەو ڕێرەوەی لاییدایە ئەوا ماڵی مرۆڤایەتی دروست نابوو ئاخۆ چی شتێ بەتوندی چاودێری کردووە و نەیهێشتووە دەربچێ لەو ڕێرەوە !  ئەگەر و گریمانەی دروست بوونی گەردوون لەخۆیەوە وەک ئەوە ئەم نموونەیە تۆ یەکەم کەسبیت لەگەڵ تیمێکی سەر زەوی بۆیەکەم جار دابەزیتە سەر هەسارەی موشتەری بۆیەکەم جار پێ دانییتە سەری بۆ کەمێ دەرۆی پاشان شوێن پێیەک دەبینی و هەتا دەتگەیەنەتە ئەشکەوتێک و دواتر دەڕۆیتە ژوورەوە ئایفۆنێکی 13 دەبینی لەسەر سایتی نێتفلێکسە و لەسەر نوێترین فیلمیشە کە بڵاوکراوتەوە ! لات وایە کەسێ پێش تۆ لێرە بووە بەڵام دواتر پێت دەڵێن ئەم ئایفۆنە لەخودی موشتەریەوە دروست بووە هەر لەخۆیەوە مادەکان یەکیان گرتووە و پێک لکاون و شتەکان دروست بوون !!

هەروەکو "دێڤس" دەڵی ( ئەو قسانەی دەڵێن ژیان هاوسەنگی خۆی پەیداکردووە لەسەر هێلی تیژی چەقۆ ، زۆر بێ بایەخن لە ڕوکەشدا چون هیج چەقۆیەک نیە بەو ڕادە تیژە لەگەردووندا ! وە قەت بەوشێوازەش جوان نابێ ئەو چەقۆیە!! )

مەبەست لەتیژی چەقۆ ئەو ڕێرەوە گەردوونیە کە بەهۆیەوە زەوی دروست بووە و یەک چرکەش گەردوون لێی لانەداوە !

جوانیەکان دەمبات !

لەبەیانیەکی گەرمدا خۆر دەداتەوە لەسەر کانیاوێکی ڕۆشن لەچواردەورت سەوزایی دەبینی بەگوڵی ڕەنگاو ڕەنگ ڕوپۆش بووە دادەنیشی دوای شەوێکی بێدەنگ ڕۆژ هەڵدێت دەنگی باڵندەکان دەبیستی ، هیچ دەنگێک نیە تێکی بات لێت سەیری ئەمانە دەکەی و

دەبینی و دواتر پشت دەدەیە دارێکەوە و سێبەرەکەی دات دەپۆشی و دواتر دەڵێیت چەن گەردوونێکی جوانە ! "کلارک نۆت" لاهوتی دەڵێ ( باشترین رووبەروو بونەوەیک بۆ کەسانی ئیلحاد و بێباوەر جوڵاندنی مێشکیانە بەبینینیکی ڕوونتر  بۆ جوانیە سروشتیەکان کە خوا دروستیکردووە نەک بەشێوازی بەڵگە عەقڵیەکان ! )

هەروەها فەیلەسوف "ئیلین دیسناک" وای دەبینی باشترین ناوێک بۆ یان مرۆڤی جوانی   homo anestheticsمرۆڤی ژێر بریتیە لە چون هەستکردن بەجوانی یەکێکە لە گەورەترین پێکهاتە دەروونیەکانی مرۆڤ ، جوانی کاریگەری گەورەی هەیە لەسەر بریارەکانی مرۆڤ...

ئایا دەکرێت جوانی گەردوون بەڵگەیەک بێت بۆ دروستکردنی لەلایەن دیزانەرێکی زیرەک و چاودێری کردنیکی وردی ؟

یان وەک "دێڤید هیوم "دەڵی : جوانی سیفاتێک نیە لە شتەکان خۆیاندا بەڵکو سیفاتێکە لە عەقڵی ئەو کەسەی دەیبینی و بیری لێدەکاتەوە ، واتا ئەوە سیفاتێکی دروست بووە لەکەسی بینەردا نەک راستیەکی واقعی لەشتەکە خۆیدا ..

بەبوونی هەستێک لەلای مرۆڤ بەناوی "جوانی"  ئەمە وامان لێدەکات بزانین کە جیاوازە لە خودی ئێمە، ئێمە و جوانی یەک نین جوانی ئێمە دەبا بۆ زۆر شت  ، هەستێکی جێگیرە و مسۆگەرە بۆخۆی جوانی ..

گوێ لە جریووەی باڵندەکان بگرە ، بەشێک لەشارەزایانی تۆنی مۆسیقا دەڵێن رادەی وروژانی هەستەکانمان بۆ خوێندنی باڵندە ، دەگەرێتەوە بۆ توانای ئەو باڵندانە بەخوێندنی بە تەکنیکێکی بەرز لەرێکخستنی

دەنگەکان و دەرکردنی ، هەتا ئاوەزدان "ئۆلڤێر مسیان" چەن پارچەیە مۆسیقای لەسەر پیانۆ بڵاوکردۆتەوە بەناوی کەتالۆگی باڵندە ، ئەم هەموو جوانیە سەرنجمان راکێشی بێ ئەوەی بە خۆمان بزانین هەتا بیرکەینەوە لە دروستکراوەکانی خوا بەڵام ئایا ئەم هەموو تەکنیکە وردانە بۆ ئێمە فەراهەمکراوە؟ گەردوونێکی زۆر گەروە و رێک و ورد بەهەر ڕادەیەک هەستی پێکەی لەهەمان کاتیشدا جوان و سەنجراکێش ، ئایا ئێمە شایەنی ئەوەین ؟

لعلهم يتفكرون

هەندێک وای دەبینن کە مرۆڤ لەوە بێ بایەخترە کە گەردوونێک بۆ خزمەتی دروستب ببێت بەڵکو پەنادەبەنە بەر لێکدانەوەی تر بۆ دروست بوونی دەڵێن ئەمە رێخراوە لەلایەن وزەی گەردوونەوە بۆ بونەوەرێکی بێ سوود ، ئەم دروست بوونە بە بەفیرۆدان دەبینن لەلایەن گەردوونەوە ئەمە سەرەرای ئەوەی مرۆڤ تاکە زیندەوەرێکی زیرەکیشە! دەڵێن بەفیڕۆ دراوە وزەی گەردوون ، ئەم بیرکردنەوانەیان لە تێڕوانینێکی هەڵەیانەوە دێ بۆ خوودا ، چون ڕەخنەگر هەست بەکەمی نەفسی خۆی دەکا و تێڕوانێکی ئابووریانە بەکار دێنی بۆ خودا ، بەڵام خەزێنەکانی خوودا وەک باواڕداران دەیبینن کەم ناکات ئەوەی بەسەر مرۆڤ جێ بەجێ ئەبێ بەسەر خوودا جێ بەجێ نابێ ...

وە ئەگەر خوای گەورە ملیۆنان جار زیاتر لەمەخلووقی ئەم گەردوونە دروست بکات و ملیۆنان جار بچوکتریش بن هیچ لەخەزێنەکانی کەم ناکات هەروەها نرخی شتەکان بە قەبارەکەی نیە چون پارچە ئەڵماسی بچوک بە قەبارەیەکی بچوک لە شاخێک خۆڵ زیاتر بەهادارترە کەواتە چی ڕێگرە لەوەی نرخی مرۆڤ لای خوای گەورە بە ئاستێکی بەرز نەبێ؟! ، ئەمە رێخستنێکی لۆژیکە ، هەر کەس هۆکاری دروست بوونی گەردوونی زانی بەدەستی دروستکاریکی زیرەکی کارزان دواتر

لێکۆڵینەوەی لەوەی تیدایە و سروشتەکەی کرد دواتر ڕێخستنە وردەکانی بینی لەهەر پارچەیەکیدا بینینی فروانەبێت بۆ ئەم سیستەمە جوانە ، دواتر دڵەکانی ڕوون دەبنەوە بەم جوانیە ورد دروستکراوە لە خودایەکی کارزانی میهرەبان ، ئەم گەردوونەی بۆ ڕێک خستووە پێش هاتنی دواتر ئارامی و ڕەحمەتی بەسەرا رژاند دواتر دڵەکەی باوەر دێنی و مێشکی ڕێگای راست دەبینیتەوە و مێشکی ئارام دەبێ دوای ڕۆشنبوونەوەی پێش چاو و دڵی و سووجدەیەک دەبات و دەگاتە ڕاستی بوونی لەسەر زەوی ...

سَنُرِيهِمْ آيَاتِنَا فِي الْآفَاقِ وَفِي أَنفُسِهِمْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ الْحَقُّ ۗ أَوَلَمْ يَكْفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ

# ١٩ _ زانست لە نێوان خورافات و ڕاستیدا

📖زانست لەنێوان راستی وخورافیات.

لەم سەردەمەدا هەرکەسێ ناوی زانست بهێنی ئەوا دەکرێ
یان زانستی سروشتی فیزیا و کیمیا و ئەحیا "science" مەبەستی
..هتد بەڵام ئەمە کەمکردنەوەیە بۆ پێناس و مێژووی زانست ، زانست
بەمانا زمانەوانیەکی واتا زانین بەشێوەکی گشتی لەهەموو بەشەکانی
وەک زمان و کۆمەڵگا و دەروونی بەڵام لەم سەردەمە هەرکەسی
یان زانستی سروشتی science باسی زانست دەکات مەبەستی
بەماناکەی تری کە تایبەتە بە لێکۆلینەوە لەبەشەکانی ئەم گەردوونە
یان یاساکانی ئەم گەردوونە کە شتانێکی مادین و هەستپێکراون

ئێمە لەجیهانی ئیسلامدا ئەم گەردوونە بینراوە بە جیهانێکی بەڵگە
دەبینین جیاوازە لەو جیهانە غەیبیەی نابینریت ، بابڵێین زانستی
سروشتی تایبەتە بە لێکۆڵینەوە لە جیهانی بینراو و بەڵگە گەردونی
مادی هەستپێکراو ئەمە پێناسی زانستە بەمانای science ..

زانست وڵامی چۆنیەتی شتەکانمان پێ دەڵێ کە ڕوودەدەن بەڵام مسببی
(دروستکاری هۆکاری) شتەکانمان پێ نالێ ، زانست سەریهەڵداوە لە
شارستانیەتە کۆنەکانەوە وەک شارستانیەتی چینی و هندی و فیرعەونی
باشترینیان شارستانی مسریە بۆ زانستی سروشتیەکان وەک هەندەسە
و پزیشکی ، بەڵام بپرسین وەک وێستگەی راستی یەکەمی زانست
دەبێ بگەڕێینەوە سەر "ئەرستۆ" پێش زاین لە یۆناندا یەکێکە لە
فەیلەسوفە بەناوبانگەکان کتێبێکی هەیە بەناوی "سروشت" لەو
کتێبەدا تەنها باسی سروشتی نەکردووە بەڵکوو بەدوای ڕێگایە گەڕاوە

**راستی زانستی لە خورافات جیاکاتەوە زانست لەلای یۆنانیەکان بوو بەم شێوە..**

**تاکاتی هاتنی ئیسلام و دەسپێکردنی سەردەمی عەباسیەکان لەبەغدا ناوەندێک هەبوو بۆ وەرگێران کتێبە یۆنانیەکان بۆ عەرەبی ئەمەش بووە هۆی شۆرشێکی گەورەی زانستی لەنێوان موسڵمانان وەک جابر ابن حیان لەبواری کیمیا ، ابن سینا لەبواری پزیشکی ،خوواریزمی لەبواری جەبر ، حەسەنی کوری هەیسەم لەبواری فیزیا ، موسی ابن شاکر لە گەردووندا .. هتد ، مووسڵمان تەنیا زانستی سروشتیان وەرناگرت لە یۆنانەوە ئەو مەنهاجەی یۆنان بەکاری هێنا بۆ جیاوازی نێوان ڕاستی زانستی و خورافات مەنهەجێکی وشکی تیۆری فەلسەفی بوو لەواقعیدا تاقیناکراوە و پشت ڕاستنابووەوە ، بەڵام موسڵمان تاقیکردنەوەیان بۆ زانستەکە زیادکرد ، بەتایبەتیش جابری کوری حەیان کە بەسەرەتای زاستنی تاقیکاری دانرێت ،تاکە شارستانیەتی مێژوویەی لە پاڵنەرێکی دینیەوە زانستی وەچنگ خستووە ئەویش شارستانیەتی ئیسلامیە ، جیاواز لەوانەیەی لەپێناو دوونیاکە خۆیدا زانست وەدەسدێنن...**

**وێسگەی سێیەمی زانست لە ڕۆژئاوا بوو لەسەدەی دوانزە بەدواوە بە وەرگێران و هێنانی کتێبە یۆنانیەکان و هەروەها کتێبە عەرەبیەکان و وەگێرانی بۆ سەر زمانی لاتینی لەوانەش" شمس العرب و کتێبی تاریخ العلم " دواتر مێشکی ڕۆژئاوا بەرەو پێشەوە چوو لەسەر دەستی فەیلەسوفەکانی وەک "دیکارت " و "فرانسس بیکۆن" و مەنهاجی زانستی تاقیکاری دانرا لە ڕۆژئاوا لەوێشەوە شۆرشی زانستی دەستی پێکرد وەک گالیۆ لەبواری گەردوون و اسحاق نیوتن فیزیا لەوکاتەی ڕۆژئاوا بەرەوپێشەوچون و وڵاتانی دیکە بەهۆی جەنگەوە داتەپین لێرەشەوە زانستی سروشتی کەوتەوە چنگ رۆژئاوا ئەم زانستەش بێ بەش نەبوو لەکاریگەری بیری رۆژئاوایی بەسەریەوە ...**

پرۆگرامی زانستی تاقیکاری چییە ؟

ڕوون بکەینەوە ، خەیاڵ scientific methodبابە نموونەیەک بکە سێ هاورێ پێکەوەن شەپۆلی باو باران لێیان هەڵدەکات لەپێشیان هەورەبروسکەیەک ڕوویدا پاش کەمێک دەنگەکە گەشتە لایان هەریەکەیان لێکدانەوەیەکی هەبوو ..

کەسی یەکەم وتی : هەورە بروسکە پێش دەنگەکەی ڕوودەدات (Aئەمەیان ناو دەنێن لێکدانەوەی )

کەسی دووەم وتی : لەم سەردەمە نەخۆشیە بڵاوە لەنێو گوێی خەڵکدا (Bوامان لێکات پێش لەپێشا هەورەبروسکە ببینین ، لێکدانەوەی )

کەسی سێیەم دەڵی : خێرایی دەنگ کەمترە لەخێرایی ڕووناکی بۆیە (Cئێمە پێشا بروسکەکەی دەبینین لێکدانەوەی )

Aکەواتا ئێمەسێ لێکدانەوەمان هەیە ، B ، C

پسپۆڕەکان دەڵێن: Aبەنیسبەتی لێکدانەوەی

کاتێ پەڵەهەورەکان یەکدەگرن هەردووکی پێکەوە ڕوودەن بۆیە ئەمە گریمانە هەڵەیە

کاتێ ئێمە دەڕۆینە لای دکتۆریکی گوێ پێمان دەڵی Bلێکدانەوەی گویکانمان سەلامەتن و بێ نەخۆشین کەواتا ئەم گریمانەش هەڵەیە

بەڵام کاتێ لێکدانەوەی سێیەم پرس بە زانایانی فیزیا دەکەین وتاقیکەینەوە بزانین ئاخۆ راستە یان نا هیچ دژیەک نابینیەوە دژ بەو گریمانەیە کەواتا جارێ ئەمە دەبێتە راستی بۆ مەسەلەکە تاکوو دژکاری بۆ دێتەبوون ..

کەواتا دوو وڵام هەڵە و دانەیە راست ئەمەش نموونەی زانستی زانستی scientific factتاقیکاریە کە جیاوازی دەکات لەنێوان زانستی ناراست pseudoscienceراستی و

کەواتا هەرکاتێ زانیاریەک بوو بە زانست دەبێ پێی بڵێین زانستی بینراوی تاقیکراوە (واتا لەواقعدا دەبێ بسەلمێت) کەوایا دەبێ بۆ ئەوەی بلێین زانست (زانستی سروشتی ) دەبێ بەچاو ببینریت و تاقیش بکرێتەوە ، کەواتا چی کاتێک بە زانیاریەک دەوتری زانست ..

واتا کاتێ مرۆڤێک چاودێری 1observation: -چاودێری کردن دیاریەک دەکات و لێی وردەبیتەوە بۆنمونە کاتێ تۆ سەرەنج دەدەیت هەورە بروسکە دەبینی ڕوودەدا پاشان دەنگەکەی دێت

2- ڕیسێرچ : واتا گەرانە بۆ زانینی ئەو زانستی پشت هەورە بروسکەیە هەتا لێی بگات لەو نموونەیەدا گفتوگۆی ئەو کەسانەیە بۆ گەشتن بە تەفسیریک بۆ مانای دیاردەکە

3- دروستکردنی گریمانە و لێکدانەوە: واتا دانانی تەفسیری بەڵام بەشێوازیکی تیۆری وەک ئەو سێ گریمانەیە وتمان و شیمانکردەوە

واتا هەریەک لەو گریمانانە 4experiment: -تاقیکردنەوە تاقیکەینەوە بزانین راستە یاخوود نا بەڵام ئەرکی زانست ئەوەنیە کە

بیسەلمێنی گریمانەیە راستە ، بەڵکو ئەرکەکەی ئەووەیە بیسەلمێنی ئەو گریمانەیە هەڵەیە بۆنمونە گەر ئێمە بلێین کە مرۆڤی هەیە خێراترینە لەسەر رووی زەویدا ئەوا دەبێ بیسەلمێنین کەس لەو خێراتر نیە واتا نەفی هەموو مرۆڤەکان ئەکەین ئەو توانایان نیە ، زانست دەتوانی نکۆڵی لەشتەکان بکات و نەفیان بکات بەڵام ناتوانی بیسەلمێنی ، هەر ئەو نموونەی هەورە بروسکەیە باسمان کرد ئێمە زانستی Cرەتکەینەوە ، بەڵام گریمانەی B و Aتوانیمان گریمانەی فیزیامان بەکار هێنا نەیتوانی رەتی بکاتەوە کەواتا تائێستە مادام دژی نیە و نەفی ناکری راستی و فاکتە ئەم زانیاریە کە خێرایی رووناکی زیاترە لە دەنگ ...

کەواتا زانست دەتوانی گریمانە هەڵەکان نەفی بکات و پوچەڵی کاتەوە بەڵام ناتوانی گریمانەی راستی هەڵوەشێنیتەوە بۆیە سەرەنجام دەبێتە حەقیقەتێکی زانستی بەڵام ئاگاداربن ئێمە ناتوانین بلێین ئەو زانستە راستیەکی موتڵەقە بەڵکو ئێمە شکستمان خواردووە لە نەفی کردن و پوچەڵکردنەوەی کەواتا ئەو زانستە ڕاستفە تا کاتێ دژکاری بۆ دروستەبێت هەنگاوی کۆتایش بریتیە لە ئەنجام و دەرەنجام ئەوەش تاکاتێکە دژەکەی نەدۆزینەوە کەواتا دوای پێنج هەنگاو دەگەینەراستیەکی زانستی بەڵام دووبارەیەکەمەوە ئەوە راستیەکی موتڵەق نیە بەڵکو گۆراوە بەپێی کات دەگۆرێ چون زانست لەسەر کەڵەبوون دروستەبێت چونکە جیهانی زانستی نوێ لەکۆتایی جیهانی زانستی کۆنەوە دەست پێکات دواتر بەرە بەرە زانست پێشکەوەوێ و کەڵەکەبێت بەڵام زانست ڕوخێنەرە لەهەمان کات واتا زانستی نوێ زانستی کۆن ڕەتەکاتەوە چون دژی بۆ دروستەبێت ، ئەوکاتەی زانایەکی نوێ دەیسلمێنی زانایەکی کۆن هەڵەبووە کەواتا لێرەیا زانست ڕوخێنەری پێش خۆیەتی

نموونەیەک لە گۆرینی زانستدا لەساڵی 1904 دا یەکەمین گریمانە بۆ شێوەی گەردیلە پێشخرا کە باسی لەوەکرد گەردیلە لەبارگەیەکی

موجەب پێکدێ کە بارگەی سالب چواردەوری داوە بەڵام لەساڵی 1911 دا گریمانەیە تر دروست بوو باسی لەوەکرد زۆرینەی پێکاهاتەی گەردیلە بۆشاییە واتا نێوان ناوک و بارگەکانی ئەلکترۆن زۆرینە بۆشیایە و نارێکن ، لەساڵی 1913 دا گریمانەیە تر دەرچوو دەڵی ناوک چواردەور دراوە بە زنجیرەیە ئەلکترۆن کە جیاوازن لە وزە و قەبارەدا لەساڵی 1926 گریمانەیە نوێتر دەرچوو دەڵی ئەلکترۆن لەناو چەن چینی ئەلکترۆندا هاتوچۆ ناکا بەڵکو لەنێو چوارچێوەیە وزەدا دێ و دەڕوات لەو ماوەدا چوارِ جار شێوازێکی گەردیلە گۆڕا ...

زانست روخێنەرە چون لەسەر راستی چەسپاو بنیاد نانرێت بەڵکو زانستێکە تا کاتێ دژەکەی دەدۆزریتەوە ئەو کەسانەی مولحیدین زۆر بەسیقەن بە زانست بەڵام زۆرترین شکیان هەیە لە دیندا سەیرەکە ئەوەیە دین یەک وشەی لێ ناگۆرێ بەدرێژایی سەردەمەکان بەڵام زانست سەراوژێر ئەبیتەوە لەماوەیەکی زۆر کورتدا ، ئایا بەراستی شایەنی ئەو هەمووscience زانین بەرێگای زانستی سروشتی یان متمانەیە ؟ ئایا پێتان وایە جگە ئەو پرۆگرامە باسمان لێوەکرد شتێکی دیکە بەکار بهێنرێت لەم سەردەمەدا ؟ کۆمەڵە رێگایەکی زۆر بەکاردێت لەمرۆ بۆ جیاکاری ئایا چۆن متمانە بکەین بەو رێگایانە بۆجیاوازی نێوان خورافات و راستی ؟ئایا پێتان وانیە کۆمەڵێ خورافات هەوڵ دەدرێ تێکەڵ بە زانست بکرێ ؟ ئایا ناوەندی زانستی ناوەندێکی بێ لایەنە ؟ یان قوربانیەکی دیکەی سیاسەت و موئامەرەکانە ؟

📖ئایا ئەمرۆ چی میکانیزم و پێوەرێ بەکار دەهێنرێت بۆ جیاوازی نێوان زانست و خورافیات ؟

ئایا پرۆگرامی زانستی تاقیکاری تاکە مەنهاجە کەجیهان هەمووی لەسەری رێکەوتبن بۆ جیاوازی نێوان خورافیات و راستی زانستی؟ بێگومان نەخێر بەڵکو چەندین رێبازی دیکە جگە تاقیکاری بەکار دەهێنریت... پرۆگرامی زانستی تاقیکاری پێشتر ڕوومانکردۆتەوە کە

بریتیە لە بینینی دەرەنجامی واقعی زانستەکە ، واتا ئەو گریمانانە لەواقعدا تاقیدەکرێنەوە بەپێی زانستی سروشتی ئەگەر بێتو دژکاریان نەبوو ئەوا دەبێتە زانستیکی راستی تاکاتی پەیدابووی دژەکەی ...

پەیوەندی نیوان فەلسەفە و زانست وەک پەیوەندی نیوان دایک و منداڵەکەی وایە چونکە زانست لە بنچەدا لە فەلسفەوە لەدایک بووە کەواتا چۆن جیاوازی نێوان راستی و خورافات بکەین ؟ ئەمە پرسیارێکی فەلسەفیە ئایا دەکرێ زانست سەرچاوەی یەکەمی زانین بی؟ دیسان پرسیارێکی فەلسەفیە ئەو زانایەی کە پشت دەکاتە فەلسەفە ئەوا نەفرەت لەو هەوایە دەکا هەڵیدەمژێت چون فەلسەفە داهاتووی واقعی زانست گرێدەدا ، جگە ئەمەش هەندێک زانا خۆیان بەفەیلەسوف زانیووە وەک ئیسحاق نیوتن لەکاتێکدا خۆی زانایەکی فیزیاییە...!

فەلسەفەی زانست لەپێش زاین لەگەڵ زانست خۆیدا دەستی پێکرد لەگەڵ ئەرستۆدا کە هەوڵی دا جیاوازی بکات لە نیوان خورافات و راستی زانستی ، ئەرستۆ رێگایەکی بەکار هێنا بۆ جیاکردنەوە راستی زانستی لە خورافیات ئەو رێگایە پێیان دەوت "inductive reasoning " واتا مرۆڤ ڕاستی و بەڵگە بچوکەکان کۆدەکاتەوە تاکو دەگاتە ئەنجامی گەورەی یەکلاکەرەوە ئەم شێوازی جیاکردنەوەی خورافیات لە راستی بۆ دووهەزار ساڵ بەردەوام بوو هەموو مرۆڤایەتی پشتی بەم رێگا بەست بەڵام لە سەدەی 17 و سەدەی 18یان " age of enlightment " لە ئەوروپا کە بە سەدەی سەدە رۆشنگەری ناسراو بوو ، سەدەی دروست بوونی عەلمانیەت و گومان خستنە سەر دینی مەسیحیەت بوو ، لەگەورەترین ئەو کەسانەش گومانیان خستووەتە سەر دینیی مەسیحیەت و باوەرە عەقڵیە جیێگیرەکانی خەڵک "دێڤید هیوم" بوو کە لەساڵی 1711 لەدایک بووە ، لەو باوەرە عەقڵیانەی کە دێڤید هیوم گومانی لەسەر دروستکردبوو "منهاجی زانستی تاقیکراری" بوو کە بۆ ماوەی 2000 هەزار ساڵ کەس دەستی بۆ نەبردبوو بەمانەیەکی دیکە " دێڤد

هیووم " هەستا بەگۆرینی ئەو پێوەرەی ئەرستۆ داینابوو کە " inductive method"  !؟.. بوو بەڵام بۆچی مەبەستێک گۆری

لەکتێبەکەیدا  دا بەشێکی نوسیووە بەناوی کێشەی پرۆگرامی زانستی (واتا پێوەرەکەی ئەرستۆ  inductive reasoningتاقیکاری دەڵی ) دەتوانی ئەگەڕ و گریمانە دروست بکا بەڵام ناتوانی راستی یەقینی بهێنی واتا ڕاستەوخۆ نامانگەینێ بە نەتیجە ، لێرەیا باسی  کێشەی مراویە رەشەکە دەکات دەڵی گەر بێتوو ئێمە هەموو مرۆڤایەتی لەسەر دەریایەک کۆبکەینەوە بەڵام ئەو دەریایە بۆ نموونە 80 مراوی سپی تێدابێت  دەڵێ لەبەر ئەوەی کەس مراوی رەشی نەبینیە کەواتا هەموو مراویەکانی سەر زەوی سپین " دێڤد هیوم " دەڵێ ئێمە دەتوانین بەم شێوازە سەلماندنە گریمانەکان دروستبکەین ( وەک نموونەی هەروە بروسکەکە ) بەڵام ناتوانین بگەینە راستی یەقینی سەدا سەت ، چون دەڵی تەنیا لەبەر ئەوەی مرۆڤایەتی مراوی رەشی نەبینیە مانای وا نیە بوونی نەبێ 35ساڵ دوای مردنی هیوم داروین لەدایک بوو کتێبێکی گەورەترین هۆکار  " origin of speciesنوسی داروین بەناوی " بوو بۆ پشتیوانی لە بیردۆزی پەرەسەندن و قبووڵکردنیشی لەلایەن رۆژئاواوە ..

کتێبەکە بووە هۆی دروست بوونی ئاژاوەیەکی فیکری زۆر لەنێوان مەسیحیەتی دینداری رۆژئاوایی و مرۆڤی ڕۆشنگەری رۆژئاوایی ، ی ئەرستۆی  بەکاردەهێنا بۆ ماوەی inductive methodجیهان 2000 هەزار ساڵ بەڵام بیردۆزی پەرەسەندن پێوەرەکەی ئەرستۆی بەکار ناهێنی بۆ سەلماندن بەڵکوو "رێگای دەرئەنجامی " بەکارهێنا چاودێری کردن و وردبوونەوە و  inductive method،
هەستەکان بەکار دێنیت بۆ گەشتن بەراستی زانستی ، بەڵام " رێگای دەرنجامی " راستەوخۆ دەرنجامە زانستیەکە دەڵی دواتر دەست دەکات بەهێنانی بەڵگە بۆپشتگیرکردن لێی کە داروین پەرەسەندنی بە پێی "رێگای دەرنجامی " داناوە چونکە  بەدرێژایی ملیۆنان ساڵ

پەرەسەندن دروستتبێ بۆیە چاودێری ناکرێ بەمرۆڤ کەواتا ئێمە ناتوانین بەپێی بینین و وردبوونەوە پەرەسەندن ببینین بۆیە گریمانەکە رێک بەنەتیجە دەست پێدەکات دواتر پەنا دەباتە بەر چنگ خستنی بەڵگە بۆ سەلماندنی....

(پێوەری ئەرستۆ) گریمانەی inductive methodکەواتە بەپێی پەرەسەندن خورافاتە ، بەڵام یاوەرانی داروین وەک "لویس پاستیر " باسیان لەوەکرد ئەم زانستە دروست بووە لەپێش داروینە کاتێ بەتایبەتیش کاتێ " دیڤد هیوم" گومانی دروست کردووەتە سەر ئەسڵی پێوەری ئەرستۆ و مەنهاجی زانستی تاقیکاری ، ئەمەش وای کرد داروین مەنهاجێکی نوێ بەکار بهێنێت بۆ جیاوازی نێوان زانست و خورافات دواتر لەپرێکدا " ڕێگای دەرنجامی " بووە باوەرپێکراو لە جیهاندا ! بۆ جیاوازی نیوان خورافات و زانست بەم هۆیەشەوە بیردۆزی پەرەسندن کە چەندین رەخنە و گومانی لەسەر و چەندین خاڵی لاوازی بەردەستە بوو بە بیردۆزیکی واقعی لای رۆژئاوا ئەمەش بەهۆی گۆرانکاری لەو پێوەرەی خورافات و راستی لێک جووداکاتەوە ...

ئێمە لەم سەردەمەیا هیچ پێوەرێکی جێگیرمان لا نیە بۆجیاوازی نیوان زانست و خورافات بەڵکو هەزار پێوەری جۆراجۆرمان هەیە لەدەرئەنجامی نەبوونی پێوەرێکی راست و واقعیکە بۆ جیاوازی نێوان راستی و خورافات کەواتا دەکرێ هەزار درۆ و دەلەسە بکرێتە واقعی و راستی بۆتۆی مرۆڤ کەواتا غیابی ستاندەر و پێوەرە بۆ جیاوازی کردن زۆر ترسناکە چون دەکرێ هەر خورافاتی بەرگێێکی زاستی بەبەردا بکرێ و بەناوی راستیەوە پیرۆزەکرێ هەر بۆنموونە جوڵانەوە فێمینزیمەکان لە جوڵانەوەیەکی کۆمەڵایەتیەو دەگۆڕدرێن بۆ زاڵ بوونی مۆخی مێینە بەسەر مۆخی نێرینە ، بۆ فرە گەردوونی هەمان شت ، حەزە جنسێەکان نەگونجاوەکان لەگەڵ فیتەردا دەگۆردرێن بۆ نەخۆشی و پاڵنەری دەروونی ، زانست لە ئاداتی بۆ رۆشنبیرکردن دەگۆرێ بۆ

ئاداتی بۆ چەواشەکردن  لەولاشەوە کۆمەڵی هەن دەرەجەی بەرز بەدەست دێنن بەخوێندنی ئەو باسانە بەڵام لەمقابلیدا کەسانی هەن پیکەنن بەسەرکەوتنی ئەو موئامەرەی کە بەناوی زانستەوە دەرخواردی گەلان دەدری

کەواتا لێرەیا پرسیاریکی جدی و ترسناک دێتە ئاراوە

ئایا بەراستی دەستێک هەیە بۆ چەواشەکردن و بەلارێبردندا؟

# ٢٠ _ پەرەسەندن بیردۆزێکی سەپێندراو

🕮پەرەسەندن بیردۆزێکی سەپێنراو.
زانستێکی سەپێنراو.

سەردەمی رۆشنگەری گەورەترین هۆکار بوو بۆ قبووڵکردنی بیردۆزی پەرەسەندن ، چون خەڵکی ئامادەکراو بوون بۆ تانەدان لە دینی مەسیحیەت و گومانکردن لە بەڵگە نەویستەکان لەو فەیلەسوفانەی کە کاریگەر بوون بە بیردۆزی پەرەسەندن کارڵ مارکسە ، مارکس هەوڵی دا بیردۆزی مارکسیەت بنیادبنێت مارکس لای وابوو دین چیرۆکیکی خەیاڵی و ئەفسوناویە و ئەفیۆنی گەلانە هەروەها لای وابوو دین دەرەنجامی ململانێی چینایەتیە لەنێوان چینی دەوڵەمەند و هەژار..

ی داروینی خوێندەوە زۆر orign speice کاتێ مارکس کتێبی کاریگەر بوو پێی ، دوای ئەوە ئاشکرای کرد کە بیردۆزی مارکسیەت تەنیا بیردۆزێکی تیۆری نیە بەڵکو پشت ئەستورە بە بنچەیەکی زانستی وەک کتێبەکەی داروین...

لە ساڵی ١٨٧٩ کارل مارکس نامەیەکی بۆ هاوڕێکەی و فەیلەسوفی ئابووری و هاوبیرە ڕۆشنبیرەکەی فریدریش ئینگێلس نووسی، بۆ ئەوەی کتێبی "بنەچەی جۆرەکان" بخوێنیتەوە لەنامەکەدا دەڵێ : هاورێی خۆشەویستم فرێدرێگ دەزانی کتێبەکەی داروین بنەچەیەکی زانستی مێژووییمان بۆ باس دەکات لەسەر بیردۆزی مادە لەجیهاندا ، وە ئەو بنچەیەکی ململانێی سروشتی نێوان زیندەوارن ئاشکرا دەکات داروین زۆر سەر سامی کردووم ، چونکە ئەو توانی بیرۆکەکانی مالتۆس بەسەر ڕووەک و ئاژەڵاندا جێبەجێ بکات..

داروین نیگەران بوو لەبەر ئەوەی دەیزانی بنەمای تیۆرییەکەی لاوازە، بۆیە لە کتێبی "بنچینەی جۆرەکان" دا لە بەشی شەشەمدا بە ناونیشانی کێشە لە تیۆرەکەدا دانی بەوەدا نا: "ئەگەر ئەوە بسەلمێنێت کە دروست بوونی ئەندامێکی ئاڵۆز مەحاڵە لە ئەنجامی کەڵەکەبوونی گۆڕانکارییە بچوکەکانەوە یەک لەدوای یەکەکانەوە ، ئەوا بیردۆزەکەم بەدڵنیاوە دەڕوخیت بۆیە داروین دیاریەکەی لە مارکس وەرنەگرت چون پێی وابوو معجب بوونی مارکس بە پەرەسەندن هۆکارێکی سیاسی و فیکری لەپشتە و داروین پێی وابوو مارکس بابەتە زانستیەکە دەقۆزێتەوە بۆ سرینەوەی بوونی مرۆڤ بەتەواوی و بلفعل واش بوو ئەوەی داروین لێی دەترسا مارکس کردی بەواقعی و راستیەک بۆ جەنگێکی فیکری

دەتوانین بڵێین مارکس لەدوو لاوە زۆر کاریگەر بوو بە بیردۆزەکەی داروین ...

یەکەم: دوای ئەم کتێبە مارکس بێ باوەری خۆی ئاشکرا کرد بەبڵاوکردنەوەی تەواوەتی فیکرەکانی پشت ئەستور بە بەڵگەی زانستی

دووەم: بڕیاری دا کە خوودی خۆشی بیردۆزی پەرسەندن دروست بکا بەڵام لەسەر ئەساسی کۆمەڵگا و ئابووری لێرەشەوە کتێبی "سەرمایەی" نوسی لێرەدا وێنای کۆمەڵگا دەکات هاوشێوەی زیندەوارن ئەوانیش پەرەسەندنیان بەسەردا دێ و کتێبەکەی کرد بەدیاری بۆ داروین ، پاشان بیردۆزی مارکسیەتی دانا بیردۆزی مارکسیەت لەسەر دووپایە دانراوە:

یەکەم: بوون هەمووی مادەیە  هیچ شتێکی غەیبی و شاراوە بوونی نیە ، هەروەک توانی بە بەکار هێنانی پەرەسەندن زیاتر ئەم فیکرە دڵنیا بکاتەوە

دووەم:ٚ ئابووری هەموو شتێ دیاری دەکا لەژیانی مرۆڤدا بۆیە هەموو رەوشت و بیرکردنەوە و دین و تەسەروفاتی هەمووی لەجەنگی نیوان هەژار و دەوڵەمەندەوە سەری هەڵداوە..

بۆیە دەیوت ئابووری هەموو شت دیاری دەکا پێی وایە دین ئەفیۆنی گەلانە و هیچ حەزارەتیکی پێشکەوتو نابینی ئیلا دەبی پشتی لەدین کردبێت و اعلانی ئیلحادی کردبی گەر بێتو ئێمە تیوری مارکسیەت بکەین بە راستی لەسەر ئەرزی واقعی ئەوا دەبێتە شیوعیەت بەڵام بۆ ئەوەی شیوعیەت بڵاوبێتەوە دەبێ گەلان ئیلحاد بنۆشن و دین فرێبدەن تاوکو ئیلحاد لە بریاریکی کەسی تایبەتیەوە ببێتە باوەرێکی رەسمی گەلان ، یەکەمین هەوڵیش بۆ تەتبیقکردنی شیوعیەت لەساڵی 1917 دا بوو  لەسەر دەستی لینین بوو ، لینین هەوڵی نادا بەزۆر خەڵکی راپێچی شیوعیەت بکا بەڵکو بەشێوازێکی تێگەشتنی دەگرتە بەر بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا زۆر خەریکی بابەتە سیاسی و ئابووریەکان بوو زیاتر ، دوای لەناوچونی لینین لەساڵی 1927 ستالین دەسەڵات دەگریتە دەست ستالین زۆر گرنگی بە تێگەشتن و هۆشیاری خەڵکی نادا بەڵکو بەهێز دەیسەپاند بیرەکەی تەنانەت بەسەر مەنهاجی زانستی و مەنهاجی خوێندینش دەیسەپاند پشگیری هەموو زانایەکی دەکرد کە بەرەو شیوعیەت هەنگاو بنێت و پێچەوانەکەشی ، ئەمنی نیشتمانی دەستی گرت بەسەر هەموو ناوەندەکانی لێکۆلینەوە و سێرچەکان کە پشگیری بیردۆزی داروینیان ناکرد...

دەتوانین بڵێین یەکێ لەهۆکارەکانی شکستی شیوعیەت بەرامبەر سەرمایەداری رۆژئاوا ئەوەبوو شیوعیەت لەسەر ئەساسی الحاد دامەزرا بوو ، بۆ ئەوەی خەڵکی شیوعیەت قبووڵبکەن وەک حکومەت

**دەبوو سەرەتا ببن بە مولحیدێک ، ئەمە خاڵێکی لاواز بوو بۆ شیوعیەت چون نەیدەتوانی هەموو خەڵکی بە الحاد قەناعەت پێکات ، دووەم دژایەتیەکی فیکری زۆری دژ بە ئایدیا جیاوازەکانی دیکە دەردەبری وەک لەناو بردنی مزگەوتەکان و کوشتنیان تائێستاش لەچین موسڵمانانی ئۆغیور دەکوژرێن و زیندانی دەکرێن بەهۆی حکومەتی شیوعیەتەوە ، شیوعیەت تەنیا حوکم و دەسەڵاتی داگیر ناکرد بەڵکو بیر و فیکر و ئاینی گەلانیشی ئیبادەکرد ، بۆیە شکستی هێنا چون خەڵکی لەخۆی دوور دەخستەوە خەڵکی وەک دووژمن دەیان بینەوە ، پێچەوانەی علمانیەت کە هەموو ئایدیایەکی جیاوازی قبووڵدەکرد ، کێشەی لەگەڵ هیچ باوەڕێکی شەخسی نەبوو بەمەرجێ دەست بۆ دەسەڵات نەبردایە هەرئەمەش هۆکاری سەرکەوتنی ڕۆژئاوای عەلمانی سەرمایەداری بوو ...**

**دوای ئەوەی ستالین دەستی گرت بەسەر ناوەندی زانستیدا ستالین "تروفیم لیسینکۆی" دیاری کرد بەسەروکی سەرۆکی ئاکادیمی لینین بۆ زاسنتی کشتۆکاڵی "لیسینکۆ" کابرایەکی فەرمانبەری گوێگری ستالین بوو ، بۆیە لەسوودی ستالین و شیوعیەت لیسینکۆ سزای هەر زانایەکی دەدا دژی پەرەسندن بجوڵێتەوە ، هەڵمەتێکی دەس پێکرد بەناوی لیسنکی بۆ ڕاوەدوونانی ئەو زانایانە دژایەتی پەرەسەندینان دەکرد سەرەرای ئەم شێوازە بەڵام نەیان دەتوانی بەتەواوی کۆنترۆڵی بکەن چون پێش دروست بوونی سۆڤیەت زانایەک هەبوو بەناوی مەندڵ گەورەترین زانای بۆماوەزانی لەمێژووی مرۆڤدا ، دامەزرێنەری جیناتسی گریگۆر مێندێل بناغەی تیۆری پەرەسەندنی داروینی شکاند باسی لەوەکرد زانستی جیناتی دەریخستووە کە سیفەتە ئەو سیفاتانەن مرۆڤ (acquired traits)دەستکەوتەکانی مرۆڤ) لە جیهانی خارجیەوە وەریدەگرێ ئەم سیفاتانە بۆ نەوەکانی داهاتوو ناگوازرێنەوە ، بەڵکو تەنیا لە سیفاتە جیناتیە جێگیرەکان (genetic traits) دەگوازرێنەوە، بەپێی زانستی بۆماوەزانی مەندڵ تیۆریەکانی لامارک و داروین هەڵوەشانەوە ... زانستی بۆماوەزانی مەندڵ داینابوو پێچەوانەی داروین بوو بۆیە جوڵاوەنەی لیسنیکی لێکۆڵینەوەی لە**

هەرکەسیک و لایەنێک بوو کە کتێبەکانی مەندڵ شیکاتەوە گومان بخاتەسەر بیری داروینی بەهەر شێوەیەک بیت بەم هۆیەشەوە سێ هەزار زانا خرانە زیندان هەتا بەشێکیشیان کوژران......

لێرەدا دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە تیۆرە زانستیەکان هەندێ جار دەکرێنە راستیەک بەپشتیوانی دەسلآتێک بۆ برەودان بە فیکریکی سیاسی ، بۆیە زانستیش یەکیکە لەقوربانیەکانی ململانێیکان پێچەوانەی هەندێک لایان وایە ناوەندێکی سەربەخۆیە.

📖بەکارهێنانی زانست بۆ دروستکردنی موئامەرەکان ..

بەدرێژایی مێژوو هەرگیز زانست ناوەندێکی ئازاد و بێ لایەن نەبووە بەڵکو لەگەڵ ئەوەی مرۆڤایەتی بەرەو پێش بردووە چەکێک بوو بەدەست لایەنی دەسەڵاتدار بۆ زاڵکردنی لایەنی فیکری و مەیدانی خۆی بەسەر لایەنی لاواز و ژێر دەستدا. لەوکاتەی کە دێڤد هیووم پێوەرەکانی ناسینی زانستی راستی گۆری زانست بوو بەچەکێکی فیکری و ئایدۆلۆژی نموونەش زۆرن لەمێژوودا لەسەر گۆرینی راستیەکان و بەکارهێنانی بۆ خزمەتی فیکریکی دیاریکراو لێرە چەن نموونەیە دێنینەوە..

نیکۆلای ڤاڤیلۆڤ زانایەکی بۆماوەزانی رووسیە لەساڵی 1887 لەدایک بووە لەوکاتەدا پرۆژەیەکی هەبوو بۆ کۆکردنەوەی هەموو تۆوە زەراعیەکان لەچواردەوری جیهان گەورەترین کۆگای بۆ تۆوەکان کۆکردەوە لەجیهاندا دروستکرد ، ڤاڤیلۆڤ پێی وابوو کە لیسنکی زۆر نەزانە تەنانەت بەسادەترین شتەکان لەزانستی کشتوکاڵ نازانیت لیسینکۆ زانایەکی بۆماوەزانی بوو و سەرۆکی زانستی بۆماوەزانی سۆڤیەت بوو پشتیوانی لێدەکرا لەلایەن حکومەتی شیوعی ڕووسیەوە . لیسینکۆ باوەری بە بوونی جینات نەبوو لەبنچەوە بۆیە ڤایڤیلۆڤ

دەستێ کرد بە رەخنەگرتن لە سیاسەت و بڕیارەکانی لیسینکۆ لە ئاگادارکردنەوەکانی لە باسی دانەوێڵەی کشتوکاڵی ...

لساڵی 1936 دا دیبەیتێک ڕوویدا لەنێوانی هەردوولادا ، لەگەڵ ئەوەی ڕەخنەکانی ڤاڤیلۆڤ زانستی بوو بەڵام دەسەڵات دارانی سۆڤیەت گومانیان کرد جاسووس بێ چون بەهەموو جیهان گەشتی کرد و ڕەخنەی لە سیاسەتی شیوعیەت بوو لەساڵی 1940دا ڤاڤیلۆڤ دەسگیرکرا و خرایە زیندانەوە و خواردنی لێ قەدەغەکرا هەتا مرد دوای مردنی ڤاڤیلۆڤ حزبی شیوعی بەردەوام بوو لەهەڵە زانستیەکانی و بەهۆی نەزانیەکانی لیسینکۆوە برسێتی گەورە لە چین سەریهەڵدا لەساڵی 1960 دا بەتێپەرینی کات دەرکەوت ڤاڤیلۆڤ لەسەر راستی بوو ..

جیاوازیەکە ئەوەبوو لیسینکۆ پشگیری کراو بوو لەلایەن دەسەڵاتی وڵاتەوە ، دەسەڵاتیش گرنگی بەراستی زانستی نادا بەڵکو گرنگی بەبڵاوکردنەوەی ئیلحاد دەدا بەتەنیا ، ئەمرۆ روسیا گەورەترین کۆگای کۆردنەوەی تۆوەکانی هەیە لەجیهان بەناوی ڤایڤلۆڤەوە و لەساڵی 1977 کاتێ هەسارەیەکی نوێ درۆزاوە لە گەردوون ناوی نرا بەناوی ڤاڤیلۆڤەوە وەک ڕێزێک بۆ هەوڵەکانی ، ناشرین ترین دیمەن بۆ بەکار هێنانی زانست بۆ بەجێگەیانی فیکریکی دیاریکراو ، سەرەرای ئەوەی لیسینکی و جوڵانەوەکەی لەرابردوودا بوون بەڵام هەتاکو ئەمرۆش بەکارهێنانی زاسنت بەردەوامە بۆ خزمەتی ئەجێندایەکی فیکری ..

لەساڵی 2020 دا "جمێس تۆر" یەکێک لەگەوروەترین زاناکانی کیمیای ئۆرگانیک کتیبکی نوسی بەناوی the mestry of life origin لەم کتێبەدا دەڵی گۆرانی مادەیەکی مردوو بۆ خانەیەکی زیندوو بەرێگای پەرەسەندن موستەحیلە رووبات ، بەهۆی ئەمەوە توشی ڕەخنەیەکی زۆر هات نەک لەبەر ئەوەی زانستی نیە بەڵکو لەبەر ئەوەی لەگەڵ سیاسەتی وڵاتدا ناروات هەربۆیە لەپەرەی فەرمی

خۆی ئەمەی بڵاوکردەوە نوسی بووی (ئەگەر تۆ باوەرت بە بیردۆزی پەرەسەندن نیە ئەوا بۆخۆتی هەڵگرە گەر دەتەوێ پارێزگاری لە پیشەکەت بکەیت ) .

پێش ساڵی 1973 دا حەزی نێر بۆ مێ بەشتێکی ئاسایی دانرا و هەر حەزی تر جگە ئەو حەزە بە ناسروشتی و نەخۆشی لەقەڵەمەدرا بەڵام دوای ساڵی 1973 بەئاسای و سروشتی حەزەکانی تریش لەقەڵەمدرا ئەمەش زیاتر بریاریکی سیاسی بوو وەک ئەوەی بریاریکی زانستی بێت واتا فشاری سیاسی ئەم باسەی لە نەخۆشیەوە گۆری بۆ سروشتی بەهەمان شێوە جوڵانەوە فێمێنیزمەکان لە جوڵەیەکی کۆمەڵایەتیەوە فرێ درانە نێو زانستی مێشک و دەروونەوە دواتریش واتا neuroسەری هەڵدا neuro femenismدەستەواژەی زانستی مێشک و دەمار فێمینیزم ڕوونە ، دووبارە ئەم زانستەش بۆ خزمەتی ئەجێندایەکی دیاریکراو بوو ...

ساڵی 2012 بەهەمان شیوە سام حارس دکتۆری مێشک و دەمار کتێبێکی دانا بەناوی وهمی ئیرادە ئەو هەوڵەدا قەناعەتت پێ بینی تۆ ئیجباری بەکردنی هەمووشتی لەلایەن مێشکتەوە ، بۆیە هەموو کردەوەکانت لەئەنجامی کیمیای مێشکەوە دێ ، دەڵێ ئیرادەی ئازاد وەهمێکە ، سەیرەکە لەوەیە دەڵێ مێشکت کۆنترۆڵی بریاری لەژێر خۆیدا نیە لەولاشەوە هەوڵدات قەناعەت بەمێشکت بکات ! ، ئەم نموونای باسمان کرد روونی دەکاتەوە زانست فەزایەکی ئازاد نیە بەڵکو هەندێ جار دەڕواتە ژێر خزمەتی لایەنیکی فیکری دیاریکراوە!!

# ٢١ _ دروستبوونی ئیلحادی مۆدێرن

📓دروستبوونی ئیلحادی مۆدێرن.

📓مەسیحیەت دەرگای ئیلحادو دینێکی گۆراو !

ئەگەر بەجیهاندا بگەڕێین لەوانەیە شارانێک بدۆزینەوە بەبێ پاشا و بەبێ داهات و دراو بێت یان بەبێ خوێندنگا بێت بەڵام هەرگیز نابینی شارێک بەبێ پەرستگاییە خەڵکی عیبادەت و دوعای تێدابکات ، مێژوونووسی ئیغریقی کۆن پلۆتارگ پێش دوو هەزار ساڵ وتەیەکی هەیە کە تیشک دەخاتە سەر راستیەکی مرۆڤایەتی کە دەڵێ :( مرۆڤ لەچوارچێوەیەکی دینیدا ژیاوە بەردەوام ، ناشتوانی ڕابکات لەم ڕاستیە کە بەشێکە لە بوونی بنەچەیی مرۆڤ ، دین لایەنەیە کە بووەتە سەنتەرێک بۆ هەموو لایەنەکانی دیکەی مرۆڤ کە لەچواردەوری هەن )

بەڵام گەر بێتوو لەچاوی مرۆڤێکی ئەم سەردەمەووە بروانین ئەم قسەی پلۆتارگ نامۆ دەبێ ! چون شارستانیەنی مۆدێرن عەلمانیە بە سروشتی خۆی بۆیە دەرگای ئاسمانی داخستووە ، وە خەڵکی لەیەک جیهانی مادی دەژێنێت نەک جیهانی غەیبی !

ئامارە جیاوەزەکان لە ئەوروپا ئاماژە بە شکانێک لە بیری مەسیحیەت دەکەن لەبەرامبەردا فراوانیەک دەبینین لەئەوانەی کە خۆیان بە بێ باوەر دەزانن لەکوێیەوە ئەم شکانە لە بیری دینی مەسیحیەت دەستی پێکردووە ، چۆن بیری ئیلحاد لە چەن گریمانە و تیۆرێکەوە بوو بە مەنهاجێک کە دینی مەسیحیەت بشکێنی و ببێتە باوەڕێکی زانستی پاشانیش بسەپێنرێت ؟؟چی لەپشت ئەمانەوە بوو ..؟!

## مێژووی بێ باوەری

چونکە ئیلحاد باوەڕێکی بە زانین دروستەبێ و لەناویش دەچێت بۆیە دڵ خۆش نیە بەهیچ جۆرە چەسپانێکی زانین لە ئاگایی کۆمەڵی مرۆڤایەتی ، ئێمە لەپێش دیاردەیەکی جیهانی نائاسایین کە کۆمەڵێ بابەتی سەرنجراکێش وروژاندوویەتی ئەو بابەتانە بەندە لەسەر چوارچێوەی شارستانیەتیکی تایبەت و دیاریکراو ، بۆیە نە ئاگاییەک لە زانینی گشتی خەڵکی و نە بەڵگەیەک لە مێژووی درێژخایەنی مرۆڤایەتی و نە ئەنجامی کۆتایی زانستیش کە ملحید وادەزانێ بەگەشتن بەو زانستە کۆتایی باوەڕەکان یەکلادەکاتەوە هیچ یەکێ لەوانە چارەسەری ئیلحادی مۆدێرن ناکات بەم شێوە بەرهەڵستکارییە ئێستای کەدەیبینرێت

ئیلحاد بووە بە دیاردەیەک بەهۆی کۆمەڵێ هۆکاری مێژوویەوە هانیداو بۆ دروست بوونی ، واتا هۆکاری بیرەکە مێژوویە نەک زانستی ، ئەم ئیلحادە دەرەنجامێک نیە لەئەنجامی پێشکەوتنی مرۆڤایەتیەوە یان زۆر بوونی عەقڵانیەت یان زانینی ئاسۆیەکی نوێ لەلایەن مرۆڤەوە ، بیردۆزی ئیلحاد پێمان دەڵی پێشکەوتنی مرۆڤایەتی بەدی نایەت ئیلا بە بەزاندنی ئاین نەبێت واتا یەکبوونێک لە زیادبوونی عەقڵانیەت و دوورکەوتنە لە دیندا هەیە بەمانایەکی دیکە هەرچی دینە لەژێر ناوی دواکەوتوی و هەرچی بیری بێ باوەریە لەژێر ناوی پێشکەوتن .

دین و پێشکەوتنی زانستی لێک جوودا دەکەنەوە بەمانایەکی دیکە شارستانیەتی دینی جیادەکەنەوە لە پێشکەوتن بەشێوەیە وێنا دەکەن هەتا لەدین دوور بکەوینەوە ئەوا زیاتر بەرووی پێشکەوتن دەبیتەوە بەڵام ئایا وایە ...؟!

بۆئەوەی راستی ئەم قسە بزانین دەبێ پیاچونەوەیە بۆ شارستانیەتەکان بکەین لەکۆندا شارستانیەتی ئیسلامی و هیندی و شارستانیەتی

فیرعەونی کۆن و شارستانیەتی چینی  هەموویان پێشەنگی پێشکەوتنی زانستی و مرۆڤی بوون لە کاتە جیاوازەکانی مێژوودا هەمووشیان شارستانیەتێکی دینی بوون و بێ باوەر نەبوون ، بۆنموونە شارستانیەتی ئیسلامی دین پاڵنەری سەرەکی بوو بۆ پێشکەوتنی زانستی لە سەردەمە زێرینەکان بۆ پێشکەوتنێکی ئیسلامی زانستی  ، هەرکات ئاسۆیەکی نوێ لە زانست و زانین ئاشکرا دەبێ دەبووە بەڵگەیە بۆ گەورەیی خوودا و نیشانەکانی  نەک بۆ ئینکاری خودا و رەفزی دینەکەی ئەگەر ئەمە مێژووبێت کەواتە چیبوو  جیهانی رۆژئاوای بۆ ئەو ئاراستە برد کە رەفزی دینەکان و بوونی خوای ئەکرد؟

سەردەمی هەستانەوە لەئەوروپا ئەو دەمەی هەمووشت دەستی پێکرد !

حاڵەتی رزگار بوون لەکەنیسە باوەش گردنەوە بۆ ئیلحاد و بێ دینی لەسەردەمی هەستانەوە بوو لەسەدەی 14 بۆ 17زاینی دەربارەی ئەمە "دێنیس جی جی رۆبێرشۆد"  دەڵێ : ( بەرێژەیەکی زۆر لەسەدەی 14-17 بەڵگەو پاسەوەکان کۆبوونەوە بۆ ئیلحادی مۆدێرن )

ئەو ڕەخنانەی تاکی ئەوروپی مۆدێرن لەدین دەیگرێ   سێ هۆکاری سەرەکی هەیە لە پشتیەوە :

ـ ئەو تحریف گۆرینەی لە دینی مەسیحیەتدا کرا کە بەهۆیەوە لەچوارچێوەی عەقلی مرۆڤ دەرچوو بەدوایدا دەرهێنانی  لەمێشکی ڕۆژئاوای چ بەڕێگای زانستی یان سیاسی .

ـ زۆری زوڵم و خراپەکاریەکانی دەسەڵاتی مەسیحیەت دە سەدەکانی ناوەراست

ـ فراوان بوونی ئاگایی ئەوروپی لەدەرەوەی بازنەی کەنیسە

واتا مەسیحیەت بوو بە دینێکی ناڕاست فەزایەکی لەباری دروست کردبوو بۆ لەدایک بوونی ئیلحادی مۆدێرن ، مەسیحیەت وێنای خۆی وەک دەسەڵاتێکی خوایی دەکرد لەگەڵ زووڵم و ستەمێکی زۆر بەناوی خووداوە دەیکرد و چەندین خورافات و قسەی نازانستیشی تێکەڵ بوو بەهۆی گۆڕینی دینەکەوە بۆیە مەسیحی ڕۆژئاوای هیچ بەڵگە و خاڵێکی پێ نەبوو بەرامبەر بە هێزی پێشکەوتوی زانستگەری ئەوروپی لێرەشەوە ئیلحادی مۆدێرن دەستی بە گەشە کرد لەسەر حسابی شارستانیەتی مەسیحیەتی ڕۆژئاوایی..

📖مەسیحیەت دەرگای ئیلحادو دینێکی گۆراو !

ئەو گۆڕانەی لەماوەکانی سەرەتای دینی مەسیحیەت بەسەریدا هات هەروەها ئاگایی خەڵکی بەو گۆڕانانە خاڵێکی جەوهەری بوو بۆ رەفزی دین خەڵکی تێر بوون لەئاینی مەسیحیەتی گۆڕاو کە شێوەیەکی بت پەرستی وەرگرتوو و چەمانەوەیەکی تەواوەتی دینەکە بۆ هەر گۆڕانکاریەک کە ڕووی بایە و چری دژایەتی کردنی بۆ بابەتەکانی مێشک و بچرانێکی مێژوویی لە سەرچاوەکانیدا ئەمانەش بەهۆی گۆرانکاری لەدینەکەوە ڕوویداوە کەبوون بەهۆکارێک تاکی ئەوروپی لەکەنیسەوە بەرەو ئیلحاد برۆن "پێری لێکۆمتی دینوێ "دەڵی:( باوەڕ هێنانی خەڵکی بۆ دینی مەسیحی بەو تەفسیرانەی لەسەدەی سێیەوە پێش دەست کەوتووە ، و بایەخ نەدان بە راستیە زانستیەکان هەموو ئەمانە بوو بەچەکێکی زۆر بەهێز بۆ مولحیدەکان دژ بەدینی مەسیحیەت )

**گەورەیی زووڵمی کەنیسە و ڕەشی مێژوویيان !**

کەنیسە دەورێکی سیاسی هەبوو لەسەدەی ناوەڕاست ئەو پاشایەی کەنیسە لێی ڕازی بوایە وایان دادەنا ئاسمانیش لێی ڕازیە بۆیە هەر ڕەخنەیە لە پاشا وەک ڕەخنە بوو لە خودا ، کەنیسە بریتی بوو لە ئەو دامەزراوە باڵایە کە مەسیح داینواە لەزەوی بۆ ئەوەی نوێنەرایەتی ئەو بکات دوای گەڕانەوەی مەسیح بۆ ئاسمان وەک "ئامبا گریگۆریس" دەڵی ( کەنیسە تاکە دامەزراوە بوو لە مەسیحیەت ئەدوا و پاپاکان و قەشەکان و پیاوانی ئاینی دیکە هەڵگری ئەم پەیامە بوون لەژێر ئەم چەترەدابوون بۆیە خەڵکی تەنها چاوەڕێی حەق و چاکەی لێیان دەکرد بەڵام واقع پێچەوانە بوو)

(بۆیە کەنیسە لەمێژوویدا پڕ بوو لەزووڵم و ستەم ، کەنیسە لەسەدەکانی ناوەڕاستدا پاساوی بۆ زووڵم و خراپەکاریەکانی خۆی ئەهێناوە و هەوڵیدا قەناعەت بە هەژاران بێنیت و قبووڵی واقع بکەن ئەگینا دژی بریاری خوان ئەمەش یەکێک لەگەورەترین هۆکارەکان بوو خەڵکی بەرەو لادینی و دواتریش بەرەو ئیلحادی بردن)

"جاد المنفلوطي کتێبی مێژووی کەنیسە لەسەدەی ناوەڕاست پەرە 39 "

بەرەوپێشچوونی هۆشی ئەروپی و فروان بوونی تێگەشتنی لەدەرەوەی سنوری کەنیسە هۆکاری سەرەکی بوو بۆ بۆ دیاردەی بێ دینی خەڵکی بۆیان دەرکەوت ئەو دینە گۆڕاوەی مەسیحیەت بانگی خەڵکی بۆ دەکرد کاتێک معلومات و زانیاری لەسەر بوارەکانی ژیان دەدا خۆی بەحەقی یەکەم

دەبینیەوە و بەرامبەرەکەشی بە ناحەقی تەواو ، خەڵک بەتێپەرینی سەدەکانی هەستانەوە و چاکسازی (سەدەی14-17) بۆیان دەرکەوت ئەو زانیاریانە مەسحیەت دەیلێت لەسەر بوارەکان وانین لێرەشەوە وای کرد بۆچونیان لەسەر دینەکە بگۆری و  بۆچونیان جیابکەنەوە لەدین ..

لەگەڵ گەشتە دەریاکان و بەریەک کەوتنی تاکی ڕۆژئاوایی لەگەڵ گەلانی دیکەدا تێروانینیان بەرو ئاسۆیەکی فراوانتر کراونەوە و لەگەڵ بەریەک کەوتنی مەسیحیەت لەگەڵ بۆچۆنی دینەکانی دیکەدا تاکی ئەوروپی زیاتر دوورکەوتنەوە لە مەسیحیەت ، دواتر کۆمەڵی بیردۆز و لایەنی سیاسی پەیدا بوون دژی داگیرکاری کەنیسە لەژیانی گشتی خەڵکدا و ڕفزکردنەوەی دەسەڵاتی پاشایەتی وەک نوێنەری خودا لەسەر زەوی بۆیە بانگی خەڵکی بۆ دەسەڵاتی کۆماری کرا بۆ ئەوەی خەڵکی حاکم هەڵبژێرن ..دەسکرا بەدروستکردنی زانکۆکان ئەمەش قۆرخکاری کەنیسەی شکان لە دروستکردنی زانست و زانیاری لەسەر باسەکان و گواستنەوەیان ، زۆرینەی ئەو فەیلەسوفانەی بۆ بێباوەری لایاندا و ڕەتیانکردەوە دواتر نوێنەرانی ئەم زانکۆیانە بوون.

لەدەرنجامدا جوڵەی سیاسی و بەرەوپێشچونە فیکری و  زانستیەکان گۆرانکاریەکی بنەچەیی دروست بوو لە ژیانی ئەوروپی  هەروەک مێژوو نووس و فەیلەسوفی ئەمریکی جۆن هێرمان ڕاندڵ دەڵی(زۆر بوونی گەشە و رزگاربوون لە وابەستەکانی مەسحیەت ڕۆژگار سەلماندی کۆت بوون )ˇ

دوای باش بوونی گوزەرانی خەڵک و زیادبوونی تواناکان و ژیانیان بەراوردی خۆیان دەکرد لەنێوان ژیانی ژێر کەنیسە و ژیانی لە حاڵەتی نوێیان  بۆیە لەمێیشکی زۆریان چەسپا دین  هۆکاری سەرەکی بۆزوڵم و دواکەوتن و ستەم لەبەر ئەمە ڕایاکرد لێی پشتیان کردە یاسا و نوسراوەکانی ...

واقعی ئێمە وئەوان !

کۆبونەوەی ئەم هۆکارانە لە سەدەی 14 هەتا 17دا دینەمۆی سەرەکی بوو بۆ ڕەخنە لەدینی مەسیحی وە دڵنیابوونەوە لەوەی راستیەکان لەدینی مەسیحیەتەوە نایەت ، بۆیە ئەم گلەیانە گۆران بۆ حاڵەتێکی بێ بڕوایی دوایش بۆ  ئیلحاد تێکەڵی کۆمەڵی مەزهەبی فەلسەفی بوون کە بەراستەوخۆ دژایەتی دینەکانی دەکرد ئەم مەزهەبانەش لەوکاتەوە تا ئێستا تاکی ئەوروپی پەروەردەدەکا ئەو مەزهەبانە بەرهەم هێنی ئەم واقعە مادیە ئیلحادیە سەرسەختەی مۆدێرنە لە ئەوروپا ، پێشوەچونی ئیلحادی رۆژئاوایی بەهۆی مێژووی رۆژئاوا خۆیەتی  هەندێ لەوەی لە ئەوروپا  ڕوویدا بەشێوازێ دەروانن وەک بڵێی مێژووی ئەوروپی ڕێرەوی مێژوو هەموویەتی بەمانەیەکی دیکە چی بەسەر مێژووی ئەوروپی بسەپێ بەسەر هەموو مێژوو دەبێ بسەپێ لەلایان !  ، وە شارستانیەتەکان بەهایان بەپێی شارستانیەتی ئەوروپا دیاری دەکرێ وەک بڵێیت گەر بێتو ئێمە دین ببرین و وازی لێ بێنین نزیکتر دەبینەوە لە پێشکەوتن بێ گوێدانە ئەو هۆکارانەی لە ئەوروپا رویان داوە بۆیە ناتوانرێ ئەم بیرۆکە بەسەر هەموو شارستانیەتێک بەجێ بگەینرێ...

بەڵام هەروەک ابن خلدوون ئەڵی:

گەلی دوڕاو و بەزیوو حەزیکی زۆری لە لاسایی کردنەوەی گەلی براوە و زاڵ هەیە لە دروشم و جل و بەرگ و هەمووکاروبارەکانی ژیانی واقعیدا ..!!

# ٢٢ _ فیترەتی پەرەستن و ڕەوشت و هۆشیاری

📓فیترەتی پەرستن و ڕەوشت و هۆشیاری.

فیترەت یەكێكە لەسەرچاوەكانی بەڵگە هەرچەن گەر لەناو نەفسیشدا بوونی هەبێ سەرەڕای ئەمە بەشی خۆی هەیە لەسەلماندندا ، سەلماندن بەرێگای فیترەت لەو بەڵگانەیە كە ئەولەویەتی هەیە چون خو و رەوشت زیاتر حەزە جەستەیە مرۆڤیەكان كۆنترۆڵی دەكەن بۆیە هەست كردن بەبوونی خوودا و ملكەچبوون بۆ دروستكارێک لەسەرووی مادەوە شتێكی سروشتی و بەڵگەنەویستە لەمرۆڤدا و لەكاریەگەریەكانی سروشتەش ئەوەیە زمان بەدەربرین ئاماژەی پێكات، هەندێک جار لەكاتی ڕووداو و كارەساتەكان لەوكاتەی مرۆڤ دەپاریتەوە بۆ لادانی ئازار و زیان ئەم فیترەتە دەردەكەوێ ..

پەرەستن فیترەتێكە و یەكێكە لە پێویستیە سەرەكیەكان مرۆڤ وەک چۆن گۆشت و ئێسقان پێكداچوون بەوشێوە ئەم فیترەتەش تێكەڵ مرۆڤ بووە ، هەر ئەم تێكەڵبوونەیە وا دەكا مرۆڤ مردن و سوتاندن و ئازار قبووڵ بكات بەڵام دەسبەرداری باوەرەكەی نەبێت ، هەموو دینێک بانگی شوێنكەوتوەكانی دەكات بۆ ماڵێكی دیكەی نەبراوە هەیە ، بەخوێندنەوەیەكی مێژوو بۆمان ڕوونەبێتەوە هیچ گەلێک و نەتەوەیەک نەبوو باوەرێ بەوە نەبێ خوودایەک ئەم زەوی و گەردوونەی دروست كردووە ، لە دواكەوتوترین هۆزەكانی ئەمازۆن و ئوسترالیا و سیبیریاوە و ڕووتەكانی ئەفریقاوە هەتاوەكوو فەیسلەسوفەكان و پێشكەوتوترین شارستانیەتەكان باوەریان بەخوودایەک هەبووە كە گەردوونی دروست كردووە و لەسەرووی دروستكراوەكانەوەیە ، ئەم یەكبوونە جیهانیە لەسەر ئەو باوەرە لە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاو و باكور و باشور و هەموو زەمەنەكان ئەمە دەر خەری ئەوەیە كە تەقلیدێک و فێربوونێک نەبووە مرۆڤەكان لەنێوان

یەکدیدا فێری یەکی بکەن بەڵکو ئەم هەستە ئیلا هەستێکی فیتری بووە لەمرۆڤدا

بۆیە پێکهاتەی خورەوشتی مرۆڤ هەستێکی گشگیری دینی تێدا مەوجودە بەڵگەش ئەوەیە کە دەریاوانەکان بینیانە لەکاتی دۆزینەوە ئەمریکا و ئوسترالیا لەکاتێکدا کاتێ کۆمەڵی خەڵکیان بینیوە هیچ شارستانیەتێکی سەر زەویان نەبینیە بەڵام خاوەن هەستیکی پەرستن بوون ، کەواتا هەموو خەڵکی ئاماژە دەکەن بۆ دروستکاری سەرەرای جیاوازی رێگاکانیان و دەربرینەکانیان بۆ ئەو دروستکارە ...

پێغمبەران نەهاتن بۆ ئەوەی قەناعەت بەخەڵکی بکەن بەبوونی خوا بەڵکو بانگیان کردن بۆ تەوحید و یەکخواپەرستی ، خەڵکی لەکۆندا ئینکاری لەبوونی خوودای ناکرد، بەڵکو گومانیان هەبوو لە بانگێشتی پەیامبەران ، هەر لەبەر ئەوەشە هیچ نەتەوەیەک نیە لەمێژوودا بێ خوودا بێت گەر بێتوو دینەکەشیان گۆرابێ بێت و مەبەستیان الله نەبێت هەر پەرستنیان ئەنجامداوە ، ئەمە بەڵگەیە بۆ ئەوە ناسینی خوا جێگیر بووە لە ناخی مرۆڤدا ، ئەم پەرستنە پێش هەموو داهێنانێکی زانستی مرۆڤێ بووە ئەمەش واتای ئەوەیە مومکین نیە داهێنانێکی مرۆڤ بیت بەمانایەکی دیکە ناتوانرێت ئەم هەستە لەدڵی مرۆڤ دابېرێ چونکە پەرستن تێکەڵی دڵی مرۆڤ بووە بۆیە پەرستنی خودا خاڵێکی هاوبەشە لەنێوان هەموو دینەکاندا تەنانەت ئەوانەش بت دەپەرەستن...

بۆیە هەرچەن دینەکە خورافات و ناراستی تێدا لەوەیە بەشێکیان سیفاتەکانی خوودا لەدارێکدا ببینەوە هەندێک لە بەردێک یان مرۆڤی کە پەرەستویانە ، ئەو شتە مادیانە کە بۆی دەچەمێنەوە وێنای ئەو دەسەڵاتە غەیبەیان بۆکردووە ، بۆیە عیبادەتیان بۆ هەموو مادەیە کردووە کە وایان زانیبێت ئەو هێزە غەیبیە تێیدا کۆبووەتەوە ، کەواتا پەرستنی فیتری ماناکەی ئەوەیە رجا و تکا و پارانەوە لە هێزێ کە

زیان و خێری لایە و لەسەرووی دروستکراوەکانەوەیە ، کەواتا لێرەیا دەبینین خەڵکی کۆن و ئێستا ئیمانی بەتەواوی بەبوونی خوودا هەیە بەڵام وێنای دەکەنە شتە مادیەکانەوە چونکە پەرستن شتێکی فیترەتی مرۆڤە و لەئەسڵی مرۆڤدا بوونی هەیە دەکرێ بگۆردرێ بەڵام ناکرێ بکوژێتەوە ، دەتوانریت بەلا رێدا ببرێت بەڵام ناتوانرێت بسرێتەوە ، تەنانەت ئەوانەشی مولحیدن و باوەریان بە بەبوونی خوودا نیە ، ناتوانن نەفی سیفاتەکانی بکەن بەڵکو دەیدەنە پاڵ شتێک بەناوی سروشت ...

هەروەها فەیلەسوفە کۆنەکان بوونی دروستکاریان جێگیر کردووە و ئینکاریان نەکردووە ، فیترەتی دینی هێزێکی زاڵە ، بەتوند و تیژی و شەرکردن لەگەلیدا هێزی بەرگری لەخۆکردنی زیاد دەبێ ، لەکۆتیاشدا دووژمن و دۆستەکانی ناچاری ملکەچبوون دەکات چونکە سەرچاوەی سروشت و خورەوشتی مرۆڤە وە چونکە فیترەتی مرۆڤیش زاڵە بەسەر هەر لایەنێکی دیکەیدا بۆیە هەروەک "دراز" ئەڵی لە کۆتایی زانستی مرۆڤدا ناگات بەکۆتایی هاتنی دین بەڵکو گڕی دین توند تر دەکات تەنانەت دانەران و گەورەکانی بیری فەلسەفەی واقعی گەشتون بەم راستیە ، دان نان بە فیترەتی ئیمان وای لە مولحیدەکانی وەک" ئۆگەست کۆنت "کردووە بڵی لەناوچوونی دینەکان دەبێتە هۆی کۆتایی هاتن بە بەرەو پێشچوونی زانست ، بۆیە هەموو ژیانی خۆی تەرخانکرد بۆ دۆزینەوەی دینیکی نوێ وەک بەدیلێک بۆ جەژن و بۆنەکانی دینی مەسیحی کاسۆلیکی ...

کەواتا پێغمبەران هاتون بۆ ڕزگاری فیترەتی مرۆڤ و بەدەمەوەچوونێکی دروست بۆ داواکاریەکانی فیترەتی مرۆڤ خوای گەورە هێز و غەریزەی سروشتی بە مرۆڤ بەخشیووە هەتا بەشێوازێکی سروشتی بەکاریبێنێت لەگەڵیشدا بەڵگەکان و رێبازەکانی بۆناردووە ، بۆیە مرۆڤ بەسروشتی ئاگای لەچواردەوری خۆی هەیە

لەکاتی مەترسی دەترسێت لێرەشەوە دەگەڕێتەوە سەر فیترەتە ئەساسیەکەی کە پەرستنی خودای تاقانەیە ..

📓فیترەتی ڕەوشت

فیرعەونەکان ، مایا ، یۆنانی کۆن ، ئەزدەک ، حەتا شارستانیەنی ئیسلامیش ، هەموو ئەم ناوانە شارستانیەتێکی  مێژووین لەگەڵ ئەوەی زۆر جیاوازی هەیە لەنێوانیان بەڵام خاڵێکی هاوبەش هەیە لەنێوان هەموویان ئەویش "دینە" لەم سەردەمیەدا هەندێک مرۆڤ یاخیبوون لەو حەقیقەتە چەسپاوە مێژووییە ، ململانێیان لەم چەمکەشدا دروستکردووە ، ئەوان بێ ئاگان لەوەی گەر هەوڵی سڕینەوەی دین بدەن حاڵەتێ مەترسیدار دروست دەبێ  کە "زێگمۆن باوماند "دەربارەی  دەڵێت (ئەو کەسانەی باوەڕیان بەبوونی خودا ناکەن دەی با باوەر بەژیانی خۆشیان نەکەن )

چون مرۆڤ لەئەسڵدا بەبێ بونی دروستکارێک نایەتەبوون

ئەوکەسانەی باوەریان بەبوونی خوودا نیە کەواتا باگوومان لەهەبوونی ژیان و بوونی خۆشیان بکەن ...!!

واتا چۆن گومان لەژیانی خۆشیان؟!

مەبەست لەبوونی مرۆڤ چیە ؟

بوونی مرۆڤ هەموو ئەو بەها ڕەوشتی و ئەخلاقیانەیە کە لە ئاژەڵی جوودا دەکاتەوە ،  خوودا بەندەکانی ئیلتزام بەم بەهایانەوە دەکات ، باوەڕدارانیش بەجێی دەگەینن بۆ بەرێووە چوونی کار و باری  ژیانیان و وەرگرتنی پاداشت لەسەری بەڵام لەوانەیە گوێت لەم ڕستیە بوو بێت دەڵێ (دینت پێویست نیە بۆ ئەوە کەسێکی بەرەوشت و ئەخلاقبیت) یان ئەو قسەی دەڵێ مولحیدەکان خاوەن ئەخلاقن !

**بەڵام با بپرسین لەسەر چ ئەساسێکی بەهایی ئەم رەوشتە مرۆڤانەیان یان ئەم ئەخلاقەیان دروستکردووە .. ؟!!**

**ئایا ئەم کەسانە خاوەنی بەهایەکی ڕەوشتین بۆچی ڕەوشتەکانی مرۆڤ و ئاژەڵ لێک جوودا دەکەنەوە؟**

**وەهەر بەراستی جیاوازی دەکەن لەنێوان رەوشتەکانی مرۆڤ و ئاژەڵدا ؟! یان بەمانایەکی دیکە بۆچی مولحیدەکان پابەند دەبن بەیاسا ڕەوشتیە ئاسمانیەکانەوە ! لەکاتێکدا ئەوان باوەڕیان بە دانەرەکەی نیە ..؟!!**

**هەروەک "مایکڵ ڕووس" فەیلەسوفی مولحیدی رووسی دەڵی : ( پێناسەی ئەخلاق و رەوشت ئەوەیە ڕەوشت و ئەخلاق یارمەتی دەری مرۆڤە بۆ مانەوە و زۆربوون بەڵام جگە ئەم پێناسە هیچ پێناسەیەکی تری ئەخلاق بوونی نیە ، هەر مانایەک و پێناسەیەکی قوڵتر بۆ ئەخلاق و رەوشت وەهمیکە و هیچیکە)**

**ئەخلاق لە جیهانیکی مادی بەبێ خوودا وەهمێکە هەروەها شتێکی بێ بەهایە چون مادە دان بە بەهادا نانێت ، بەتێروانینی ئیلحاد مادە مامەڵە لەگەڵ واقعی هەستپێکراو دەکات دیاریکردنی نرخ بۆ مادە و شتەکان شتانێکن مرۆڤ دایرشتووە نەک خوودی مادەکان ! کەوایا بۆمان نیە ڕەخنە لە هەڵەکانی هیتلەر بگرین ، ئەوکاتە ڕەخنەکە هەرەمەکی و بێ بنەما دەبێت چونکە ئیلحاد پێی وایە هیچ پێوەرێکی رەوشتی نیە بۆ دیاریکردنی شەر و خراپە ! هەروەک رێچارد دۆکینز دەڵێ : (چی شتیکە وا لەئێمە دەکات بڵێین هیتلەر لەسەر هەڵە بووە ؟ پرسیاریکی قورسە بۆمان ! )**

**گەر ئەم قسەی دۆکینس بکەین بە پێوەر بۆ هەموو کارێک کەوایا چی شتێک وا لەکارەکان دەکات شورەیی و ناشرین بێت و خراپبن ، چی پێوەرێکمان هەیە بۆ باشە و خراپەی کارەکان ..!؟؟ بەپێی ئیلحاد هیچ پێوەرێک بوونی نیە ..!!**

ئێمە دەزانین لایەنی ئەخلاق و رەوشت مەرجی زەروریە بۆ بەها مرۆڤیەکان ، هەر ئەم رەوشت و ئەخلاقەشە کە سنورێک بۆ ئازادی ویست و حەزەکان دادەنێت

مەسەلەکە تەنیا هیتلەر نیە بەڵکو هەموو زاڵمەکانی مێژووە کەواتا ناتوانین لێپێچینەوە لەستالین بکەین مەگەر بلێن جینات ستالینی بەرەو ئەو هەڵە گەورانە برد ! ئایا ئەمە پاساوە !!؟ ، ئەم فیکرەیە زۆرێک مولحیدەکان باورەیان پێیەتی کە گوایە مرۆڤ توانای بەسەر کردەوەکانی خۆیدا نیە هەر ئەمەش وای لە "سام هارس" یەکێک لەچوار سوارچاکە گەورەکەی ئیلحاد کردووە کتێبێک دابنێنی ئازادی دەڵی ( ئێمەی free will ویست و حەزی مرۆڤ رەتکاتەوە بەناوی مرۆڤ ئازادنین لە ئیرادە و ویستەکانمان ، زۆر بەسادەیی ئیرادە و ویستی ئێمە دروستکراوی دەستی خۆمان نیە ) سام هارس پێی وایە مرۆڤ لەژێر کۆنترۆڵی خۆیدا نیە هەموو ویستی ئێمە بەهۆی کارلێکە کیمیایی و دەماریەکانی مێشکمانە نەک ویستیکی سەربەخۆی ئێمە ! هەربەم شێوەش پاساو بۆ ستالین و خراپەکارەکان دێننەوە

ئەمەش هەمان دەرئەنجامە کە زانای بایلۆجی خاوەنی خەلاتی نۆبڵ پێی گەشتوە "فرانسس کریک" لەسەرەتای کتێبەکەی بەناوی "گریمانەی سەرسامکەر" دەڵی ( گریمانەی سەرسامکەر بریتیە لە تۆ (تۆیت) دڵخۆشیەکان و ناخۆشیەکانت ، رابردووت و تموحەکانت ، هەستکردنت بە کەسایەتی خۆت و ویست و ئیردەی ئازادتت ، هەموو ئەمانە ڕەوشتێکن لە کۆبوونەوەی گەورەی دەمارەکان و گەردیلەکان دروست بوون )

ئەگەڕ ئێمە ئەم قسانە بەراست دابنێین لەکۆتایی رێرەوەکە خۆمان دەبینینەوە کە سەیری گەردوونێکی هەڕەمەکی دەکەین و ئەوەی تێیدا

لە گەردیلەکان و مادەکان دەجوڵێن بەپێی یاسایەکی هەرەمەکی و عەشوای و نەبەها و نەقیمەت و نە ئامانجیان نیە هەر لەخۆیانەوە دەجوڵێن !

زانای مێژووی فەلسەفە و مێژووی بایلۆجی زانکۆی کۆرنێل "ویلیەم پرۆڤاین" لەیەکێ سیمیناەکانیدا دەڵێ: (رێگەم بدەن با بەروونی پێتان بلێم زانستی بایلۆجی پەرەسەندنی ئەمرۆ چی دەڵی دەبێ بلێم ئەمە بۆچونی داروینە کە دەڵی خودا نیە ، ژیانێک نیە دوای مردن کاتێک دەمرم تەواو نامێنم ، هیچ بنەچەیەک نیە بۆ رەوشت و ئەخلاق ، هیچ ئامانجێک نیە لەژیان ، هیچ ئیرادە و ویستێکی ئازاد و سەربەخۆ بوونی نیە بۆ مرۆڤ )

چەن ژیانێکی بێزارکەر و ناخۆشە ، ژیانێک کەسی مادی توشی زۆر نارەحەتی دەبێ لەژیانێ بێ خوودا

نارەحەتیەک "جۆن بۆڵ سارتەری" فەیلەسوفی پۆڵەندی مولحید لەسەری دەڵی ( بوونی مرۆڤ ئاڵۆزی و شڵەژان و نارەحەتیەکی زۆرە بەبێ بوونی خوودا لەبەرئەوەی بەبێ بوونی بێ توانا دەبین لەدوزینەوەی هیچ بەهایەکی ڕوون لە ژیاندا چونکە لەهیچ شوێنی نەنوسراوە کە خێر و چاکە بوونی هەیە یان دەبێ مرۆڤ راستگۆبیت و درونەکات ، کەواتا هیچ چاکە و خێرێک بوونی نابێت چون هیچ تێگەشتنیکی واقعی نیە بۆ کردنی ئەو چاکەیە ، تێگەشتنی پاداشتی نەبراوە چاوەڕێی بکا لەپێناوی کردنی چاکەدا )

هەر ئەمەش لێکۆڵێنەوە تازەکان پێی گەشتون ، لێکۆلینەوەیەک کە ڕۆژنامەیەکی ئەمریکی پێی گەشتووە ساڵی 2004 باس لە خۆکوشتن و پەیوەندی بە دینیەوە دەکات ئەمە ئەنجامەکە بوو ( ئەو کەسانەی بێ دینن هۆکاری کەمیان پێیە بۆژیان و وەهیچ پاڵنەرێکی ئەخلاقی و رەوشتیان پێ نیە بۆ ئەوەی خۆیان نەکوژن)

لێرەوە دەگەینە ئەو ئەنجامەی لە ئیلحادا هیچ بەهایەکی ڕەوشتی و ئەخلاقی بوونی نیە ! بەبێ ئەوەی خۆشیان ئاگاداربن ئەوەشی تێیاندایە لەئەنجامی کاریگەری دینە ئاسمانیەکان و باوەڕدارانە ! ئەخلاق و ڕەوشت یەکێکە لەو باسانەی ئیلحاد هیچ مانایەکی بۆ دروست ناکات !..

📔فیترەتی هۆشیاری

ئەو بیر و باوەرانەی لە هزری مرۆڤەوە سەرچاوەدەگرن لەوێنە ڕووکەش و مادیەکەیدا زۆر جیاواز نین لەدەنگی با و دەنگی مەیمون هیچ تایبەت مەندیەکی دیاریکراوی نیە چون پێش هەمووشتی مێشکی مرۆڤ قەبارەیە لە گەردیلە و مادەیە نەزیاد و نەکەم ئەمەش ئەو وێنایە کە ئیلحاد بۆ فیکرەکانی بەگشتی دەکێشی باشە گەر بێتو وابێت بەهای ئێمە چیە ئیتر ؟

زانای بایلۆجی و بۆماوەزانی پەرەسەندن "جۆن هۆڵدن " دەڵی ( گەر بێتۆ چالاکیەکان و فیکرەکانی مێشکم دروست بووبێت بەهۆی جوڵەی گەردیلەکانی مێشکمەوە ئەوکاتە هیچ مافێکم نیە بلێم باوەڕەکانم ڕاستن دەکرێ بلێین فیکرێکی کیمیایین( چالاکی کیمیایی مێشکی) بەڵام ناتوانین بلێین مەنتیقین )

گەر بێتو بەوقسەیەی ئەو زاناش نەبێ فیکرەکان و باوەڕەکانمان بەتەواوی مادی نەبن ئەوا بەپێی داروینیزم لەمێشکیکەوە دروست بووە کە پەرەسەندنی لەمێشکی ئاژەڵانی نزمترەوە کردووە ، ئەمەش ئەو باس و کێشەیە داروین باسی لێوە کردووە لەیەکی لە نامەکانیدا کە دەڵێ: ( زۆرجار گومانێکی ترسناکم بۆدێ لەسەر باوەڕ و قەناعەتەکانی مێشکی مرۆڤ چونکە ئەو مێشکە پەرەی سەندووە لەمێشکی ئاژەڵەکانی ترەوە ئایا دەکرێ خاوەنی هیچ نرخ و سیقەیەک ببێت ؟

ئایا کەس لەئێوە دەتوانی باوەر بە باوەرەکانی مەیمونێک بکات تەنانەت گەر فکر و بیری هەبێتیش ؟ )

باسەکە لێرە کۆتای نایە بەڵکو ئەو پەرەسەندنەی مێشکی مرۆڤ هەیەتی لەم سەردەمە بەپێی قسەی داروینیزمەکان هیچ خاسیەت و نرخێکی پێنادا بەڵکو هەموو نرخەکانی لێکاتەوە بەڵکو مێشکمان بۆ ئەوە پەرەی نەسەندووە نهێنی و زانستەکانی گەردوون و ژێر زەوی بزانی بەڵکو وەک "فرانسس کرێک" دەڵی: ( مێکشی ئێمە لەژێر پاڵنەری زانینی زانستەکان گەشە و پەرەی نەسەندووە بەڵکو بۆئەوە پەرەی سەندووە ئێمە تارادەیەک زیرەک بین بۆ ئەوەی بتوانین لەژیان بمێنینەوە )

بەمانایەکی دیکە زانای دەروناسی "ستیڤن بێنکر" دەڵی (مێشکی ئێمە بۆ خۆگونجادن لەگەڵ دەوروبەر پەرەی سەندووە نەک بۆ زانینی راستیەکان  هەندێک جار هەوڵدانمان بۆ گەشتن بە راستیەکان بۆ خۆگونجاندنمان بووە لەگەڵ ژینگەدا و هەنێجاریش بۆ خۆگونجان نەبووە )

سا چ هۆش و ئاگایەک لە مێشکی ئاژەڵەکانی جیهانەوە هاتووە بۆئەوەی ململانێی مانەوە بکات ؟ بەچ پێوەرێ پێمان وایە ئەوەی مێشکمان دەیزانی دەربارەی راستی و زانستەکان راستیە ؟  گەر بەقسەی خۆشیان بێ ئێمە بۆ ئەم چالاکیە مێشکمان دروست نەبووە ؟ وەلەئەساسەوە مێشکی ئێمە  دەتوانیت راستیەکان بزانیت  ؟ یان ئەو زانستانەی زانیوومانە کۆمەڵی وەهم نین مێشکمان دروستی دەکات بۆ ئەوەی ژیانمان بپارێزی..!؟

کەواتا ئەو پێوەرە مرۆڤیەی چاکە و خراپە دیاری دەکات دەربارەی گەردوون دەدوێت لەچالاکیە کیمایەکانی کۆمەڵێک مێشکەوە

دروستبووە دەتوانین پێی بلێین پێوەرانێکی کیمیایی بەڵام ناتوانین پێی بلێین مەنتیقی !

چۆن زانا مولحیدەکان خوودا لەزانست دادەبڕێنن یان بابلێین ئەو بنەچە سەرەکایانە چییە سێرچ و لیکۆڵینەوە زانستیەکان مرۆڤی لەسەر بنیادنراوە و وابەستەن پێوەی و بێ ئەو بنەچانە نابێتە زانست و ڕاستی ؟

[یەکەم] : باوەری مرۆڤ بە ڕێک و تەواوێتی گەردوون

زانای فیزیای تیۆری "پۆڵ دێڤز" دەڵی( هەموو زانستەکان لەسەر کۆمەڵی گریمانە دروستەبن گەر بێتو گریمانەکان دژی یەکیش بن بەڵام باوەریان بە رێک و تەواوێتی گەردوون هەیە ، هەرگیز ناتوانیت کەسێکی زانا بیت گەر باوەرت وابێ گەردوون تێکەڵەیەکە لە کۆمەڵێ ئەگەری ناتەواوی بێ مانا پێکهاتووە یان بێسنور عەشوایی و هەرەمەکی بێت )

ئێمە ناتوانین دراسەی گەردوونی بکەین گەر لەژێر کۆمەڵی یاسا نەبێت ، ئێمە قەت ناتوانین ئومێدی دۆزینەوە زیاتر بکەین لە گەردوونی گەربێتو هەرەمەکی و سوتفە بێت و

بێ یاسابێت ، ئێمە کاتێ دراسەی دەکەین بۆ ئەوەنیە بزانین هیچ نیە و گەردوون هەرەمەکیە بەڵکو بۆ ئەوەیە بزانین زیاتر هەیە یان بەوتەی زانای فیزیایی "جێرارت هۆفت" دەڵی ( ئێمە جوانی و ڕێکێتی و وردێتی گریمانەکانی خۆمان بینی لەسەر گەردوون و تەنۆکە سەرەتایەکان دوای ئەمانە نەوەستاوین هەوڵدەین زیاتر بزانین چون باوەرمان وایە زیاتر هەیە )

بوونی گەردوونیکی ڕێک و پێک و ورد و لەژێر کۆمەڵی یاسا بەس نیە بۆ دراسەکردنی دەبێ ئەم ڕێک و وردیە و لەسەر هەموو بەشەکانی دابەش بووبێ نەک تەنیا بەشێک چون ئەوکاتە گریمانە گەورەکانمان دەکەون وەک گریمانەی نسبیە ئەنیشتاین بۆنموونە کە لەسەر دوو نەگۆری سەرەکی دانراوە یەکەم: یاساکانی فیزیا وەک یەکە لەهەموو بەشەکانی دیکەی گەردوون

دووەم :خێرایی ڕووناکی وەک یەکە لەهەموو جێیەکی گەردوون

بەڵام چۆن ئەم باوەری ڕێک و پێکیە دزەی کردە مێشکی کەسێکی مادییەوە...؟!!

بەپێی فەیلەسوفی ئێرلەندی سی ئێس لویس مرۆڤ بوو بە کەسێکی زانستگەرایی چوون پێشبینی بوونی یاسایەکی جێگیر و نەگۆری دەکرد لەسروشتدا و باوەری بەبوونی یاسایەک کرد لەسرووشتدا بەسەر هەمووشتێ زاڵە چون باوەری بەبوونی دروستکارێکی ئەو یاسایانە هەبوو کە کامڵی کردووە ، ناتەواو و بێ یاسای نەکردووە ..!

[دووەم]: شیاوی گەردوون بۆ لیکۆڵینەوە و تێگەشتن ، زانا بەبێ ئەم متمانەیە بەرێکێتی گەردون نابێتە زانا

زانای فیزیایی خاوەن خەڵاتی نۆبڵ "چارلز تاون" دەڵی : ( ئیمان مەرجێکی زەروریە بۆ زانا هەتا دەست پێکات زانا پێویستی بە ئیمانێکی قوڵە بۆ ئەوەی ئەرکە قورسەکانی بەجێگەیەنیت بۆ؟ چون دەبێ دڵنیابێت کە گەردون ڕێکخراوێکی زۆر وردە و بێکەم وکورە و مێشکی مرۆڤ (مێشکی زاناکە) خاوەنی هەلێکە بۆ تێگەشتن لەو ورد و ڕێک و ڕێخراویەی گەردوونە ، بەبێ ئەم ئیمانە هیچ هەوڵ و کۆششی دروست نابێ لەلایەن مرۆڤەوە بۆ تێگەشتن لە گەردوون )

ژیان دەسپێناکا لەودەمەی ئینکاری خالق دەکەی وەک هەندێ لایان وایە ، بەڵکو لەودەمەی ئینکاری خالق دەکەی ئینکاری رەوشت دەکەی و ئینکاری نرخ و گرنگی عەقڵ دەکەی و ئینکاری مانای ژیان دەکەی ، ئینکاری تەواوێتی گەردوون دەکەی ، هەموو ئەوشتەی کەسانی مادی دەسیان دەکەوێ و بۆخەڵکی پێش دەخەن بریتیە لە:

( ژیانێکی بێ نرخ و بێ عەقڵ و بێ رەوشت ، گەردووێکی هەڕەمەکی)

ژیانیکی بێ ژیان

# ٢٣ _ حیجاب سیمبوولی شارستانیەتێک

شارستانیەتێکی زەبەلاح لە پارەچە قوماشێکی رەش دەترسێت!

بلیمەترین بیرمەندانی شارستانیەتی جیهانگیری ! لەپلان و بۆسەن بۆ لادانی پارچە قوماشێک !

جەنگی حیجاب....

هەتا ئێستەش ئیشەکانی ئێدوارد سەعید" زۆر بەکار دەهێنری لەبارەی ڕۆژهەڵاتناسیەوە که نیشانی دا کە چۆن وێنەیەکی ناشیرینی کۆمەڵگای ڕۆژهەڵاتی گیراوە! بە دواکەوتوویی، بەپێچەوانە لە بەرژەوەندی ڕۆژئاوادا کە بە وێنەی ڕۆژئاوای پێشکەوتووخواز و مۆدێرن و یەکسان لەقەڵەم دراوە. دروستکردنی ئەم کارەکتەرە بۆ ڕۆژهەڵات ڕێگەی دا بۆ پاساوی زاڵبوونی داگیرکاری فیکری بەسەر ژنانی موسڵماندا بەتایبەتی لەسەر مەسەلەی حیجاب کە پێشەنگی ئەو تیرە ژەهراویە بەناو شارستانییەتی پێشکەوتوخواز ! بوو ، جارێک لەجارەکان یەکێک لە گێرانەوەکانی فرانتز فانۆنم بینی لە دەقێکدا بە ناوی "شەڕی سەرپۆش"، بەقوڵی ئەوەم تێدا بەدی کرد فاکتەری بنەڕەتی لابردنی حیجابی ژنان جەزائیریەکان بوون سەرەتا لە کاتی زاڵبوونی داگیرکاری فەرەنسادا حیجابی ژنان بە هێمایەکی دواکەوتووانەی کۆمەڵگای جەزائیری دا دەنرا کۆلۆنیالیزم بەزەقی هەوڵەکانی لەو بوارەیا چڕ کردووبەوە کە ژنان بکاتە فاکتەر بۆ لێدانی شارستانێەتێک بە بڵاوکەرەوەی شارستانییەتی مۆدێرن تێیدا و یەکێک لە ئامانجی یەکەمیشی ئازادکردنی ژنانی جەزائیری بوو لە پیاوسالاری عەرەبی موسڵمان کە بەهۆیەوە لێکردنەوەی حیجاب لە شوێنە گشتییەکاندا دروست بوو ، لەوانە مانگەکانی 13ی ئایاری 1958 کە بە زۆری باسکڕاوە لەوکاتەوە کرابوون و وەک مۆدێلێک بۆ شەرعییەتی بوونی فەرەنسا لە جەزائیر ، ڕۆژئاوا کە دەستیان دایە

**لەنێو بردنی فیکری ئومەتێک بە تێکدانی فیکری ڕەگەزیک کە بنچەی کۆمەڵگای لەبن دەستە ئەویش ژنانە لێرەوە دێینە جەن پرسیارێک ....**

**ئاخۆ چۆناو چۆن توانیان ئەوە بەئەنجام بگەینن ؟؟**

**ڕۆڵی رۆژهەڵاتناسان چیبوو لەم پرۆسە ژەهراویە ؟؟**

**کێین سەرمەشەقانی بیری ئازادی ژنانی رۆژهەڵاتی ؟**

**لەهەمووشی گرنگتر تێروانینی پیاوی ئەوروپی سەبارەت بە حیجاب چیە؟ خوێندنەوەیان چیە بۆی؟**

**لەکۆتایەکانی سەدەی 19( ئی ئێچ میچێلی) کە کەسێکی ڕۆژهەڵاتناس بوو گەشتێکی کرد بۆ لیکۆڵینەوە لە دەوڵەتی عووسمانی بەناو شار و قەسر ومالّەکانی خەلافەتاکەدا گەڕانی کرد ، کاتێک گەڕایەووە وڵاتەکەی خۆی گەشتەکەی لە یادەوەریەکانی نوسیەوە بەناو نیشانی "٤٠رۆژ لە ڕۆژهەڵات" لەیادەوەریکانیدا لەسەر  ژنانی موسڵمان دەڵێ:**

**" لە ئێستا دەکرێ یارمەتی خوشکە لاوازەکانمان بدەین بۆ ئازاد بوونیان لەو کۆیلایەتیەیان ، من خۆم بە دڵخۆش دەزانم کە یارمەتیان بەم بەکەڵک وەرگرتن لەگەشتەکەم  ، بەڵام بینینیان بە دیلی و بەستراوەی لەو زیندانە ناشرینەیان شتیکە هیچ ژنێکی مەسیحی ناتوانی ئەوە هەڵگرێت "**

لێرەوە ببینن ئەوان لەمێژە لەبیری ئەو پلانەدان بۆ شارستانیەتی ئیسلامی ببینن ئەم بۆچۆنەی سەرەوە بەتەنها ئەو ڕۆژهەڵات ناسە باوەری پێ نیە ! بەڵکو سیاسیەکانیان سەرۆکی وڵاتەکانیان نوسەرەکانیان ! دەرهێنەری فیلمەکانیان! هەریەک لەلای خۆیەوە هەوڵی رزگارکردنی ژنانی موسڵمان ئەدەن !! لەبەندایەتی خوا بۆ جۆرە تازەکەی کۆیلایەتی کە هەمووجیهانی تەنیوە ، سەرەتا ڕۆژئاوا ئەم پلانە ژەهراویەی دەرخواری مەسیحەکان دا ژنانی مەسیحی لەماڵەوەبوون دەریانی کردە دەرەوە بۆ کارگە و ڤێلاکان بۆ ساغکردنەوەی بازرگانیەکانیان ،وەرگرتنی باج ! نەهێشتنی کات و مەجالی ژنان بۆ پەروەردە کردنی منداڵان ، پاشان چی ڕوویدا ژنەکان توشی داروخانی ئەخلاقی بوون لە شوێن کارەکانیان ، ئەوەندە کاتیان لەگەڵ شوێن کاریان بەسەربرد ئەوەندە لای خێزانی نابوو ، ئەرکی ژن لەفۆرمی خۆیدا نەما پەروەردەی منداڵیش کەوتە دەستی دایەنگەکان ئەوەی دەیبینین ئێستا ڕوویدا لەکۆمەڵگای ئەوروپی .

جا کۆمەڵگای ئەوروپی بەعام دەلێم کۆمەڵگایەکی داڕووخاوە بەها مرۆڤایەتیەکانی سفرە،کام بەها ؟ ئەو بەهایانەی،مرۆڤ لەئاژەڵ جوودا دەکاتەوە ، سەرەرای ئەوەش ئەو هەموو زیانەیان لەژن دا ئینجا دەستیان کردە بازرگانی کردن پێوەی ! لەکلیپ و گۆرانی ، لەسەر شامپۆ و تایت و بەرهەمەکانی دیکە! لە فیلم دراما جەستەی ژن بوو بە ئامرازی دەوڵەمەندکردنی چەندین کەس ، پلانی ئەو بزوتنەوە فێمینیزمانە رۆژئاوا بەتایبەت فێمێنیزمی جێندەر کە باوەری بەهیچ جۆرە جیاوازیەکی نێوان ژن و پیاو نیە! هەتا حاشا لە جیاوازیە بایلۆژیەکان دەکەن ! ژن بۆ ژن ! پیاو بۆ پیاو شتی سەیرتریش دەبینین لەداهاتوو بەرابەرایەتی فێمێنیزمیەکان کە زۆریکیان لە رێخراوەکانی بەناو مافی ژنان خۆیان شاردۆتەوە ، بۆیە وتمان سیاسیەکانی ئەوروپا و دەسەڵاتدارانی ڕۆژئاوا خاوەنی ئەم جۆرە بیرکردنەوەن بۆیە مومکین نیە هەردەبێ دەسەڵاتدارانی ڕۆژئاوا لەدوای ڕووخانی خیلافەتی عووسمانیەوە بەسەربازی و مەیدانی زەوی موسڵمانایان دەگیرکردووە پلانەکانیان بۆ رزگارکردنی ژنان !

بەدەسەڵاتی ڕۆژهەڵات خۆیان جێ بەجێی بکەن ! ئیدی بۆچی زەویەکانتی داگیرکردووە !! بۆئەوەی بەکرێگیراوەکانی لەباتی خۆی خەریکی بەجێگەیاندنی پلانی کۆلۆنیالیزمی ڕۆژئاوا بن !! ئەوان بەسەربازی هاتن لەکۆندا بەڵام شکستیان هێنا ئێستا سوودیان لەو ئەزموونەیان وەرگرتوە شارستانیەت بروخێنە بەرێگای فیکر ! سوودی فێمێنیزم ڕووخاندنی شارستانیەتی ئیسلامە ! بێگومان بزووتنەوە فێمێنیزمەکان لەلایەن دەسەڵاتدارەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەراستەوە داڵدە دەدرێن ! کەواتا جەنگی ئەمجارە زۆر گەورەیە ئەوەتا دەبینین چۆن کۆمەڵگاکانی ڕۆژهەڵات تێکشکاوە سەیری بەرهەمی پلانەکانیان بکەن لە 2000 هەتا ئێستا سەیری جلی ئافرەتان بکەن دەزانن ئێمە چەند دۆڕاوین .

مێژوونوس" لین سۆرتۆن "دەربارەی وتەکەی" مێچێل" دەڵێت " موسڵمانەکانی سەدەی نۆزدە بەتەواوی ڕێکەوتبوون لەوەی ژنان لەسەدەی نۆزدەدا ئازادی تەواوی چون و هاتنیان هەبوو ئەوان ژێر دەستە یان کۆیلە نەبوون بەڵکو چێژیان دەبینی لەو دەسەڵاتەی لەماڵەوە هەیانبووە"

لەوکاتەوە لەگەڵ ناسینێکی قوڵی دنیای ئیسلامی ، لێکۆڵەرەوەکان دەسیان کردووە بە بەدواداچون بۆ قەزیەی ئیسلامی ئەم لێکۆلەرانە پێیان دەوترێت "ڕۆژهەڵات ناسەکان " کە وێنەیەکی خەیاڵیان بۆ ئافرەتی موسڵمان کێشاوە ،

لە کتێبەکانیان و تابلۆکانیان وێنەی ژنانی موسڵمانیان کێشاوە وەک کەلوپەلێکی سێکسی لەژووری خەوتنی سوڵتان ! ، بە شێوەیەکی ئەفسانەیە وێنەی پیاوی موسڵمانیان وەک پیاوێکی باڵا بەرزی ریشداری بەهێز ، عەمامە لەسەر کردووە لەسەر سیسەمێکی خەوتن ڕاکشاوە چواردەوری هەمووی سەرین و ژنانێکی زۆرە وە وێنەی ئافرەتی موسڵمانیانی ڕۆژهەڵاتیان وەک زۆڵملێکراو و باڵ شکاو کە

هیچ نرخێکی نیە جگە لە ژووری خەوی سوڵتان نەبێت! واتا تەنها بۆچێژدان بەسوڵتان !

ئەمە بیرکردنەوەی یەکێکیان یان دوان نەبوو ، بەڵکو زۆرینەی ڕۆژهەڵات ناسە ئەوروپییەکان کاتێ ناوی ژنانی موسڵمان دەهێنرا ئەم وێنەی دەهاتە پێش چاو ، لێرەشەوە رۆژهەڵات ناسەکان ئەم وێنە ناراستەیان گواستەوە بۆ عەوامە رۆشنبیرەکەیان ! سیاسیەکانیان!

دەربارەی ئافرەتی موسڵمان هەتا ئەمرۆشمان ئەم گواستنەوەی وێنەر ناراستمان بەردەوامە!

ئێدوار سەعید دەلی" کتێبکی زۆر ناوازە هەیە بەناوی (الحریم کولونیالی) هی نوسەرێکی جەزائیریە بەناوی مالک عەلوولە پانزە ساڵ پێش ئێستا بڵاویکردەوە نوسخەیەکی لەکتێبەکەی خۆی بۆمن نارد چون زۆر سەرسام بوو بەکتێبەکەم (رۆژهەڵاتناسی) کتیبکی عەلوولەم کردەوە کۆمەڵی کارتی پۆستەم بینی کە سەربازە فەرەنسیەکان لە جەزائیرەوە ناردبوویانەوە بۆ فەرەنسا بینینم هەمووی ئافرەتە وێنەی ئافرەتی ڕووتە ، سەربازە فەرەنسیەکان کچان و ژنانی جەزائیریان دەگرت و دەیانبردن بۆ ژوورێکی زۆر خۆش وەک ژووری پاشاکان ! لەوی چەندین وێنەی ڕووتیان دەگرتن دەیان ناردەوە فرەنسا بۆئەوەی بلێن ئەها ژنی موسڵمان ئەوەبوون کەدەمان وت! هەروەها بەمە سەربازە فەرەنسیەکان ئارەزووی خۆیان پێ تێرەکرد ، بەڵی ئابەم شێوازە ئەوروپیەکان ئاستی سەقافەی رۆژهەڵاتیان دابەزاند هەتا بگونجێ لەگەڵ تاکی بەکاربەری ئەوروپی بەشێوەیەکی بازاریانە کاریان دەکرد وەک لەشتانی دیکەشدا هەوڵیان داوە وەک فیلمەکانی هۆلیوود وەک(شێخ 1921) وە هەروەها گەلێ فیلمی دیکەش .

حیجاب و جنس !

لەناوراستی ئەم وێنە ناراستە بۆ ئافرەتانی موسڵمان ، کاتێک ڕۆژهەڵات ناسەکان حیجابیان بینی بە ئافرەتەوە ، وتیان سوودی ئەم پەردەیە جیە ؟ بۆحیجاب دەکەن ژنە مووسڵمانەکان؟

وڵامەکەی یەکسەر دراوە و ئاسان بوو لەماوەی سەدەی نۆزدەدا حیجاب وەک ئامرازیکی سێکسی خەیاڵی بوو( پێیان وابوو ئافرەتی مووسڵمان حەزێکی سێکسی زۆر شاردۆتەوە لەپشتی حیجابەوە) لەلای گەشتیارە ئەوروپیەکان لەڕۆژهەڵات ، لەگەڵئەوەشدا تەنها موسڵمانەکان خۆ حیجابیان نەکردووە بەڵکو دروز و مەسیحیەکانیش حیجاب بوون

نوسەری تازە موسڵمان بووی ئافرەت کاسرین پۆڵک لەکتێبەکەی خۆی بەناوی " تێروانینی ڕۆژئاوا بۆ حیجاب " دەڵێ:

( ئەوروپیەکان زۆر گرنگیان دەدا بە ئەو ئافرەتانەی حیجابیان لادەدا و لە بۆنەکان بانگیان دەکردا حیجابەکانیان پێ لادەدا و جەستەیانیان پێ دەرەخست ئەوان زۆر ئەمەیان لا خۆش بوو ، وێنەی ئەم ئافرەتانەیان دەگرت و وەک کارتی پۆستە و دەیان ناردەوە وڵاتی خۆیان و بە ئافرەتەکانی دیکەی ڕۆژهەڵاتیان دەوت ئێوە دەتوانن هێزی زۆر گەورەی خۆتان دەرخەن تەنیا حیجابەکە بەرزکەنەوە )

کەواتا تێروانینی ڕۆژئاوا بۆ ئافرەتی موسڵمان تێروانینێکی حەز و ئارەزوو بووە نەک ئازادکردن!!

ڕۆژئاوا وەک ڕەمز و سیمبووڵی جنس سەیری ئافرەتی ڕۆژهەڵاتیان کردووە کە حەزە جنسیەکانی پیاو پردەکاتەوە و نقوومبووە لە ئارەزووەکانی پیاودا ئەوان ئافرەتی ڕۆژهەڵاتیان لەم فۆرمەدا کورت

کردبووەیەوە تەبعەن هۆکاری ئەم شێوە بیرکردنەوەیان
ڕۆژهەڵاتناسەکان بوون کە وێنای ژنی مووسڵمانیان شێواندبوو لایان
ئەوەندە شێواو بوو لایان تۆماس مۆری پاشای بەریتانیا لە وەسفی
جیهانی ڕۆژهەڵاتدا دەڵی ( ڕۆژهەڵات جیهانێکە پڕە لە ئافرەتی چاو
ڕەشی چاو گەورە پڕە لەخۆشەویستی و حەز(جنس) بەڵام ئەوان دیلن
لەژێر کۆمەڵی پیاوی خراپ)

ڕقی ئەوان بۆ حیجابی ئافرەت ئەوەندە زۆرە دای دەنێین لە ڕۆژنامە
سێکسیەکانیان وەک شێوەیەکی سوکایەتی پێکردن بەوەی خاوەنی
حەزیکی زۆرن (ئەوان لەهەموو بوارەکان هەوڵی خلیسکانی
شارستانیەتی ئیسلامی دەدەن بۆ گۆڕانی فیکری تاکی ڕۆژهەڵاتی
بەتایبەت ئافرەت.

ئەوان سیاسیەکانیان ، ڕاگەیاندنیان ..هتد باوەریان بە کۆیلەیی ئافرەتی
موسڵمان هەیە ! ئەوان تۆ دەخەن ئەی تۆ چی ؟ )

ئەمە وێنەیەکی زۆر شێواووی حیجابە لەلای ڕوژئاوا کە بۆی
دروستکردووە هەموو ئەم تێکدانەش دووبارە دەستی ڕۆژهەڵات
ناسەکانە و بزافە فێمینیزمەکان و فەیلەسوفەکانی ڕۆژئاوا کە
ڕابەرایەتی جوڵەی فێمینیزمیان کردووە بۆخزمەتی کۆمەڵی
دەوڵەمەندی جولەکە بۆتێکدانی کۆمەڵگای مەسیحی و دواتریش
موسڵمان لەپشتە ، بۆیە هاوڵاتی عەوامی ئەورووپی هیچ نازانی لەسەر
جیهانی ئیسلامی جگە فانتازیایە خەیاڵی نەبێ ، سەرگەورەکانی
سیستەمی سەرمایەداری و خاوەنی کۆمپانیاکان بەشداریەکی گەورەیان
کردووە بەسەرفکردنی دەیان ملیۆن دۆلار ! بۆ بڵاوبوونەوەی ئەم
وێنە ناڕاستەی ئافرەتی مووسڵمان بەمەش ئەم هەواڵە نادروستانە
بڵاوەیەکی زۆری کرد لەنێو دەزگاکانی ڕاگەیاندن ڕۆژئاوا هەموویان
بەم شێوازە لەحیجاب دەدوان ( حیجاب هیچ نیە جگە پارچە قوماشێکی
سێکسی بەسەر گیاندارێکی لاوازی ، گێل ، ژێر دەستە و کۆیلەی

پیاوێکی خراپی ریشدرێژە ، ئافرەتی موسڵمان لەپشت ئەو حیجابەوە هێزێکی جنسی زۆریان هەیە کە ناشاردرێتەوە )

بەڵام ڕۆژئاوا نەیدەتوانی و گونجاو نەبوو بە قسە تەنها ئافرەتی ڕۆژهەڵاتی بگۆڕێت لەکاتێکدا ئەوان خاوەنی ئابرو و حیشمەت و خێزان بوون ، بۆیە هەستا بەدروستکردنی چیرۆکێک بۆ ئەوەی پاساو بۆ داگیرکاریەکانی بهێنێنەوە چیرۆکەکەش ژنان بوون! ئازادکردنیان! پاساوێک بۆ داگیرکار!

لێکۆلەری مەغریبی ئەسما ئەل مورابیت دەربارەی چیرۆکەکانی ڕۆژئاوا بۆ ئافرەتانی مووسڵمان دەڵێ :

(ئەم چیرۆکە درۆیانە بۆ ژنانی ڕۆژهەڵات هاوکارییەکی زۆری ڕۆژئاوای داگیرکاری کرد چ وەک پاساوێ بۆ داگیرکاری و ئازاردی ژنان ! چ وەک جەنگێکی شارستانیەت ، بەم هۆیەوە ئەوان تەنها شارستانیەتی ئەوروپیان هاوردەی وڵاتەکانی ڕۆژهەڵات نەکرد بەڵکو ببوو بەپاساوێک بۆ داگیرکاریشیان! )

لێرەوە دید و بۆچونی ڕۆژئاوا دەزانین کە گوایە ئازادبوونی ژنە لەزوڵم و لەجنس( بینینی جوانیەکانی لەلایەن تەنها پیاوی) لەکاتێکدا ڕۆژئاوا ڕق لەدڵە بەرامبەر ژن بەڵام وێنای خۆی وەک ڕزگارکەرێک نیشانی ئافرەتانی مووسڵمان دەدا هەرئەمەش دەبینین لە فیکرەکانی "لۆرد کرۆن" کۆنسوڵی بەریتانیا لە مسر لەساڵی 1882 بۆ 1906 نوسەر لەیلا ئەحمەد لەوەسفی ئەم پیاوە ئەڵێ ( ئەم پیاوە دژکارێکی سەر سەختی بزوتنەوە فێمێنیزمەکان بوو لەوڵاتی خۆی واتا بەریتانیا ، بەڵام لە مسردا بەریگیریکار بوو لە مافەکانی ژن و دژی سەرپۆشی ئافرەتان و نیقابەکەیان بوو ! )

**هەروەها زیاتر دەڵێ و ڕوودەکاتە ژنان دەڵێ : ( ئیسلام نیزامێکی شکست خواردووە ، یەکەمین نیشانە ئەو شکست خواردوویەش ژنانە ، حاڵی ژنان لە میسر و وڵاتانی تری مووسڵمان بەربەستێکی ترسناکە بۆ پێشکەوتن و گەشەی ژنان گەشتنیان بەوڵاتانی پێشکەوتوی ئەوروپی!!)**

**کەواتە پیلانی ڕۆژئاوای داگیرکار لابردنی حیجاب بووە ، بۆ دەرخستن و ئاشکراکردنی هێزە جنیسیەکانی ئافرەتی مووسڵمان ، کاتی ئازاد بوونە ! ، ئازاد بوونی هێزی جنسی ئافرەتی مووسڵمان لەڕێگەی لادانی حیجابەکانیانەوە داگیرکار وڵاتەکانی ڕۆژهەڵاتی لەرووی سەربازیەوە جێ هێشت بەڵام ئایا ئایادیاکانی لەگەڵ خۆیدا بردیەوە ؟؟؟**

**ئەوان بەسەربازی وڵاتانی ڕۆژهەڵاتیان داگیرکرد ئێستا چۆن وا بەسادەیی جێی دەهێلن ! ئەوان لەمێژە خەریکن پلان دادەنێن شارستانیەتی ئیسلامی بڕوخێنن ئێستا دوای ئەوەی داگیرکردن چۆن جێی دەهێڵن ئەو هەموو پلانە ! کەسی ئاقڵ تێدەگا ئەوان بەمەیدانی خۆیان کشاندووتەوە بەڵام جێنیشینیان بۆخۆیان داناوە هەتا ئەوان پلانەکان بەجێ گەیەنن ، ئاخۆ کێیە ئەو بزووتنەوە فێمێنیزمانە داڵدە دەدات لەڕۆژهەڵات؟**

**کێیە هاوردەی ئەو هەموو شێوازە نوێیە ڕووتەی جلی ئافرەتان دەکات؟**

**کێیە دەیان ملیۆن دۆلاری خستوەتە کۆمەڵێ کەناڵەوە کە بەردەوام زنجیرەی فیلمی نەشیاو بۆ کچان و ژنانی موسلمان لێدەدا؟**

**لەکاتێکدا ئەو فیلمانە نرخیان ملیۆنان دۆلارە بەڵام ئافرەتانی موسڵمان بە خۆرایی دەیبین بۆچی؟**

**ئایا ئەوەندە دڵسۆزی ئافرەتانی ئێمەن؟ حوکمەتەکانی ڕۆژهەڵات خۆیانن بەیاسا رێخراوە فێمێنیزمەکان دەپاریزن رێخراو و بنکەیان بۆدەکەنەوە ! دەسەڵات لەڕێگای دەزگاکانی راگەیاندنیەوە یارمەتی**

ئەوان دەدات بۆ گەیاندنی بیری فێمێنیزم ( بەرێگای فیلم و زنجیرە گۆرانی !ٓ جل ، کەناڵەکان)  !

نیە و چەکی  f16چەکی ڕۆژئاوا بۆ ڕووخاندنی شارستانیەتی ئیسلام ناوکی نیە!  ترسناکتر لەوان هەن ! ئەوانیش حوکمەتەکانی ڕۆژهەڵاتن کە شارستانیەتی ئیسلام بەرد بە بەرد دەشکێنن ، موسڵمان دەبێ بزانی دوژمنی شارستانیەتی ئیسلام لە ئیمرۆدا دوو بەشن بەناراستەوخۆ ئەوروپا ! بەراستەوخۆش حوکمەتی بەکرێگیراو ڕۆژهەڵاتی ! تۆی مووسڵمان دەبێ دووژمنی خێزانەکەت و کچەکەت و خوشکەت بناسی ! بزانیت ئێمە لە واخەریکە شارستانیەتمان دەگۆرێت بەهیواشی ، ئێمە ئێستە لەقۆناغێکی مەترسیدار داین ئەم قۆناغەش ئەوروپا لە 60کان سەدەی رابردوو تێیدا بوو ئەگەر پێش بە ئەم گۆڕانکاریە نەگیری ئەوا کۆمەڵگایەکی ئەوروپی ئاسا چاوەڕێمان دەکات لەداهاتودا ! دیسان دەیلێمەوە چەکی ڕۆژئاوا بۆ لەناو دانی شارستانیەتی ئیسلامی ساروخی نیە(جۆرێکی فرۆکەی پێشکەوتووە) ، بەڵکو f32کیشۆر بڕ نیە ! حوکومەتەکانی ڕۆژهەڵاتن ...

لەکۆتایشدا دەڵێم (وَيَمْكُرُونَ وَيَمْكُرُ اللَّـهُ ۖ وَاللَّـهُ خَيْرُ الْمَاكِرِينَ) ٣٠الانفال

[بەڵێ.. فڕت و فێڵی خۆیان دەکەن، دیارە خوایش پلانی خۆی دادەڕێژێ بۆ پووچەڵکردنەوەی پیلانەکەیان  دڵنیاشبن خوا لە هەموو پلاندانەرێک باشترە بۆ پووچەڵکردنەوەی فڕت و فێڵی پیلانگێران.

لە فیبرایەری ساڵی 2001  لە هۆڵی  "مادیسۆن سکوێر" کە یەکێکە لەگەورەترین هۆڵەکانی جیهان  ئاهەنگێکی گەورە ئەنجامدرا  ، ئاهەنگەکە بۆ گۆرانی وتن یان شانۆ یان شتێک لەوانە نەبوو بەڵکو ساڵرۆژی دامەزراندنی یەکیک لە بزافە فێمێنیزمەکان بوو کە لەو

ڕۆژەیا کێشە و بابەتەکانی ئافرەتانی تێدا باسدەکرا ، لەئاهەنگە زۆر کەسی بەناوبانگ و فێمێنیست تێیدا بەشدار بوو گرنترینیان ئۆپرا وینفری بوو ، لەیەکێک لە برگەکانی ئاهەنگەکە ئۆپرا وێنفری چووە پێشەوەی ستەیجەکە بۆ پێشکەشکردنی وتارێک لەسەر ئەو زوڵمەی ژنانی ئەفغانی ڕووبەرووی ئەبنەوە لەلایەن تاڵیبانەوە دواتر وتی :

" بیرکەنەوە پارچەیەکی گەورەی قوماش جەستەت هەمووی داپۆشێت وەک ئەوەی پەیکەرێکی سەرشۆڕکەر بێت "

لەناکاو کچێک نیقابی ئەفغانی دەپۆشی دەرکەوت و هاتە سەر ستەیجەکە لەوکاتە ئۆپرا ڕووی تێکرد نیقابەکەی لەسەرخۆ لێکردەوە و دەمووچاوی ئافرەتەکە دەرکەوت کە "زۆیا " بوو یەکێک لەچالاکوانانی ژنانی ئەفغانستانە لەساڵانی نەوەدەکان دژایەتیەکی زۆری تاڵیبانی دەکرد ، زۆیا دڵ خۆشی خۆی دەربری بەم کۆبوونەوە جەماوەریە بۆ پشتیوانی لە لێکردنەوەی نیقاب لە ئافرەتانی وڵاتەکەی ، جەماوەرەکەش چەپلەیەکی زۆر گەرمیان بۆلێدا کە 18هەزار ژن حازر بوون ، لەناو هۆڵەکەدا دەنگەکان بەرزبوونەوە بۆ رزگار بوون و ئازادبوونی ژنان لە دەستی حیجاب هەموویان بەیەک دەنگ دەیان وت بەڵی بۆلێکردنەوەی نیقاب ! ئەم ڕووداوە هەشت مانگ پێش راگەیاندنی جەنگ بوو دژی ئەفغانستان .

دیقەتی کاتی ئەم ڕووداوە بدەن! بزانن ڕۆژئاوا بۆچی لەوکاتەدا ئەم بۆنە بۆ چالاکوانە فێمێنیزمەکان ڕێک دەخات لەراستیدا ئەوان هیچ خەمێک ناخۆن لە گوزەران و دڵ خۆشی ژنان ، بەڵکو قەزیەکانی ژنان بەکاردەهێنن بۆ پاساوی خوێنرێژیەکانیان ، پاساوی داگیرکاری خاک ! بۆ پاساوی تاڵانبردنی کانزاکان ! من کێشەم دید و دەسەڵاتی ڕۆژئاوایی نیە کە داگیرمان دەکات! چون ئەوە ڕوونە ئەوان دوژمنن ، کێشەم ئەو هاوڵاتیە ڕۆژهەڵاتیانەن کە پشتەکەن لە شارستانیەتی خۆیان باوەش دەکەنەوە بۆ سیستەم و پرۆگرامی ئەوان ، کێشەی من ( زۆیاکانن ) ! ئەو سیستەمەی کۆمەڵگای مەسیحیەکانی لەت و پەت کرد هەر ئەو سیستەمە کەسانی وەک "زۆیا " دروست دەکات ! کەسانی وەک " زۆیا

" دالّدە دەدرێن لەلایەن دەسەڵاتدارانی ڕۆژهەڵات خۆیانەوە !
جێنیشیەکانیان! ئەم جۆرە مرۆڤانە بانگدەکرێنە کەناڵەکان بیرە
فێمێنیزمەکانیان دەدەنە گوێی کچان و لاواندا ، کەسانی وەک "زۆیا "
کار لەسەر بەرهەم هێنانی جیلێک دەکەن ، کار لەسەر دروستکردنی
کۆمەڵگایەکی داڕوخاوی ئەوروپی دەکەن ، وابەرە بەرە دەرەنجامەکانی
دەبینین ! کەواتا بەرێزان دەبێ بزانن چالاکوانانی فێمێنیزم
بەشێوەیەکی ناراستەوخۆ پشتگیری دەکرێن لەلایەن شارستانیەتی
ڕۆژئاوایەوە ، بەشێوەیەکی راستەوخۆش لەلایەن حوکمەتە
بەکرێگیراوەکان ڕۆژهەڵاتەوە ! هەموو ئامانجیش دروستکردنی
نەوەیەکە هاوشێوەی نەوەی ئەوروپی ، پاشان دروستبوونی
کۆمەڵگایەک هاوشێوەی ئەوروپی ! ئەمە سیستەمی نوێیی جیهانیە
بەرێزان جا خۆتان لەو ( سیسەتەمە دەجالیە) بپارێزن.

ئەم وێنەی ئافرەتی موسڵمانی ئەفغانی بەنیقابەوە وەک ئەوەی دیلیک
بێت لەژێر سایەی حکومەتێکی ئیسلامی بەشێوەیەکی بڵاو لە میدیای
ڕۆژئاوادا بڵاو بووەوە ، وە وێنەی پیاو و سوپای ڕۆژئاوایش وەک
لایەنی رزگارکەر و چاکەخواز کە ئازادی دەوێ بۆ جیهان و هاتووە
هەتا کەلپەچەکانی ژنانی ئەفغانی لێکاتەوە لەمیدیاکاندا بڵاو بووەوە !!
وەک لەفیلمەکانیان ڕادیارە !

بزافە فێمێنیزمەکانی ڕۆژئاوا ئابەم شێوازە پێیان وایە ژنانی ئەفغانی
دەپارێزن و ئازادیان دەکەن ! لە تاریکی و کۆتی حیجابەوە بۆ ئازادی و
ڕووناکی ! نموونەی ئەو ئاهەنگەی سەرەوە باسمان کرد زۆر دووبارە
کرایەوە ! لێکردنەوەی حیجاب بەشێوازێکی شانۆگەری و بانگکردنی
ژنان بۆ وازهێنان لەدواکەوتویی و چەق بەستویی و کرانەوە بەڕووی
دنیایی سفور و مۆدێرن ! ( ئازادکردنیان لەکۆت بەندی خوا بۆ کۆت
بەندی سیستەمی ئەوروپی ! بۆخزمەتکردن و دەوڵەمەندکردنی
کۆمەڵی سەرمایدار)

دیارترین ئەو ژنانی نیقابیان پۆشیە بەشێوازی شانۆیی دواتر لایان داوە وەک جێگری کۆنگرێسی ئەمریکی "کارۆلین مالۆنیە "کە نیقابی ئەفغانی پۆشی لەساڵی 2001 لەناو کۆنگرێس بۆ پاساوهێنانەوە بۆ جەنگی ئەفغانستان هەروەها پۆلین هانسن ئەندام پەرلەمانی ئوسترالی هەمان شتی دووبارەکردەوە بەلادانی بەلەبەرکردنی جلی نیقاب و لادانی لەساڵی 2017 بۆ شەرعیەتدان بەکوشتنیان ! ئەوان خەمی برسی بوونی هاوڵاتیانی یەمەنیان نیە کەحاڵی ئێستا والەبرسا دەمرن کەچی داوای ئازادی ژنانیان بۆدەکەن!!!

ئەم چالاکیە خاچپەرستانە بۆ ئازادکردنی ژنانی ئەفغانستان جۆرج بۆشی سەروکی ئەمریکا لەسەر ئەم چالاکیانە دژی ژنانی ئەفغانی دەلێت " جەنگی ئەمریکا دژی ئەفغانستان یەکەمین جەنگی فێمینیزمە لەمێژوودا " کەواتا بەرێزان بۆچی ئەوان هێندە سوورن لەسەر بیری فێمێنزم بەهەموو جۆرەکانی؟

ئامادەن لەپێناوی دەیان ملیار دۆلار سەرفکەن بۆچی؟

وڵامەکەی ئاسانە چون بەهێزترین چەکە بۆ ڕوخانی شارستانیەتی ئیسلامی !!

بەهاوکاری FMF لەدوای ساڵی 1997 زۆرینە بزافە فێمینیزمیەکان چەندین رێخراوی ژنان و مافی مرۆڤ لە ئەمریکا هەستان بەخۆپیشاندان و بەرزکردنەوەی دروشمی "بیوەستێنن جیاوازی رەگەزی نێوان نێر و مێ لە ئەفغانستان" هەروەها لەدوای یانزەی سێپتەمبەرەوە بەهانەی زیاتریان دەسکەوت بۆ ئەوەی جیاوازی رەگەزی نیوان نێر و مێ لە ئەفغانستان بوەستینن! بۆ گێڕانەوەی مافەکانی ژن لە ئەفغانستان ، هەتا ئەم چرکەش وتارە فێمێنزمەکان هانی ئەجیندا کۆنەکانیان دەدەن بەشێوازێکی تازە هەڕۆژێ لەبەرگێکی نوێدا ! ڕۆژێ تیرۆر ! ڕۆژێ رەگەز پەرستی ! .....

**حیجاب لەلای رۆژئاوا لەکۆندا حەز و ئارەزوویەکی جنسی بوو ! وەک پاساویک بوو بۆ داگیرکار بەڵام ئەمرۆ دەڵێن ئامرازیکی کۆیلایەتی ژنە و مووشەک مووسڵمانان f16 بۆ پیاو دووبارە بووە بەپاساوێک بە خەڵتانی خوێن بکرێت ! وە بەهۆی زاڵبوونی شارستانیەتی ئەوروپی و سەرکەوتنی پیلانەکانیان ئەمرۆ مووسڵمان دەسخۆشی لە رۆژئاوا دەکەن بۆ ساروخ بارانکردن و کوشتنی موسڵمانان لە فەڵەستین و شام و عێراق و یەمەن وڵاتانی تری ئیسلامی !!**

# ٢٤ _ فێمێنیزم ، پیلانە گەورەکە

لە سەرەوە باسی ڕۆژھەڵاتناس و شارستانیەتی ئەورووپیمان کرد لەکۆن و ئێستادا کە چۆن بووە ھەڵوێستیان لەبەرامبەر حیجابدا ، چەکی ئەورووپا لەمڕۆدا ساروخ و مووشەکە بەھێزەکان نین بەڵکو پیلانەکە بزوتنەوە فێمێنیزمەکانن ! ئەمانە کێن ؟ چۆناو چۆن ھاتنە نێو ڕۆژھەڵاتەوە ؟ بابەتەکانی ئەمان بۆ ژنی ڕۆژھەڵاتی چییە ؟

فێمینیزم وەک وشەکە زاراوەیەکی فەرەنسیە لەوشەی فێمینای لاتینی وەرگیراوە مانای" ژن " دێ بەڵام بزوتنەوەێ فێمێنیزم لەمێژوودا لەسەدەی ھەژدەوە سەری ھەڵدا بەسێ قۆناغ تێپەڕیووە ئەوانیش :

1- فێمێنیزمی لیبراڵ

2- فێمێنزمی رادیکاڵ

3- فێمێنیزمی جێندەری

سەبارەت بەجۆری یەکەم "لیبراڵ" سەرەتا سەدەی نۆزدە بانگشەی بۆکرا ئامانجی ئەو جۆرە تەنھا ئەوەبوو ئافرەت وەک پیاو کار و پیشەی بۆ دابینکرێت لەگەڵ کۆمەڵێ مۆڵەتی تایبەتی وک دایکایەتی و ھەتا دوای..

"مێری وڵستۆن " یەکێک بوو لەوانەی کە پشگیری سەرەکی ئەم جۆرە بوو ، دواتریش بەھۆی پشتیوانی کردنی دەوڵەمەندەکان و سەرمایەدارەکان بۆ ئیشکردنی ئافرەت سەرەنجام دەزگاکانی دەوڵەتیش ناچاری ئەوەبوون دروشمە فێمینیزمەکان قبووڵبکەن ...

2 ـ فێمێنیزمی رادیکاڵ : ئەمجۆرەیان لەسەر ئەم بیرۆکەیە دانرا:

" پەیوەندی نێوان ژن و پیاو لەسەر بنەمایە دانراوە بازووی پیاو زاڵە تێیدا "

مەبەستیان لەوەیە ئاینە ئاسمانیەکان یان جوانتر بڵێم خودا زووڵمی لە ئێمە کردووە (پەنا بەخوا) ئەمجارە تەنها لەچوارچێوەی کارکردن و ئیش نەماوە بەڵکو دەستیان برد بۆ شتانێکی دیکە بۆ ئەوەی جیاوازی ژن و پیاو نەمێنی و دەیان وت پیاوان هۆکاری سەرەکی چەوسانەوەی ئافرەتە ئەوەش بۆئەوە دەگەڕێتەوە پیاو بەهێزە لەرووی بایلۆژیەوە ! ، فیمێنیزم رادیکاڵ تێڕوانینی بۆ پەیوەندی ژن و پیاو تێروانیکی دژایتی و مل ملانی نێوان دوو ڕەگەزە ! ئەوان باوەڕییان بەچەمکی ( مێنە و نێرینە نییە) بەڵکو هەوڵیشیان دەدا ئەم چەمکە لەناوچێت ! ئەوان هەوڵی لەناوچونی خێزانیان دەدا ، چەمکەکانی ( دایکایەتی ، خۆشەویستی هاوسەرێنی ، پەیوەندی جنسی ژن و پیاو ، منداڵ ) وشانێکی بێزارکەربوون بۆیان هەوڵی سرینەوەیان دەدا باوەرێیان بەوەنەبوو ئافرەت ماڵداری بکات و خێزان پێکبێنیت ، لەفیمێنیزمی جۆری دووەهەمدا بەتەواوی کۆمەڵگای مەسیحیەت لەت کرد و سەرمایەدارەکان توانیان کۆمەڵگای ڕۆژئاوایی بکەنە کۆمەڵگایەکی تەواوی ئیش کەری باجدەر لەگەڵیشیدا خێزانی ئەورویی لێکهەڵوەشێننەوە ...

### 3- فیمێنیزمی جێندەری:

بەڵاگەورەکەی سەردەم ! لەنەوەدەکانەوە دەستی پێکردووە پێشرەوانی جێندەری

" مێشیل فۆکۆ" چەن کەسیکی دیکەن ، ئەم جۆرە جەنگ دژی بایلۆژی ئافرەت دەکات ! باوەریان بەهیچ جۆرە جیاوازیە بایلۆژی و کۆمەڵایەتی نییە ! تەنانەت ئەلێن هێزی جەستەی پیاو بەهۆی پەروەدەی کۆمەلایەتیەوە دروست بووە ! هەوڵی جێندەریەکان کردنی ژنە بەپیاو و فۆرمی ژن بوون لەجیهاندا بسرنەوە ! چون ئەوان هەموو تایبەتمەندیەکانی مێینە بوون بەناشرینی و کەمی دەزانن ! ( ئەو شتانەی خواپێداوە بە ناشرینی دەزانن ) !! ئەو بەناو

ڕێخراوەکانی مافی ژنان لەقۆناغی فێمێنیزمی جێندەرین ، داوای یەکسانی ڕەگەز دەکەن ! کەواتا بزانن چەن جەنگەکە مەترسیدارە !

بەمانای رەگەز دێ و لەبری ( نێر و مێ ) **gender** وشەی بەکاردێت بۆیە ئەوان ئەو جێندەرە بەکاردێنن چون دەڵێن مەرج نیە ژن تاسەر مێ و دایک بێت لەوانەیە ژن ببێتە باوک گەر ویستی ! !
پیاویش مەرج نیە تا سەر نێر بێت و باوک بێت خاوەن خێزان بێت !
مەرج نیە خێزان بمێنی بۆ ژیان گەریش خێزان ماوە مەرج نیە بە زەواج بمێنیتەوە مەرجیش نیە هەر ژن و پیاو خێزان بن ! دەکرێت ( ژن و ژن) و ( پیاو و پیاو ) خێزان پێکبێنن !!! شەرعیەتدان بە نێربازی و نەهێشتنی ڕۆڵی باوک و دایکە لە خێزان و ئازادکردنی جەستەی ئافرەتە چۆن دەیەوێ وابەکاری بێنیت ئەمەش شەرعیەتدانە بە (لەشفرۆشی) چەندین شتیکەش !!

ئێمە کێشەمان ئەم جۆرە فیکرانە نیە باڕۆژئاوا خاوەنی بن! بەڵام بزافە فێمێنیزمەکان واخەریکن ئەم جۆرە بیرۆکانە بڵاوەدەکەنەوە لەکۆمەڵگاکانی ڕۆژهەڵات ، بەبێ ئەوەی کەس هەست بەمەترسی بکات ! دووژمنێک کەس بە دووژمن و ڕەقەمی نابینی ! من پێت دەلێم دووژمنی سەرەکی دینەکەت و شارستانیەتت و کچەکەت ! نەوەکانی داهاتومان فێمێنیزمەکانن بەناراستەوخۆش حکومەتەکانن بەرگریان لێدەکەن! ئیتر تۆ دەس بگریتە کڵاوی خۆتەوە یان نا ئەوان جەنگی خۆیان دەکەن دژ بە نەوەکانت ! نەوەکانت لەبیر و باوەری خۆیان کاڵدەکەنەوە بۆ جیلێکی بێ هەست و بێ ڕۆح جا باشترین شتیش ئەوەیە پێش بە ئەم جۆرە بگیری لەقۆناغی زوودا ! بەڵام ئەمە زۆر قورسە کاتێک حکومەتێک پشگیری بکات! کەواتا مەسەلەکە گەورەیە ! (حکومەت کار لەسەر دروستبوونی جیلێک دەکات پێچەوانەی دین و بۆچونی کۆمەڵایەتی باوانی!)

( یەکەمین هەنگاوی بۆ ئەم پلانە ژەهراویەش دەرهێنانی ژنە لەماڵەوە بۆ دەرەوە بەناو ئیشەوە ، وەک چۆن لەئەوروپا هەر بەم شێوە دەستی پێکرد دواتریش شتەکانی دیکە ) ئەگەر ئەم پیلانە سەر بگری سەر زەوی تێکدەچی ! چون خێزان نامێنێتەوە ! شارستانیەت دەروخێ نەک ئیسلامی ( من پێم وایە دەمێکە شارستانیەتی ئیسلامیان ڕوخاندووە) شارستانیەتی مرۆڤایەتیش دەروخینن !! کۆمەڵێ بازرگان و سەرمایەدار و دەسەڵاتدار دەبنە کەڵەگا بەهۆیەوە هەموو کاڵاکانیان ساغەکەنەوە بەسەر خەڵکیدا ! خەڵکیش با لەناو حەزەکانی خۆیدا سوودبخواتەوە...

هەموو شتێک لە دونیا لەسەر بنەمای ئەرک و ماف دامەزراوە واتا بۆنموونە ئەرکی فەرمانبەری کۆمپانیایەک لە سەعات نۆ بۆ سێیە کاربکات ، مافی ئەوەی هەیە مووچەکەی پێبدرێت بەپێی کارەکەی . جێندەریەکان هەوڵەدەن ئەم یاسایە بشێوێنن و ئەرک و مافی ژنان بگۆڕن بەشتانێک خۆیانیش حەزیان لێی نیە ! کەچی هانی ژنانی بۆ ئەدەن!!!

دەیانەوێ مێینە بوون لەشتانێک ببینێرێ کە خۆیان هیچکات نایەنەوێ نەبۆخۆیان نەبۆ کچی خۆیان نەبۆ کەسی خۆشیان !

ئەمەش بەشێکە لەشێواندنەکان..

ڕێکپوش عەزیز(چالاکوانی ژنان) : پێی وایە مارەبرینی ژن لەپیاو زوڵمە ! دیکتاتۆریە بەڵکو پێشکەوتن ئەوەیە ژن لە ژن و پیاو لەپیاو مارەبکریت!

ڕێکپۆش عەزیز دەڵێ :  ئیسلام ستەمی لەژن کردووە کە ڕێگای داوە پیاوێک زیاتر لەژنێک بێنێت پێی دەڵێن چارەسەری قەیرەیی ژنان چیە لەلات کە وەک مەعلوومە عێراق یەکەمین وڵاتی عەرەبیە لەڕووی کچانی تەمەن گەورەوە ئەم ڕێژەش ڕۆژ بەرۆژ لەزیادبوونە ئامارێکم لایە ساڵی 2010 دەڵێ 85%کچانی عێراق تەمەنیان سەروو 35 قەیرەن و شوویان نەکردووە هێشتا ئەم توێژینەوە لەلایەن دکتۆر اسماعیل ئالزیوودەوە کراوە  چارەسەری ڕێک پۆش عەزیز ئەوەیە : لەئەوروپاوە بە لۆری لەعابە ئۆتۆماتیکی سێکسی هاوردە وڵات بکرێت ( جۆرێک لە پلاستیکە وەک کۆئەندامی زاو زێ نێرینەیە، کۆمەڵگای ڕۆژهەڵاتی هێشتە بەم شتانە ئاشنا نین !)

ساڵی 2010)  "   emro"  ( سایتی

تامان شاکر ( چالاکوانی ژنان) : دەڵێت چارەی قەیرەیی ئەوەیە پیاوان لەوڵاتی ترەوە بهێنین  بۆ کچەکانمان شوێنیان بۆئامادەکەین هەتا بەبرێک پارە برۆن بیکەن و غەریزە جنسیان بەم شێوەیە تێر بکەن . ( وەک لەشفرۆشی !)

(ک ، ح) :یەکێک لەچالاکوانانی ژنان بەتوندی دژایەتی فرەژنی و دابوونەریت و دین دەکات یەکێک بوو لەوانەی دژایەتیەکی زۆری پیاوی ئەکرد بەڵام دواجار خۆی سەر بەهەوێ شووی کردە پیاوێ کە ژنداریش بوو! کە پێیان وت چۆن شووت کردووە لەکاتێ خۆت زۆر دژایەتی فرەژنی دەکەیت دەڵی : ( من وەک هەر ئینسانێک پێویستیم بەژیانی تایبەتی خۆم هەیە و شوودەکەم ! )  وادایارە کچانی دیکە ئینسان نین و ژیانیان ناوێ !!

شاناز بەرزنجی ( چالاکوانی ژنان) : دەڵێ مارەی زەواج شتێکی بۆگەنە پێویستە کوڕ و کچ پێش زەواج زینا بکەن !  دەڵێ چۆن یەزیدیەکان

**کوڕان و کچانیان پێش زەواج زینا دەکەن بەوشێوە دەبێ لاوان ئەنجامی بدەن ! دەبێ تێڕوانینی بۆگەنی ئیسلام وەلابنەن چون کورد بەوشێوەیە نیە !**

**"سایتی ئەمرۆ "**

**شاناز بەرزنجی دەڵی : قورئان ئەو کتێبەیە پرە لە بەدرەوشتی و مەینەتی بەرامبەر ئافرەتان !**

**"هەمان سایتی پێشوو"**

**زۆرێک لە ڕێکخراوەکانی ئافرەتان پەیوەندی بەهێزیان لەگەڵ باندە لەشفرۆشیەکان هەیە بەتەحەداوە ئەم قسە دەکەم چەندین نمووی زیندووش هەیە بۆنموونە ( ماڵی خانزاد ) یەکێک لەو ژنانەی بەناوی ( سوعاد ) بەهۆی کێشەیەکەوە ڕووی کردە ئەو رێخراوە(ماڵی خانزاد) هەتا بۆی چارەکەن ، وتی کۆمپانیایەک هەبوو نزیک ئەوێ هەمووی پیاو بوون کاریان تێدا دەکرد کە پەیوەندیەکی جنسی هەبوو لەنێوان ئەو کۆمپانیا و ماڵی خانزاد ئەوەش زۆر ئاشکرا بوو (سوعاد ) دەڵێ جارێکیان خاوەنی کۆمپانیاکە پەلاماری دام ... دەڵی جاریکی دیکە خەوتبووم چاوم کردەوە لەباوەشی پیاویک بووم کە برای بەرێوبەری ماڵی خانزاد بوو منیش هەرچۆن بێت لەو کەسە و لەو شوێنەش خۆم ڕزگار کرد ! ئەو ئافرەتانەی لەوێ بوون دەیان جار دەستدرێژیان کرابووە سەر ! ئەمە نموونەیەکی بچوکە چەندین شتی دیکەش روویداوە لەچەندین رێخراوی تر وەک ماڵی ئاسوود و ماڵی شیفا هەتا دوای ....**

حکومەت و وڵاتانی ڕۆژهەڵاتیش بەتوندی داکۆکی لەم جۆرە ئایدیایانە دەکەن لەگرنترین یاساکان پشگیری سەختیان دەکەن:

1 ـ ( پێویستە لەسەر هەموو شارێک پێداویستی جنسی (مەبەست لە پێداویستی جنسی بریتییە لە هەموو ئەو شتانەی ڕێخۆشکەرن بۆ ئەوە کور و کچێک زینا بکەن ، هەر شوێنیکی بەدرەوشتی ، هەتا ئەو دکتۆرەشی منداڵەکە لەبار دەبات بۆیان) بۆ ئەو کەسانە دەستەبەربکەن کە گونجاون بۆ ئەم کارە !

"ئاماری کۆنگرەی نێودەوڵەتی بۆ دانیشتوان و گەشە / قاهیرە ساڵی 1994 / بەشی حەوتەم - پەرەی 44

2 ـ ( پێویستە یارمەتی تەواوی مادی ئەو سەنتەر و ڕێخراوە ناحوکمیانە بدرێ کەکار بۆ لاوان دەکەن هەتاوەکو بتوانن بەشێوازی تەندروست جنس بکەن ! (کردنی جنس لەدەرەوەی زەواج )

"ئاماری کۆنگرەی جیهانی چوارەمی ژنان / پەکین 1995 بەشی چوارەم - 111پەرە

3ـ ( بۆئەوەی پێگەی ئافرەت بەهێز و دیار بێت ئازادبێت دەبێت ئافرەت خاوەن بریاری خۆی بێت لەهەموو بوارەکانی ژیان بەتایبەت لەبواری جنس و منداڵخستنەوە )

"ئاماری کۆنگرەی قاهیرە بۆ دانیشتوان و گەشە / قاهیرە 1994

-(پێویستە پێشلکاری دژ ئافرەت بن بڕ بکرێت ، یارمەتی ئافرەت بدرێ بۆ هەرکار و بارێک ئەنجامی بات لەنێو ئەوانەش مافی مندالْ خستنەوە و جنس)

"هەمان کۆنگرەی پێشوو"

(نەتەوە UNئەو یاسایانەی سەرەوە زۆرینەی لە بەندەکانی یەکگرتوەکان) چەسپاوە ، هەروڵاتی ببێتە ئەندام دەبێ ئەو بەندانەی سەرەوە تێدا مەوجوود بێت و پێی رازی بێت ! ئەگینا سیستەمی نوێی جیهانی پشتی لێدەکات !

ئەوان نەک بەیاسا لەشفرۆشیان حەڵاڵ کردووە ! بەڵکو لەرێگای چالاکوانەکانیشەوە هەوڵەدەن ڕێز لە ئافرەتانی لەشفرۆش بگیریت وەک چالاکیەکی ئابووری سەیر بکرێت ! ، هانی کچان و ئافرەتان دەدەن بۆ لەشفرۆشی دەڵێن چۆن مرۆڤ دەچێتە کافتریا و چێشتخانە و پارکێ چێژ وەردەگری بە بری پارە , ئەویش وایە ! جا ئەمەش بەیاسا حەڵاڵکراوە بۆ میلەت ! لەلایەکەوە زەختێکی ئابووری توند لەسەر زەواج و مەسائیلە شەرعیەکان ، لەلایەک ئاسانکاریەکی زۆر بۆ داوێن پیسی و شتەکانی دیکە ! لەلایەک زەختێکی ئابووری زۆر بەهۆی دەسەڵاتێکی دز و جەردە و بێباوەر لەلایەک ئافرەتێکی برسی داماو لەپێش شاڵاوێکی فیکری کۆڵۆنیاڵیزم !

لەلایەک کۆمەڵی بەناو داکۆکی کاری بەناو ئافرەت تێری ئاڕاستەکراوی داگیرکار! کە لەناز و نیعمەتیکی زۆری دوونیادان ! لەلایەک ئافرەتێکی برسی خاوەن چوار منداڵی بێباوک خاوەن دەسەڵاتێکی دز کە سامانەکەی بردووە بۆ ئەوەی قوتێکی دەسکەوی لەچەندین شوێن داوای داوێن پیسی لێدەکەن! (هەرچەن برسێتی قەت عووزر نیە بۆداوێن پیسی ) لەلایەک شارستانیەتێکی دڕەندە کەبەهەموو ڕێگای دەیەوێ مرۆڤایەتی داڕوخێنی ! لەلایەک شارستانیەتێکی پەرتەوازە کە

**شەق لە فیکر و ئایدیای خۆی دەدا و باوەش بۆ رۆژئاوا دەکاتەوە ! لەلایەک کۆمەڵی دەسەڵاتی ستەمکاری بێباوەر دەیەوێ ڕەگی ئیسلام لەناو گەلەکەی دەربێنی ! وکۆمەڵێکی زۆر بەناو زاناو بەناو ئیسلامی چەپلەی بۆ لێدەن ! لەلایەکیش ئافرەتێکی نەخوێنەدەواری داماو !**

**لەکۆتایدا دەڵێین :**

**[ يُرِيدُونَ أَن يُطْفِئُوا نُورَ اللَّـهِ بِأَفْوَاهِهِمْ وَيَأْبَى اللَّـهُ إِلَّا أَن يُتِمَّ نُورَهُ وَلَوْ كَرِهَ الْكَافِرُونَ ] توبه 32**

**ئەیانەوێ بە فووی دەمیان نوورو رۆشنایی خوا (ئایینی ئیسلام) بکوژێننەوە «بە بڵاوکردنەوەی پڕوپاگەندەو ڕێگرتنی خەڵک لێی ، خۆ خوایش ئەیەوێ هەر ئەم نوورو ڕۆشنایی ئایینی خۆیە هەبێ و، بە پایانی بگەیەنێت و سەریبخات ئەگەرچی بێ باوەڕەکانیش پێیان ناخۆش بێت**

# ٢٥ _ هاوڕەگەزبازی، سیمبولی ئازادی لای ئەمەریکاو ئەوروپاو جیهانی عەلمانییەت.

مەترسی و زیانەکانی"دوودەکی=حیزێتی"

🎯خۆکوشتن لەناو: سەربازو هاوڕەگەزبازو فێمێنیستەکاندا.

🎯باوکێکی مسوڵمان لە بەریتانیا هەڕەشەی زیندانی لەسەرە، چونکە ڕازی نییە کوڕەکەی وانەکانی ئاساییکردنی هاوڕەگەزبازی بخوێنێ.

🎯 خەڵاتی ئۆسکار و هاوڕەگەزبازی

🎯هاوڕەگەزبازی خەیاڵێکی ئەفسانەیی پوچە و پەیوەندی بە بۆماوەیی جینی مرۆڤەوە نییە.

🎯قورئان باسی هاو ڕەگەزبازی و حیزێتی کردووە!

🎯قسەیەک بۆ مێژوو:

ئەگەر لە داهاتوودا لەنێو جەرگەی پەرلەماندا ، نێرلەنێرو مێ لەمێ ، مارە نەکرا ئەوە هیچ نازانم.....

(هەرچۆن الله دەمی بۆ خواردن خەلق کردووەو گوێ بۆ بیستن و چاو بۆبینین ، هەروەها بۆ سێکس و جنسیش شوێنی تایبەتیی بۆ خەلق کردووە ، بەڵام داخی گرانم مرۆڤە پەست و حیزەکان بەناوی ئازادی و

**جینات و هۆرۆمانەتەوە ئەو جێگاو شوێنانەشیان تێکداوە ، هەرچۆن ژیان ژینگەیان ژەهراوی کردووە)!**

**☜ هاوڕەگەزبازی=حیزێتی، سیمبولی ئازادی لای ئەمەریکاو ئەوروپاو جیهانی عەلمانییەتەوە....**

**لە ئێستادا هاوڕەگەزبازان دەنگیان دلێرە و دەیان حیزب و ڕێکخراو و لایەن بەگیریان لێدەکەن، تەنانەت لەسەر ئاستی زانستیش دەستبردن بۆ بابەتی هاوڕەگەزخوازان ئاسان نییە، نەتەوە یەکگرتووەکان بە ئاشکرا داوایکردووە کە مافەکانیان جێبەجێبکرێت لە هەموو وڵاتانی ئەندامی ڕێکخراوەکە، لە یەکێک لە ڕاپۆرتەکانی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان، کە لە ساڵی ٢٠١٧ بڵاوکراوەتەوە؛ ئاماژە بەوە دەدەن کە "پێویستە جیاوازی نەکرێت لەسەر بنەڕەتی مەیلی ڕەگەزی و پێناسی ڕەگەزی". (مەبەستیان هاوڕەگەزبازەکانە)، دواتر لە دەنگیاندا لەسەری (٢٣ دەنگ) لایەنگر و، (١٨ دەنگ) نەرێنی هەبوون، ٦ دەوڵەتیش دەنگیان نەداوە. ئەوەی گرنگە؛ وتەی مۆنتاریۆنە. دوای ئەوەی بابەتەکەی بەرزکردۆتەوە لە ساڵی ٢٠١٦ و لە بەردەم ئەنجومەنی مافەکانی مرۆڤ لە جنێڤ خوێندیەوە، دوای دەنگدانەکە دەڵێت:**

**"ڕێز لە هەر دەوڵەتێک دەگرین دەنگ بە هەر جۆرێک دەدات، بەڵام ئەو لێرەیە بۆ جەختکردنەوە لەسەر گرنگی کارکردن دژی توندوتیژی و جیاوازیکردن، لەسەر بنەمای یاسای نێودەوڵەتی." سەرچاوە:**

**(https://www.ohchr.org/AR/NewsEvents/Pages/GenderIdentityReport.aspx)**

**لێرەدا دەبینین مۆنتاریۆن بابەتەکە گرێ دەدات بە ماف و ڕووبەڕوو بوونەوەی توندوتیژی و جیاوازی ڕەگەزی، بەو واتایەی «هەرکەس**

جێگا بۆ هاوڕەگەزبازان نەکاتەوە؛ ئەوا بەژدارە لە توندوتیژی و جیاوازی ڕەگەزی».

لێرەوە دێینەوە بۆ کوردستان و لەو کاردانەوانەی لەو هەڵمەتەی لە سلێمانی ئەنجامدرا کەوتنەوە، هەڵوێستی کونسوڵی ئەمەریکا بوو لە کوردستان، کە ڕایگەیاند: بە نیگەرانییەوە چاودێری دەستگیرکردنی دۆخی هاوڕەگەزبازەکانی کوردستان دەکەین ، ئەمەریکا لێرەوە دەیەوێت هەژموونی خۆی لە ڕووی کولتووریشەوە بسەپێنێت و بڵێت:

ئەبێت لە یاساکانتاندا جێگا بۆ ئەو گروپەش بکەنەوە. ئەمەش سەپاندنی کولتوور و یاسای خۆیانە و حسابنەکردنە بۆ کولتوور و ئایینی کورد و، پێدانی پەیامێکە کە ئەوەی دژی کولتووری ئەمەریکا و دونیابینییەکانی بێت ،ئەوە پێچەوانەی مافی مرۆڤ و ئازادییەکانی جوڵاوەتەوە. بۆیە دەبێت خەڵکی هۆشیاربێت و نەچێتە ژێرباری ئاسایکردنەوەی هاوڕەگەزبازی، نە لەڕووی یاسایی و نە لەڕووی کۆمەڵایەتی، وە وەک نەخۆشی و لادان و حاڵەتێکی شاز سەیریان بکرێت.

جگە لەوەش دەبێتە پرسیار کە بۆچی کونسوڵی ئەمەریکا لە کەیسەکانی تیرۆر و کێشەکانی تری وەک:

بڕینی موچە و پاشەکەوت، هەڵنەستا بە چاودێریکردنی دۆخەکە و دەربڕینی هەڵوێست لەسەریان؟

لە کۆتاییدا، دەبێت بزانین ئەمەریکا و ڕۆژئاوا و نەتەوە یەکگرتووەکان بە گشتی، کار لەسەر تواندنەوە و سڕینەوەی ئایین و کولتووری وڵاتانی تر دەکەن و، دیموکراسییەتەکەیان بۆ وڵاتانی دی؛ لە ئازادی سێکسی و گروپە شازەکاندا خۆی ئەبینێتەوە و، دەیانەوێت هەموو دونیا وەک خۆیان لێبکەن.

هەر بۆیە هەر داواکاری و لێدوانێکی ئەو لایەنانە بەتایبەت نەتەوە یەکگرتووەکان لەو بارەیەوە، دەبێت بەچاوی گومانەوە تەماشابکرێت، چونکە لەژێر هەژموونی سیاسیدا زۆرێک لە بڕیارەکانیان دەدەن.

**سیستەمی خوێندن و پەروەردەی ڕۆژئاواو ئەمریکا بەلاڕێدا دەبرێت...**

**⚫باوکێکی موسوڵمان لە بەریتانیا هەڕەشەی زیندانی لەسەرە، چونکە ڕازی نییە کوڕەکەی وانەکانی ئاساییکردنی هاوڕەگەزبازی بخوێنێ.**

**ڕازی نابم کوڕەکەم بچێتە وانەی پەیوەندییەکانەوە لەقوتابخانە، تا پێی بوترێ کە تۆ لەجەستەیەکی هەڵەدای، من ئامادەم غەرامە بدەم، یان تەنانەت زیندانیش بکرێم.**

**ئەمە وتەی ئەو باوکەیە کە ڕازی نییە منداڵەکەی لە فیترەت و سروشتی مرۆڤ بوون دەربچێ، بەهۆی وانەکانی قوتابخانە لەبارەی پەیوەندییە سێکسییەکانەوە، کە تێیدا هاوڕەگەزبازی و ڕەگەز گۆڕین ئاسایی دەکرێت، یان دەکرێ بڵێین: دەچێنرێ لەمێشکی منداڵان، وەک چۆن لەکەیسی منداڵە کەنەدییەکە بینیمان.**

**ئەم بابەتانە سەرەڕای ئاسایی کردنیان لەژێر زەبری میدیا وسیاسەت و زانستی ساختە، هێشتا دەکرێتە پرۆگرام و لە قوتابخانەکان دەوترێتەوە، تا نەوەیەکی حیزو نزم و پەست و لە سروشت دەرچوو و نەشاز و نامۆ بێنێتە جیهانەوە.**

**سەرچاوە:**

**https://rb.gy/jnl4ba**

**⚫خەڵاتی یۆسکار و هاوڕەگەزبازی**

ئەکادیمیای سەرپەرشتیاری خەڵاتی ئۆسکار ڕایگەیاند؛ کە هەر فیلمێک پابەند نەبێت بە هەمەڕەنگی ڕەگەزیی و جێندەری و نواندنی کەمینەکان لە بابەتەکانی، یان بەرهەمهێنان، ئەوا بێبەش دەکرێت لە پاڵاوتن بۆ باشترین فیلم.

بەشەکانی ئەم هەمەڕەنگییە؛ ئەکتەرەکان و گروپی دەرهێنان و ئەوانەی پشت کامێراش دەگرێتەوە.

بۆیە دەبێت بەلایەنی کەمەوە یەکێک لە پاڵەوانەکانی فیلمەکە ژن یان هاوڕەگەزباز یان لە ڕەگ و بنەچەیەکی دیاریکراو یان لە کەمئەندامان بێت، وە دەبێ ئەم هەمەڕەنگییە کەمتر نەبێت لە **30%** ی ئەکتەرەکانی دیکە. ئەمەش جێبەجێ دەبێت بەسەر هەموو ئەوانەی لە فیلمەکە ئیش دەکەن.

ئەم بڕیارە مشتومڕێکی زۆری دروستکرد، هەندێک بە شەرمەزارکەر ناویان هێنا و وتیان: "ئازادی کەسی دەرهێنەر بەرتەسک دەکاتەوە و مافی زەوت دەکات،" ئەمە وەک ئەوە وایە؛ «بیکاسۆ» ناچار بکرێت وێنەی کۆمەڵە کەسێکی دیاریکراو بکێشێت لەهەر یەک لە تابلۆکانیدا، ئەگەرنا نمایش ناکرێت و نافرۆشرێت.

ئەم هەوڵانەی ناوەندە سینەمایی و هونەرییەکان، وەک هەوڵێک دەخوێنرێتەوە بۆ سەپاندنی کەمینەکان، بەتایبەت (هاوڕەگەزبازان و ڕەگەزگۆڕاوەکان)، وە ئاسایی کردنی ئەو لە سروشت دەرچوونانە لە جیهان.

هاوڕەگەزبازان و ڕەگەزگۆڕاوەکان، لۆبییەکی جیهانییان هەیە و لە هەموو ئاستەکان ئیش لەسەر کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی دەکرێت بۆ ئاسایی

کردن و قبوڵکردنی ئەم لادانە ئەخلاقی و سێکسییانە، هەر لە جیهانی منداڵانەوە تا ساختەکردنی زانست و هەوڵی دەزگا بەناوبانگەکانی هونەر و سینەما و دیبلۆماسییەتی وڵاتان، وەک چۆن لە بەیاننامەکەی کونسوڵخانەی ئەمریکا بینیمان.

سەرچاوە:

https://2u.pw/WUgVq

https://2u.pw/vuAiY

https://2u.pw/hMyQT

ئێمەش دەڵێین:

هاوڕەگەزبازی خەیاڵێکی ئەفسانەیی پوچە و پەیوەندی بە بۆماوەیی جینی مرۆڤەوە نییە.

لەلایەن کۆمەڵێ بەناو ڕەخنەگر و کەسانی بەناو زانستییەوە دەوترێت بوونی سیفەتی هاوڕەگەزبازی لە تاکەکاندا کارێکی خۆنەویستانەیەو هەڵەیەکە لە جینەکانی مرۆڤدا هەیە، بۆیە نابێ ئەوانە سەرزەنشت بکرێن، بەڵام لەڕاستیدا زانست پێچەوانەی ئەوان دەڵێت و تەواوی ئەو بۆچوونە پووچانە بەتاڵ دەکاتەوە و کارزانی و دانایی پەروەردگاری باڵامان بۆ دەردەخات، کە ئەم سیفەتە هیچ پەیوەندییەکی نییە بە سیفەتە بۆماوەییەکانەوە....

ئەمەش بەڵگەی زانستی:

١- هیچ پەیوەندییەک نییە لەنێوان هۆکارە بۆماوەییەکان و هاوڕەگەزبازی..

سەرچاوە:
https://www.psychologytoday.com/articles/199507/my-genes-made-me-do-it

٢- پەیوەندی نییە لەنێوان کرۆمۆسۆمی "Xq28" و هاوڕەگەزبازی..

سەرچاوە:

Six years ago, molecular geneticist Dean Hamer and his colleagues announced that they had found a genetic link to male homosexuality–an as yet unidentified gene on the X chromosome (Science, 16 July 1993, p. 321). Now on page 665, a research team reports failing to find a link between male homosexuality and Xq28, the chromosomal segment implicated by Hamer's study. In addition, other unpublished work does not provide strong support for a linkage. The authors of the Science paper say that, taken together, the results suggest that if there is a linkage it's so weak that it's not important and that researchers should be looking elsewhere for the genes that contribute to homosexuality!
http://science.sciencemag.org/content/284/5414/571.summary

٣- پەروەردە کاریگەری نییە لەسەر هاوڕەگەزبازی..

کۆمەڵەی ئەمریکی بۆ پزیشکی دەروونی ڕایدەگەنن کەوا شێوە و شێوازی پەروەردەکردن کاریگەری نابێ لەسەر هاوڕەگەزبازی، چون زۆربەی ئەوانەی هاوڕەگەزبازن لە دایک و باوکێکی ئاساییەوە

پەروەردەبوون و زۆرینەی ئەوانەیشی هاوڕەگەزبازن منالی ئاسایی دەخەنەوە.!

سەرچاوە:

www.courts.ca.gov/documents/Amer_Psychological_Assn_Amicus_Curiae_Brief.pd

٤- کاریگەری ژینگەیی کاریگەری هەیە لەسەر تاکەکە، وە بە کاریگەری ژینگەیی مەبەستمان چواردەور و بڕیاری کەسەکە خۆیەتی.

توێژینەوەیەکی تازەی زانکۆی کالیفۆڕنیا ئەوە دەردەخات کە تەنانەت دووانە لێکچووەکانیش بە ئاڕاستەی جیادا دەڕۆن...

لە توێژینەوەکەدا لێکۆڵینەوەیان لەسەر چەندەها دووانەی لێکچووکرد، تێیدا لە ٣٧ حاڵەتدا کە سیفەتی هاوڕەگەزبازی تیایاندا دەرکەوتبوو، بۆیان دەرکەوت لە ٨٠٪ ی حاڵەتەکان تەنها یەکێک لە دووانەکان دەبوون بە هاوڕەگەزباز، ئەمە لە کاتێکدا هەردووکیان هەمان جینیان هەبووە....

ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە لە قۆناغێکی تەمەندا مرۆڤەکە بووە بە هاوڕەگەزباز چونکی جمکەکەی تری کە هەمان DNA ئەوی هەبووە نەبووە بە هاوڕەگەزباز.

سەرچاوە:

http://www.telegraph.co.uk/science/2016/03/15/homosexuality-may-be-triggered-by-environment-after-birth/

بەکورتی: مرۆڤ هاوڕەگەزباز لەدایک نابێت، تەنانەت گیاندارین خاڵین لەوەها کارێک، ئەوەیشی دەیکات تەنیا ململانێیەکە لەپێناو مانەوە و زاڵکردنی نێربوونی خۆیەتی بەسەر ئەوانی تردا نەوەکو شتێکی تر وە پرکردنەوەی هەوس بازیەکەی خۆی دوای بێزاربوون لە چووت بوون

لەگەل ئافرەت و ئاژەڵ ئەم جارە دەیناوێ پیاو و لەگەڵ پیاو جووت بێ و..،

الحمد لله على نعمة الإسلام،

لێرەشدا باسی زیانەکانی هاوڕەگەزبازی دەکەین

بەپێی سەر ژمێریە زانسیەکانی وەلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا کە ئەمریکی پێ هەڵساوە ئەم خاڵانایەنان بۆ CDC سەنتەری دەرکەوتوویە

١-هاوڕەگەزبازی بەهۆکاری یەکەم دائەنرێت بۆ تووش بوون و گواستنەوە نەخۆشی ئایدز بەبێ هیچ رکاربەرێک

٢-بەپێی سەرژمێریەکان تەنها لە سالی ٢٠١٠ سەدا ٦٣٪ بەهۆی هاوڕەگەز بازی بووە، وە پاشان زیاد بوو گەیشت بە سەدا ٧٨٪ بە جیاوازی لەگەڵ ئەوانەی دورن لە هاوڕەگەزبازی تەنها سەدا ٢٪ پێک هێناوە لەوەڵایەتی یەکگرتووەکانی ئەمریکا

٣-زیاتر لە ١١هەزار لە وەلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لەسالی ٢٠١٠ تووشی نەخۆشی ئایدزبوونە بەهۆی هاوڕگەزبازی

٤- لەساڵی ٢٠٠٨ بەجیاواز بەساڵی ٢٠١٠ نەخۆشی ئایدز زیادبووە بەرێژەی سەدا ٢٢٪ بەهۆی هاوڕەگەزبازی کەتەمەنیان لە نێوان ١٣ تاوەک ٢٤ساڵن کەسەکان کە هتڵدەستن بەهاوڕەگەزبازی

http://www.cdc.gov/hiv/group/msm/

هەر بەهۆی ترس لەم نەخۆشیەوە وەزارەتی تەندروستی ڕوسیا ڕێنمای دەرکردووە لە وەڵاتەکەی بۆ ڕوو بەڕوو بوونەوەی هاوڕەگەزبازی...

https://76crimes.com/2016/02/23/russia-proposes-exam-rooms-to-treat-homosexuality/

٤١٪ بیر لە خۆکوشتن دەکەنەوە و ٨٠٪ پێویستیان بە چاودێریی دەروونییە

بەپێی ڕاپرسییەک کە لەلایەن ڕێکخراوی «ترێڤۆر پرۆجێکت»ی ئەمریکییەوە بڵاو کراوەتەوە (کە ڕێکخراوێکی تایبەتە بۆ ڕێگریکردن لە خۆکوشتنی هاوڕەگەزبازان)، دەردەکەوێت کە لە سەددا ٤١ی هاوڕەگەزبازان بەقووڵی بیریان لە خۆکوشتن کردووەتەوە.
ڕێکخراوەکە ڕاپرسی بە ٢٨ هەزار کەسی هاوڕەگەزباز کردووە لە تەمەنی ١٣ بۆ ٢٤ ساڵ لە سەرانسەری جیهاندا، بۆیان دەرکەوتووە کە سەددا ٨٠ی هاوڕەگەزبازان چارەسەری دەروونی و بینینی پزیشکییان پێویست بووە، بەڵام سەددا ٥٦یان هیچ چارەسەرێکیان وەرنەگرتووە لە ساڵی ڕابردوودا.

دەرخەری (The Trevor Projectئەم ڕاپرسییەی ڕێکخراوی ( ڕاستییەکی گەورەیە لەبارەی هاوڕەگەزبازانەوە، سەلمێنەری ناجێگیریی دۆخی دەروونیی هاوڕەگەزبازانە، مامەڵەنەکردن لەگەڵیان وەک دەرووننەخۆش لەلایەن ڕێکخراو و کۆمەڵگەی نێودەوڵەتییەوە دەخاتە ژێر پرسیارەوە.

سەرچاوە:

The Hill. (2023). 41% of LGBTQ+ young people contemplated suicide in the last year: Survey. https://thehill.com/changing-america/well-being/mental-health/3983370-41-of-lgbtq-young-people-contemplated-suicide-in-the-last-year-survey/

**له کۆتاییدا:**

**من مردوو ئێوە زیندوو...**

**ئەگەر لە داهاتوودا لەنێو جەرگەی پەرلەماندا ، نێرلەنێرو مێ لەمێ ، مارە نەکرا ئەوە هیچ نازانم.....**

**دواتر منالبازی دەکرێت بەیاسا، بەڕادەیێک مرۆڤایەتی مرۆڤبوونی خۆی لەدەست دەدات، ئەمانە دەکرێنە شتێکی سادە، وەک چۆن ئێستا خانەی لەشفرۆشیو مەساج و باڕو مەلهەو خورادنەوەی مادده سەرخۆشەکان کراوەبە شتێکی ئاسایی، بەبێ ئەوەی کاردانەوەی خەڵکی هەبێت دەربارەی، ئەمە لەبەر ئەوەیە لەلایەکەوە سیاسیەکان هەرچەند پێشیان خۆشەو خۆشیان ئەکتەری سەرەکی ناو مەلهەو لەشفرۆشی و باڕەکانن ، لەلایەکیترەوە ناچارکراون لەبەرامبەر مانەوەیان لەسەر کورسی دەسهەڵات، لەسەریان فەرزدەکرێت لەلایان ڕۆژئاوا (ئەمریکاو ئەوڕوپا) هەرچی دژی مرۆڤایەتیە ئەنجامبدرێت بۆ ئەوەی بڕۆینە خوارەوەی گیانەوەران، بۆیە بەدووری مەزانە براکەت یاخود کوڕەکەت ڕۆژێك لەڕۆژان بێتەوە ماڵەوەو دەستی کوڕێکی دیکەی گرتبێت و پێکەوە سەرجێی بکەن و تۆش نەتوانی هیچ شتێك بکەی، بۆت نیە کاردانەوەت دژ هەبێت، ئەگەرنا بەکرێگیراوانی ڕۆژئاوا دەستگیرت دەکەن، بەبیانووی دژی ئازادی.**

بەکورتی یان دەبێت بڕۆیتە ژێر پڕۆژەی ڕۆژئاواو ببی بەکۆیلەی ئەوان یاخود ڕێگای ئیسلام بگریەبەر و دژی هەموو هەوڵێکی نامرۆڤانەیانبین.

●کێ هۆکاری ڕەگەز بازییە؟

ئایا ڕەگەز بازی پەیوەندیی بە حەز و ئارەزوەوە هەیە ! یان خودا بەو شێوەیە خەڵقی کردوون ؟

وەك دەبینین لەم زەمانەی ئێمەدا ژن لە ژن مارە دەکرێت و پیاویش لە پیاو ، زۆر کەس دەڵێن ئەو کەسە بەو شێوەیە دروست بووە و تاوانی چییە؟

زۆر کەسی تر دەڵێن باشە قورئان بۆچی باسی ئەو کێشەیەی نەکردووە ؟

ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ قورئان دەبینین بە وردی باسی ئەو کارەی کردوە بەڵکو کات و شوێن و زەمانەکەشی دیاری کردووە !؟

لە سورەتی الاعراف 80 دا الله دەفەرموێت: لوط علیه السلام بە قەومەکەی فەرموو:

ئێوە کارێك دەکەن هیچ کەس لە پێش ئێوە نەی کردووە ، کەواتە ئەو کارە لە پێش قەومی لوطدا نەبووە و خەڵکی نەیان کردووە ! ئەمەش بەڵگەیە بۆ ئەوەی کە هاوڕەگەزی و حیزی نەخۆشی و جیناتی و هۆرمۆنێ نییە بەڵکو حیزێتی وحەز و ئارەزووە!!

پاش قەومی لوطیش هەر خەڵکی لەسەر ئەو کارە بەردەوام بوون بۆیە هود علیه السلام بە قەومەکەی فەرموو:

(وَيَا قَوْمِ لَا يَجْرِمَنَّكُمْ شِقَاقِي أَن يُصِيبَكُم مِّثْلُ مَا أَصَابَ قَوْمَ نُوحٍ أَوْ قَوْمَ هُودٍ أَوْ قَوْمَ صَالِحٍ ۚ وَمَا قَوْمُ لُوطٍ مِّنكُم بِبَعِيدٍ)هود:89.

ئەگەر سەرنجی ئەم بەشەی ئایەتەکەتان دابێت؟

وَمَا قَوْمُ لُوطٍ مِّنكُم بِبَعِيدٍ

واتە: هود قەومەکەی بە ئاگا دەهێنێت واز لەو کارە بهێنن چونکە الله قەومی لوطی نەهێشت لەبەر کاری هاو ڕەگەزی و حیزێتی بوو ، وە ئێوەش واز لەو کارە بهێنن وە خۆشتان دەزانن و بیستوتانە قومی لوط چییان بەسەردا هات و ماوەیەکی زەمانی کەم هەیە لە نێوان ئێوە و قەومی لوطدا بۆچی پەند وەر ناگرن !؟

پاشان الله فەرمانمان پێ دەکات لەگەڵ ئافرەتدا بەو شێوەیە بین کە الله فەرمانی پێ کردوە و دایناوە بۆ مرۆڤ وەك لە سورەتی البقرة 222 دا دەفەرموێت:

(...فَأْتُوهُنَّ مِنْ حَيْثُ أَمَرَكُمُ اللَّهُ ۚ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ التَّوَّابِينَ وَيُحِبُّ الْمُتَطَهِّرِينَ).

دواتر دەفەرمووێت: (...نِسَاؤُكُمْ حَرْثٌ لَّكُمْ فَأْتُوا حَرْثَكُمْ أَنَّىٰ شِئْتُمْ...)

وەك چۆن دەم بۆ خواردن کراوە گوێ بۆ بیستن هەروەها مرۆڤیش بۆ جنس کردن الله شوێنی تایبەتیی بۆ خەلق کردووە.

لەو ئایەتانەی سەرەوە بۆمان دەر دەکەوێت هاو ڕەگەزی پەیوەندیەکی شەهوانی حەز و حیزێتی و ئارەزوی مرۆڤە نەك لایەنی فسیۆلۆجیی لەشی ئەو کەسە بێت ، یان ئەو کەسە الله بەو شێوەیە خەلقی کرد بێت ! بەڵکو هاو ڕەگەزی کردار و ویستی مرۆڤەکە خۆیەتی.

بۆ سەلماندنی ئەو ڕاستیەش وەك بینیتان لە سەرەوە پێش قەومی لوط ئەو کارە نە بووە بەڵکو داهێنانی قومی لوط بووە . هەروەها ئەو کارە لە قورئاندا و لە تەورات و ئینجیلیشدا ئیدانە کراوە و بە کارێکی نا مرۆیی لە قەڵەم دراوە ، وەك دەبینین لە سورەتی "الانبیاء و النمل" دا بەم شێوەیە باس کراوە:

⃪(وَلُوطًا آتَيْنَاهُ حُكْمًا وَعِلْمًا وَنَجَّيْنَاهُ مِنَ الْقَرْيَةِ الَّتِي كَانَت تَّعْمَلُ الْخَبَائِثَ ۗ إِنَّهُمْ كَانُوا قَوْمَ سَوْءٍ فَاسِقِينَ)الانبياء: 74.

واتە: بە لوط پێغەمبەریش حیکمەت و دانایی و زانیاریمان بەخشی و ڕزگارمان کرد لەو شارەی کردەوە پیسەکانیان تێدا ئەنجام دەدا، بێگومان ئەوانە قەومێکی نالەبار و خراپ و بەدخوو تاوانکار بوون...

⃪(وَلُوطًا إِذْ قَالَ لِقَوْمِهِ أَتَأْتُونَ الْفَاحِشَةَ مَا سَبَقَكُم بِهَا مِنْ أَحَدٍ مِّنَ الْعَالَمِينَ) الاعراف:80.

واتە: یادی (لوت پێغەمبەریش) بکە کاتێک بە قەومەکەی وت: چۆن ئێوە گوناهو تاوانێکی وا دەکەن کە تا ئێستا هیچ کەس پێش ئێوە لە جیهاندا گوناهو تاوانی وای نەکردوە؟!

لەو ئایەتانەی سەرەوە وەك دەبینین ئەم سێ دەستەواژەیە بەکار هێنراوە:

( الخبث ، الفسق ، الفحش ) الخبث: واته الردئ خراپ هەروەها بە مانای "لکع"یش دێت واتە: تافە هیچ و پوچ.

هەروەها "الفسق" واتە سەرپێچی و لە فەرمان دەرچون هەروەها بە مانای ئەوە دێت کەسانێك دژی فیطرة و ژیان دەجوڵێنەوە.

وە "فحش" هەموو شتێکی خراپە بکرێت بە وتن و بە کردار ، یان هەر شتێك لە حەدی خۆی دەر بچێت کەواتە ئەگەر کاری هاو ڕەگەزی و حیزێتی لە گەڵ بون و لاشەی مرۆڤدا بووایە و الله ئەو کەسانەی بەو شێوەیە خلق بکردایە حەزیان لە هاو ڕەگەزی بوایە ، بەو شێوەیە قەومی لوطی بنەبڕو ژێراوژور نەدەکرد ! هەروەها بە "خبث و فسق و فحش"یش لە قەڵەمی نە دەدان!

لێرەدا الله بە ڕاشکاوی باسی نێر بازی دەکات:

⬅(أَتَأتونَ الذُّكرانَ مِنَ العالَمينَ)

ئایا لە ناو ئەو هەموو خەڵکەدا ئێوە بە شوێن نێرینەدا دەگەڕێن و دەتانەوێت ئارەزووی جووت بوون لەگەڵ ئەواندا جێبەجێ بکەن؟...

(وەك تعجب و سەرسوڕمانێك الله لە زمانی لوطەوە باس لە ڕەگەز بازی دەکات و بە شتێکی سەیر دراوە لە قەڵەم ئایا چۆن پیاو لەگەڵ پیاو ئەو کارە دەکەن !؟

⬅(وَتَذَرونَ ما خَلَقَ لَكُم رَبُّكُم مِن أَزواجِكُم ۚ بَل أَنتُم قَومٌ عادونَ)

وازیش دەهێنن لە هاوسەران و هاوجووتانی خۆتان کە پەروەردگارتان بۆی دروست کردوون، بەڵکو ئێوە هەر قەومێکی نالەبارو بەدڕەوشت و ناڕەسەنن.

← (قالوا لَئِن لَم تَنتَهِ يا لوطُ لَتَكونَنَّ مِنَ المُخرَجينَ)

تاوانباران وتيان: ئەی لوط، ئەگەر کۆڵ نەدەیت لە دەربەدەر کراوان دەبیت.

← (قالَ إِنّي لِعَمَلِكُم مِنَ القالينَ)

لوط وتی: بەڕاستی من بێزارم لە کارو کردەوەتان و نەفرەتی لێدەکەم و بێدەنگ نابم.

← (رَبِّ نَجِّني وَأَهلي مِمّا يَعمَلونَ)

ئەوسا کە نائومێد بوو لێیان، نزای کردو وتی: پەروەردگارا خۆم و ماڵ و خێزانم ڕزگار بکە لەو کاروکردەوانەی ئەمانە دەیکەن.

← (إِلّا عَجوزًا فِي الغابِرينَ)

جگە لە پیرەژنێک (کە هاوسەری بوو) لە تیا چووەکان بوو (چونکە باوەڕی بە پەیامەکەی نەبوو)

← (ثُمَّ دَمَّرنَا الآخَرينَ)

لەوەودوا ئەوانی ترمان ڕیشەکەن کرد.

⇠(وَأَمطَرنا عَلَيهِم مَطَرًا ۖ فَساءَ مَطَرُ المُنذَرينَ)

بەسەختیش بەرد بارانمان کردن، ئای کە خراپ و سەخت و دژوارە بارانی بێدارکراوەکان.

⇠(إِنَّ في ذٰلِكَ لَآيَةً ۖ وَما كانَ أَكثَرُهُم مُؤمِنينَ)

بە ڕاستی ئا لەوەدا بەڵگە و نیشانەی (بەهێز هەیە لەسەر دەسەڵاتی پەروەردگار) کەچی زۆربەیان باوەڕدار نەبوون.

بەڵگەی ڕاستیمان بۆ قسەکانمان کە لە زەمانی لوطەوە ئەو کارە دەستی پێ کردووە زانای و دانایی لوط بووە کە الله ،زانایی و علم و زانستی پێ بەخشیوە و لە علم و وەحێکی ڕەبانییەوە قسەی کردوە چونکە لە سورەتی "الانبیاء: 74دا ، الله وەسفی لوط علیه السلام دەکات و دەفەرموێت:

(وَلُوطًا آتَيْنَاهُ حُكْمًا وَعِلْمًا)

ئەگەر کەسێك هاو ڕەگەزی بکات و بڵێت: الله وای دروست کردوم و من چارەسەرم نییە ! بەهەمان شێوە قورئان وەڵامی داوەتەوە لە سورەتی"القمر:33" داو دەفەرموێت:

(كَذَّبَتْ قَوْمُ لُوطٍ بِالنُّذُرِ)

واتە: قەومی لوط ئەو هەڕەشە و ئاگاداریانەیان بە درۆ خستەوە کە لوط (ع) پێی دەدان !

ئەگەر الله عەبدەكانی خەلق بكات و كابرا بڵێت من بەو شێوەیە خلق كراوم و سێڵەكانی لەشم بەو شێوەیە ئەو كات اللهی زانا بەو شێوەیە هۆشداری و ئاگاداریی پێ نە دەداین!

هەروەها الله قەومی لوطی لەناو نەدەبرد چونكە خۆی بەو شێوەیە دروستی كردوون ، بۆچی لەناویان دەبات و تاوانیان چییە؟

كابرا بە ویستی خۆی بەو شێوەیە دروست نەبووە.

هەروەها بە نیسبەت ئافرەت لەگەڵ ئافرەتدا ڕەگەز بازی دەكەن ئەوەش كەسانێكی زۆر كەمن ئەگەر بەراوردیان بكەین لەگەڵ خەڵكی بە گشتیدا ، وە زۆر ئافرەت هەیە منداڵیشی هەیە و ئەو كارە دەكات و پەیوەندیی بە حاڵەتی نفسی و هەوا و هەوەسەوە هەیە نەك بە لایەنی خەلقی و دروست كردنی ئەو پیاوە یان ئەو ژنەوە ، ئەو كەسانە هەوەس بازن نەك ڕەگەز باز...

كەواتە جوانترین وەسف بۆیان (هەوەس بازە) نەك (ڕەگەز باز) وە كۆمەڵگای نێو دەوڵەتی وشەی ڕەگەز بازیان بڵاو كردوەتەوە هەتا ئەو عەیبە بخەنە سەر الله و لایەنی فسیۆلۆجیی مرۆڤ بە شەرتێك لە جیهان دا ئەو نەخۆشییە هیچ عیلاجێكی نییە بێجگە لە عیلاجی نفسی وە باشترین ناو بۆ ئەو دیاردەیە هەوەس بازییە نەك ڕەگەزبازی ! چونكە پەیوەندیی بە حەز و ئارەزووەوە هەیە نەك ڕەگەز و ڕەگەز بازی

https://m.facebook.com/story.php?story_fbid=3038798211725108&id=107101947516966

⚫خۆكوشتن لەناو: سەربازە هاو ڕەگەزبازو هەوەس بازە فێمێنیستەكاندا.

**Human_Trafficking**

**زۆرترین ڕێژەی خۆکوشتن لە ئەمەریکا لەناو ئەو کەسانەدایە کە بەشداری شەڕیان کردووە، یان ڕەگەزی خۆیان گۆڕیووە و هاوڕەگەزبازن، یان ئەوانەی ڕاویان بۆ ئەو ٢ جۆرە تاقمانە کردووە.**

**چیرۆکی ژیانیان و موعاناتەکانیان هەمووی ئەوەیە کە دوای بەشداری نەیانتوانیوە ژیانێکی ئاسایی بکەن و دۆخێکی جێگیریان هەبێ، هەستی ئازاری ویژدان و تاوانەکانیان وای لێکردوون گۆشەگیربن لە پێشدا و دواتر بە خۆکوشتن کۆتایی پێبێ.**

**زۆرترین ڕێژەیان لە بەشە دەرونیەکانیاندا هەیە، بە تایبەت لە تاقمی خەمۆکی(Depression) ( تەنهایی وLoneliness).**

**ئەمەی کە ئێستە لە کوردستاندا خەریکە بنچینەی بۆ دادەنرێ سەرەتای ئەو نەهامەتییە، دواتر وەك لوت عەمەلیان کردنەکە ئاسایی دەبێتەوە و لە بازڕیشدا پێوەی دەگەڕێ!**

**وەك چۆن ئەوانەی کە ڕەگەزیان بە نەشتەرگەری گۆڕیوە دواتر پەشیمان دەبنەوە و دەڵێن:**

**I Want My Sex Back**

**دەمەوێ ڕەگەزەکەم بگەڕێتەوە! بەڵام کە بڕا تازە گەڕانەوەی چی؟!**

**چاوەڕێ مەبن سیاسی و دکتۆر و بازرگانەکان پشتگیرییتان بکەن!**

**بزان دکتۆرێك هەیە بڵێ: ئەرە کاکە گیان دادە گیان ئەم لوتەی تۆ عەیبی چییە وا ئەیبڕی!؟**

**کەسێك هەیە بڵێ: با زاهیری جوانیش بێ بەڵام دواتر یەك دونیا مەعاناتی هەیە، دکتۆرێك هەیە کچێك بڕواتە لای و دکتۆرەکە بڵێ: ئەرە دایکی دایکەکەم ئەم قونی تۆ عەیبی چییە وا پڕی دەکەیت لە هەوا!**

**ئەم کوڵمی تۆ خراپی چییە! وا پڕی دەکەیت لە کیمیاویی و گەن و گوو!**

تاوانبارەکانی ئەم بوارەش سیاسییەکان و دکتۆر و بازرگانەکانن، قوربانییەکانیش کەسانی سادە و داماون، یان دوای مادە کەوتوون، یان دوای شەهوەت، کەس نەبووە لە کاتی خۆیدا دەستیان بگرێ.

بە سەدان ڕێکخراو لەناو داوی ئەو سیاسی و بازرگانییانەدان زۆریان هەتا خۆشیان بە خۆشیان نازانن!

کاتێ کە هۆش دەکەنەوە زۆرێك لەوانەش خۆی دەکوژێ، کە چۆن وەك قولاپ و تۆڕێك ماسی بۆ خۆی نەگرتووە و تەنها ئامێر بووە.

وڵاتە هەژارەکان زۆرترین قوربانیان لەم بوارەدا داوە، بە تایبەت ئەوانەی کە کچەکانیان جوانن.

لە ڕۆژهەڵاتدا تا ئاستی زانای بەرز و دکتۆر و کەسانی پسپۆڕ لەو تۆڕانەدا گلاون، هەیان بووە دواتر تێگەشتووە و پاشەکشەی کردووە، هەبووە بووە بە قسەی خۆیەوە و تا مردن هەر پێداگری لەسەر کردووە، بۆ نموونە دکتۆرە سەعداوی کە پێش ماوەیەك لە تەمەنی ٩٠ساڵیدا وەفاتی کرد، هەشبووە بە خشکەیی خۆی کشاندووەتەوە، هەش بووە و هەیانە لە یەکێك لەو دۆخانەدایە ئێستە.

هەرگیز، هەرگیز، هەرگیز، متمانە بە ڕێکخراویی بیانی و ڕۆژنامەنووسی بیانی و بازرگانی بیانیی نەکەن، وە ئەوانەش کە دەستیان لەگەڵیاندا هەیە، زۆرترین تۆڕی سیخوڕی و چڵکاوخۆری و خیانەتچیی لەناو ئەو دەزگایانەدایە بۆ خستنە داوی بێدینی و بازرگانییەکانیانەوە.

کاری زۆر باش و خێرخوازیی و ئاشکرا دەکەن، ناوەکانیان جوان و سەرنج ڕاکێشە، ئەوانە هەمووی توێژاڵی سەرەوەیە بۆ سەرسام بوون پێیان.

هەموو ئەوانە دەچنە قاڵبی بازرگانی کردن بە مرۆڤەوە، بەڵام لەژێر ناوی هەڵخەڵەتینەردا.

هەتا زۆر لەمانە لە دوکومێنتاریە بیانییەکاندا نەشاردراوەتەوە، بەڵام ئەوەی کە زیاتر حسابی بازرگانی بۆ دەکەن ئەوانەن کە بۆ لەشفرۆشی بەکارهێنراون، وەك:

ئەو ڕێکخراو و دەستانەی کە کچەکان لە ئۆکرانیاوە بەناوی کار و خۆشەویستیەوە دەبەن بۆ ئەمریکا و لەوێ لەشفرۆشیان پێ دەکەن.

یان ئەوانەی کە بەناوی فاشیۆن و ڕیکلام بۆ عەترەکانیان دەیانبەن بۆ فەرەنسا.

یان ئەوانەی لە ئەوروپای ڕۆهەڵات و هەندێ لە وڵاتەکانی سۆڤیەتی کۆن کە تا ئێستەش هەر هەژارن و بۆ کرێکاری دەیانبەن بۆ باکووری بەریتانیا!

مەهێڵن ژن و کچ و خوشك و دایکتان بەشداری هیچ چالاکییەکی ئەو جۆرانە بکەن، وڵاتە هەژارەکان ئافرەتەکانان ناچارن لەبەر بژێوی و دەکەونە ناو ئەو داوانەوە.

لە ئیسلامدا ئافرەت لەسەری نییە بژێوی پەیدا بکات، مەهێڵن بکەونە داوی بازرگانەکانەوە، هەتا با لە ڕاگەیاندنەوە لە پێش چاویشتان بێ.

هەمووی بازرگانی کردنە بە مرۆڤەوە، کەمێکی پێ دەدەن بۆ ئەوەی زۆرترینی لێ وەرگرن.

ئیشێك کە حورمەتی ئافرەتی تێدا نەبوو وە گەر یەك مەرجی ناشەرعی تێدا بوو پارەکەی بخەنە ئەو تەوالێتەی کە لێوەی هاتووە!

ئەمریکا دیفاع لە قوندەرێك بکات، نابێ ئەوە ڕات بچەڵەکێنێ!

لە ئەمریکا ئێستە دەبێ ژن و پیاو لە دەرەوەدا ٢ مەتر نێوانیان بێ لەبەر کۆرۆنا!

بەڵام لە کوردستاندا دۆخی کۆرۆناکەش ڕەچاو ناکرێ وناڵێن: کورە کاکە هیچ نابێ ئێستە کەی وەختی ئەم پێکەوە نوسانەیەیە! لە جێگەی گشتیشدا!

ئەوانە لە پشتگیری بێ ڕەوشتی هیچ کات شەرم ناکەن، بەڵام ئێمە بەلامانەوە عەیبەیە ناوی ئەندامی نێرینەیی و مێینەیش بڵێین یان بینووسین.

تەنها تێبینی بکە بزان چۆن حورمەتی باوەڕی گشتی لە کوردستاندا کەمی کردووە!

جاران هەموو کەناڵەکان ئافرەتەکان لە ڕەمەزاندا حیجابیان دەکرد، ئێستە هەرچی بابەتی وروژێنەری سێکسییە دەیخەنە ڕەمەزانەوە.

لە دونیاشدا کەم تەمەنترین دکتۆرە لە چینی موحەجەبەکانن.

هۆ دونیای دێمۆکراسی و عەلمانی و سەرمایەداری ئیتر بەسە مامەڵەکردن بە مرۆڤەوە بەناوی ماف و ڕاو ئازادی و....و.....و.....وە.

https://truecolorsunited.org/our-issue/

https://www.healthline.com/health/depression/gay#support

https://www.gq-magazine.co.uk/article/lgbt-mental-health

درۆ بەناوی زانستەوە:

https://www.facebook.com/490761227694497/posts/3589072431196679/

📢 هۆز خەڵکینە📢

ئەگەر پێغەمبەر موحەممەد صلی الله علیە و سلم بیفەرمووایە:

**مرۆڤ نەوەی مەیمونە، وە هیچ ڕێزێکی نیە، ژیان بەها و ئامانجی نیە، شتێک بوونی نیە بەناوی ئەخلاق، دەستدرێژی سێکسی و دزی و درۆ کردن ئاساییە، حیزێتی(هاوڕەگەزبای) ئاساییە ، جووت بوون لە گەڵ دایک و خوشک و کچەکانتان ئاساییە و مێردکردن بە سەگ و کەرو مەیمون و....و..... ئاساییە ، گەردوون لە هیچەوە هاتۆتە بوون و هەر بە ڕێکەوت دروست بووەو لە هیچەوە هاتووین و بۆ هیچ دەڕۆین و ئامانج هیچەو کۆتایی ئێمەو بونەوەرە هیچە.....**

**ئایا شوێنی دەکەوتن یان بە شێتتان نەدەزانی؟**

**ئەی ئیتر....أفلا تعقلون؟**

# ٢٦ _ مەترسیەکانی ئازادی مۆدێرن بۆ سەر گەلانی جیهان چیە؟

لەساڵی 1974 دا خانمە هونەرمەند و پێشکەشکاری سڕبی ماریا ئیبراهیموفیچ تاقیکردنەوەیەکی شانۆگەری ئەنجامدا بۆ زانینی کاریگەری ئازادی رەها لەسەر کار و کردەوەکانی مرۆڤ بۆیە لەهۆڵی شانۆکە لەپێش بینەرەکانی (چەقۆ و گوڵ و دەمانچەیەیکی دانا) دواتر چووە سەر ستەیەجە و لەسەر کورسیەک بەبێ جوڵە بۆماوەی شەش سەعات دانیشت ئازادی دایە بینەران چی کردەوەیەک دەکەن لەوکاتە !

سەرەتا خەڵکی سەیری دەکرد و هیچ جوڵەیەکیان نەبوو بەڵام هەر کە زانیان کە راستگۆیە و جوڵە ناکا و هیچ بەربەستی نیە لەپیشیان هیچ شتێک نیە رێگر بیت لێییان دەستیان کرد بە ئاهەنگەکەیان !جلەکەیان دڕی ، لێیاندا ، بەهەموو شێوەیەک تەحەروشیان پێکرد تەنانەت یەکێکیان ویستی بەدەمانچەکە بیکوژی بەڵام رێگری لێکرا لەلایەن ستافەکەوە ! شەش سەعاتەکە مارینا بەبێ جوڵە و کاردانەوەیەکی توند تەواویکرد کە هەستا هەموویان رایناکرد لەپێشی دواتر مارینا وتی ( ئەو مرۆڤانەی تەعامولیان لەگەڵ ئەکەین و لە تەمەن و رەگەز و کەسایەتیەوە جیاوازین لەگەڵیان گەر فورسە و هەلیان بۆ بڕەخسێت دەتوانن کاری خراپ و دڕندانە و بێ شەرمانە بکەن !)

باواز لەو چیرۆکە بێنین خەیاڵبکە تۆ کوپێک ئاوت هێناوە و دواتر ڕژاندتە زەوی چی ڕوودەدات ؟ بەدڵنیاوە لەو خاڵەی رژاندوتە دەڕوات بەبێ ئەوەی هیچ بیوەستێنێت بەڵام گەر گۆزەیەکت خستە ژێر کوپەکە ئەوکاتە ئاوەکە لەناو گۆزەکە کۆبێتەوە ، گۆزەکە ئەبێتە سنوری ئاوەکە و نارژێتە زەوی !

یەکەمجار بینیمان مارینا لەپێش خەڵک وەستابوو بێ هیچ یاسا و ڕێسایەک بیپارێزیت بۆیە یەک بەدوای یەک ئازاری توشەبوو وەک چۆن ئاوێک بەدوای یەکدا بڕژایە زەوی بەڵام ئەو دەمەی مارینا جوڵا و ئازادی خەڵکی وەستاند خەڵکەکە زانی ئازادیەکەیان سنورداربوو ئا لەوکاتەدا بینیمان ئاوەکە ڕژایە گۆزەکە و سنوری گۆزەکە پاراستی لەرژان و لەناویدا کۆبووەوە !! مارینا زانی ئازارەکان وەستان لەودەمەی سنورەکانی دیاریکرا !

بەم شێوازە "تۆماس هۆبس" باسی ئازادی دەکات (ئاوێک رژابێتە ناو گۆزەیەک ئەوا ئازاد نیە مادەم لەناو گۆزەکەدایە رێگری لێکات لە ڕژان بەڵام هەرکات گۆزەکە شکا یان کونی تێکەوت ئەوا ئاوەکە ئازادی خۆی بەدەست دێنیتەوە بەم شێوازە ئازادی بوارێکی پێدراوە بۆ تاک ... یاسا یان بابلێین سنوورەکان ئەو گۆزەیە رێگری لەفیرۆچونیکی بێ سوودی ئاوەکە(ئازادی) دەکات و کۆمەڵگا دەپارێزی لەزیان و ژیانیش لە فەساد دەپارێزی )

بەڵام ڕووەکەی دیکە ئەم کۆت و یاسایە ئازادیە ترە بەڵام شێوازێکی تر ...!

جۆن جاک رۆسۆ ئەڵی ( پەیرەویکردنمان لەو یاسایە کە پەیوەستین پێوەی هەر ئازادیە )

گەر بمانەوێ لەمە تێبگەین ئەوا دەبینین مەبەستی ئازادی لەچوارچێوەی شەریعەتدا ڕزگاربوونی مرۆڤە لە شەهوەتەکانی کە وەک ئاژەڵێکی بێ هەست دەیجوڵێنێتەوە و پاڵی پێوە دەنێت، ئازادی شەریعەت و سنوردار وادەکات جیهانێکی گەورەتر ببینیت ئەو جیهانە گەورەیە بەدی نایە مەگەر بەچاککردنی نەفسی خۆت نەبێت وەک

ئەرستۆ دەڵی کۆمەڵگا وەک شانەکانی ناوەوەی مرۆڤە گەر شانەیە چاک بوو هەمووی باشە گەریش خراپ بوو هەمووی خراپەکات .

ئازادی شەرع وادەکات لە مرۆڤ کەبتوانی نەفسی کۆنترۆڵ بکا نەک نەفسی مرۆڤەکە کۆنترۆڵی مرۆڤەکە بکات ، ومرۆڤەکە هەست دەکات کە پەیرەوی لە کۆمەڵی یاسا و رێسا رەهای جێگیر دەکات کە بەردەوامبوونی ژیان دەپارێزیت وە هەست بە دڵنیایی دەروونی دەکات کە ئەم گەردوونە تاکە اللەیە رێکی خستووە و جیهانەکە عەشوایی و هەرکەسەو بۆخۆی نیە !

عەلی عزەت بێگۆفیچ دەڵی( بوونی ئازادی بۆخۆی گەورەترین بەڵگەیە بۆئەوەی خوودا مرۆڤی دروستکردووە ، خوودا مرۆڤی بەرپرسیاڕ و مرۆڤی رەوشتداری دروستکردووە ، مرۆڤ لەناو خوودی خۆیدا دەزانی بەرپرسیارە لە رەوشت و رەفتارەکانی ، مرۆڤ وێل و سەرگەردان نیە وەک ئەوەی دەڵێن مادەیەکی پەرەسەندووی سروشتە ونە نرخ ونە سنوری هەبێت )

بۆیە بەکارهێنانی ئازادی ڕەها بۆ هەموو شتێ باوەڕێکە لەئەسڵا خۆی رەتدەکاتەوە ...

چونکە گەر بڵێین ئازادی رەهایە ئەوا لەنێوان دوو ئەگەرین سێیەمیان نیە یان ئازادین لەوەی ئەو (ئازادی رەهایە) رەتەکەینەوە ئەمەش دەسەڵاتەکەی(ئازادی رەها) لەناو دەبات

یان ئەوەی ئیلتزام دەکەین بەو ئازادی ڕەهاوە ئەوەش باوەرەکە خۆی لەناوەبات چون ئازادیەکەمان سنوردارەکات ! ئیلتزامی ئەوەمان دەکات دەبێ ئازادیمان ڕەهابێت !

کەواتا بۆمان دەرکەوت ئازادی رەها وەهمە و بەدەست نایەت ...
چونکە هەموو ئاوێک گۆزەیەک هەیە رێگری لێدەکات لەڕژان ، گەر وانەبێت کۆمەڵگاکە دەگۆرێت بۆ شانۆگەریەکی گەورە وەک ئەوەی مارینا ئیبراهیمۆفیج !

ئازادی حەزێکی خۆشویستراوە لەدەروونی مرۆڤدا ، لە ئازادیدا هێزی مرۆڤایەتی بوونی هەیە لەبیر و هێز و کار و توانا مێشکیەکان لە ئازادیدا دەرەکەوی کە هاوجوتە لە بواری داهێنان و وردبوونەوە بۆیە باش نیە پەیرەوی لە کۆت و قەیدی کە سوودی بۆ کەسەکە نەبێ و زەرەری لێبات

"تاهر بن عاشور ئازادی لەچوارچێوەی شەرعیەتدا"

ئەگەر بەتەواوی برۆینە ژێر ئەو پابەندبوونانەوە : ئامانجی گەورەی مرۆڤ پاراستی ژیانە بۆیە پێویستی بەوە هەیە تاکەکان مل بدەن بۆ ئەوشتانەی کە واجبە لەسەری ، دوای ئەوەی هەموو مرۆڤەکان ملیان دا بۆیاساکە کۆمەڵگاکە دەگاتە یەک بەربەست و کۆتی لۆژیکی کە ژیانی ئەو کۆمەڵە مرۆڤانە ڕێکدەخات )

هەموو یاسایەک مرۆڤ داینی قابلی رەخنەیە بەهۆی جیاوازی تێگەشتن و کات و دۆخەوە کە بووە بەهۆی دروست بوونی یاساکە بۆیە پێویستی بوون بە کۆت بەربەستی رەها وخوودایی کە ناگۆڕێت بە گۆرانی زەمانو شوێن و مرۆڤ و چون پێوەری هاوسەنگ لێرە پێدانی مافە مادی و مەعنەویەکانی مرۆڤە بێ زیادەرۆیی کردن و دەسبردن بۆ سنوری مرۆڤێکی تر و شکاندنی سنووری خوودا ....

لەم چوارچێوەشەوە لایەنیکی گرنگتر و گەورەتر دەبینین ئەویش سنوری الله و مافێتی لەسەر دروستکراوەکانیەتی گەر مرۆڤ دروستکاری خۆی نەبی کەواتا چۆن یاساکانی خوودای خۆی ڕەتەکاتەوە ، چۆن دەزانی ئەو یاسایەی خەڵکی دروستی کردووە باشترە لەوەی دروستکاری مرۆڤ  دایناوە ...؟!

ئازادی بەهەمووجۆرەکانیەوە چ سیاسی بێت چ جەستەیی چ ئابووری بێت لەچوارچێوەی ئیسلامدا سنور دار دەبن بەهۆی دوو ڕێخکەرەوە :

یەکەم پەیوەندی نێوان بەندە وخودایە : لەچوارچێوەی ئیسلامدا بەندە دەبێت رازی بێت بەهەموو سنور و یاسایەکی خووایی کە  ئەمەش دەبێتە هۆی رازی بوونی خوودا لێی

دووەم ئازادی نێوان بەندە و کۆمەڵگایە : ئیسلام بەشێوازی ئەم ئازادیەی رێک خستوە کە بەندە زەرەر و زیانی بۆهیچ موسڵمانێکی تری کۆمەڵگاکەی یان گەردوون نەبێت .

بەڵام ئەو ئازادیە ئێستا خەڵکی بەهەڵە لێی تێگەشتووە ئازادی سیاسی تێکەڵ بە جەستە و فکر ئەکات  عمری کوری خەتاب رەزای خوای لێبێت ئەڵی (چۆن خەڵکی ئەکەن بەکۆیلە لەکاتێکدا لەدایک بوونە بەئازادی )  ئەم وت بەکار دێنین بۆ ئازادی جنسی و فکری بەڵام ئەمە لە سیاقێ سیاسی وتراوە بۆ رەوایی نەدان بەزوڵمی زاڵم ، بۆیە بەشەریەت قەت نەبووە بێ قەیت و کۆت و یاسا بێت بەڵکو هەر کۆمەڵگایەک دروست نابی لەئەسلا گەر کۆت و یاسا نەبێت رێک دادەکەوێت چون مەسڵەحەت و خراپەکاری تێکەڵی دەبێت کەواتا دەبێ بزانین کۆت و کۆسپی ئەخلاقی شتێکی حەتمیە بۆ راگرتن و رێکخستنی رێژەی جیاوازی مرۆڤەکان و دەبێ ئەوشتەی جیاوازیاکا نەهێلیت و مرۆڤەکان کۆکاتەوە یاسایەک بێت لەسەروی مرۆڤەوە بێت نەک مرۆڤ لەسەروی گەردوونیشەوەبێت...

چون ئەو دروستکارە و بەهەموو شت زانایە و هیچ شتێک لەسەروی ئەوە نیە و هیچ شتێک ناڕواتە دەرەوەی حوکم و شەرعی بەڵکو جەستەتیش خاوەنەکە تۆ نیت چون خۆت دروستکاری نیت بەحەزی خۆشت نامرێت ! هەمووی موڵکی اللەیە و ڕێکی خستووە وەک چۆن سروشتی گەردوونی ڕێکخستووە یاساکانی بۆ مرۆڤیشی ڕێکخستووە ، مادەم هەموو موڵکی خودایە بۆیە دروست نیە دەرچوون لەیاساکانی تەنانەت گەر بێتوو لەنێوان خۆت و خوداشبێت !

## ٢٧ _ چۆن لەژێر چەتری عەلمانیەت کۆمەڵگا لەناو دەچێت؟

چەن جار شۆک بووی بەبینینی وێنە و دیمەنێکی نائاسای و خراپ و ئابڕووبەری کچە مۆدێلێک یان پێشکەشکارێک یان هەرکەسێکی تر لەتیڤی و تورەکۆمەڵایەتیەکان کە توشی کاردانەوە و تووڕەبونی کردوویت سەرەڕای ئەوەی دیمەنەکە ئابڕو بەرە و دژی دین و عورف و عادەتی کۆمەڵگاکەشە لەسەروی ئەوەشەوە سەیری کۆمەڵێ کەس دەکەی دەڵێن ( بۆ رەخنە لەخەڵک دەگرن ، واز لەخەڵکی بێن باچیەکەن بیکەن . حەقتان چیە هەموو کەسی ئازادە لەجەستەی خۆیدا بەمەرجێک زیانی بۆ خەڵک نەبێت و خەڵکی ئازار نەدا )

ئەم شێوە قسانە خەڵکی چەواشە کردووە بۆیە بەشێ خەڵک ئەڵێت ئەوکەسەی کە حەز و ویستە خراپ و لادەرەکانی خۆی ئاشکرا ئەکات خۆ ئازاری کەس نادات بەڵکو شتێکەو بۆخۆی دەیکات یان بەشێ تریان ئەڵێن ئەو کەسەی بە جلێکەوە دەرەکەوێ کە داپۆشراو نیە و پۆشتە نیە خۆ کەسی نەکوشتووە خۆ ماڵ و موڵکی نەبردووە حەقتان چیە بەسەریەوە بۆ قسەی پێ ئەڵێن کابرا ئازادە بۆخۆی یان دەڵێن هەموو کەس ئازادە خۆ کەس ناچێتە قەبری کەسەوە ! ..!!هەتا دوای لەم شێوازە قسانە ....

ئێمە پرسیارێک دەکەین لەوانەی باوەڕیان بەئازادی رەها و موتڵەق هەیە و ئەو قسانە دەکەن پێیان دەڵێین ئایا هەربەجدی ئازادیەکی رەها و موتڵەق هەیە کە هیچ کۆت و بەربەستێکی نەبێت ؟

ئایا لەمێژووی مرۆڤایەتی بەگشتی بەشارستانیەتە کافرەکانیشەوە قەت ئازادیەکی رەهابوونی هەبووە ؟

ئایا قەت هەبووە ژیانی کۆمەڵێ خەڵک بێ یاسا و ڕێسایە بێت بۆ ڕێکخستنەوەی ژیانیان ؟

ئایا شتێکی لۆژیکە ژیانی کۆمەڵێک خەڵکی بێ کۆت و بەربەست و یاسا بێت؟

ناخۆشتر لەوە ئەوەیە ئەوکەسانەی دەڵی (وازلەخەڵکی بێنن هەقتان لەکەس نەبێت هەمووکەس ئازادە) خۆی بە باوەڕدار و مووسڵمان دەزانیت ! ئایا ئەمە ژیری و هۆشیاریە کەسێک باوەری بە الله هەبێت و خۆی بەمووسڵمان بزانێت ئەم قسانە بکات ...!؟؟

یان ئەوەیە موسڵمانان و تاکی ڕۆژهەڵاتی بەعامی کەوتونەتە ژێر کاریگەری فیکری شارستانیەتی مۆدێرنی رۆژئاوایەوە هەتا کوێربووین لەئاستی وێنەگەورەکەدا ..!!؟؟

وەرن با پلە پلە سەیری مەسەلەکە بکەین...

کاردانەوەیەکی پێچەوانە !

مارکۆس ئۆرلیبۆس وتەیەکی هەیە دەڵێ :ئەو کردار و رەوشتەی بۆ تاکێک سوودی نەبێ بۆ کۆمەلگاش بێسوودە ! )

ئەو کردار و رەوشتەی یارمەتی دروست بوونی مرۆڤێکی چاک نادات ئەوا یارمەتی دروست بوونی کۆمەڵگایەکی بەهێز نادات ! کەواتا ئازادی بۆ کۆمەڵە ڕەوشتێک نیە کە سوودی بۆ مرۆڤ نەبێت ، ئازادی بۆ کۆمەڵە رەوشتێک نیە مرۆڤی دروست نەکات ! چون کۆمەڵگایەکی لاواز و داتەپیو و بێ هۆش دروستدەبێت !

**عەزیز عەرباوی ئەڵی ( یەکی لە کێشە گەورەکانی چەمکی ئازادی لەوکاتەدا دەرەکەوێ کە پابەندەبێت بە یاساکانی کۆنەوە یانی بۆ ئەوەی ئازادی بنیاد بنێت مەجبووری لەسەر کلتورێک دایبمەزرێنیت ! هیچ چارەیەکیش نیە ئیلا ئەبێت لەسەر کلتورێک دابمەزرێت گەر ئەوەشتکرد ڕاستەوخۆ ئازادی هەڵەوەشێتەوە ! چون وابەستەی کۆمەڵێ خاڵ و عورفی گەلەکە دەبێت ! کێشەکە ئەو شەڕەیە لەنێوان تاک و کۆمەڵگادا هەیە کە تاکەکان دەیانەوێت لە کۆتی کۆمەڵگاکە دەربازبن، دەیانەوێ کۆمەڵێ یاسایی بکەن بەنایاسایی و کۆمەڵێ نایاسایی بکەن بەیاسایی !! کەواتا ئازادی بوونی نیە بەڵکو گۆرینی کۆمەڵە کۆتێکە بۆ کۆمەڵێک سنور و کۆتی دیکە !!**

**نابێ تاک سەنتەری ئازادی بێت چون گەر تاک سەنتەری ئازادی بێت ئەوا کێشەیەکی گەورە دروستدەبێت چون ئەو تاکە خۆ لەکۆمەڵگادا دەژی کەوایا لەسەر حسابی کۆمەڵگاکە هەوڵی چنگ خستنی ئازادیەکانی دەدات ! خۆ ئازادی تاکەکەسیش کەس داوای ناکات گەر خۆی تەنهابێت ئیلا دەبێت لەچوارچێووەی کۆمەڵگایە بێت ! )**

**سەنتەری ئازادی نابێت تاکەکان بن بەڵکو سەنتەرەکە دەبێ کۆمەڵگاکە بێت ئازادی سنوردار دابنێت بۆ تاکەکان ...**

**ئەرستۆ ئەڵی ( کۆمەڵگا وەک بەشی ناوەوەی جەستەی مروڤە ، مرۆڤ دروستیکردووە بەکۆبونەوە و نزیک بوونەوە لەیەکتر لە شانەیەکی رێک و پێکدا )**

**بۆیە کۆمەڵگا مرۆڤە و مرۆڤیش دروستی کردووە گەر مرۆڤەکان باش بن کۆمەڵگاش باش دەبێت گەر خراپبن کۆمەڵگاش خراپ . !**

لەم وتەی ئەرستو و ئەوەی پێشتر بۆماندەردەکەوێت ئازادی و پەیوەندی نێوان تاک و کۆمەڵگا پرسیارێکی محوەری و گرنگ بووە بۆ هەموو فەلسەفە و فکرەکان لە مێژوودا ، واتا سنوری تاک لەچوارچێووەی کۆمەڵگادا هەموو فکرێک سنوری داناوە بۆ تاکەکانی ! ، دەتوانین وەک کارلێکی پێچەوانە وێنای ئازادی نێوان تاک و کۆمەڵگا بکەین پەیوەندیەکە بەدووئاراستەی جیاوازدا دەروات واتا کارلێکیکی پێچەوانە هەیە لەنێوان تاک وکۆمەڵگا چون هەریەک لەتاک و کۆمەڵگا وەک ڕاگرێک وان بۆیەکتر ، بۆیە پاراستنی حەق و ئازادی تاکەکان لایەنی یەکەمی هاوکێشەیەکەیە ، پاراستنی پێکهاتە و شانەکان و یاساکانی کۆمەڵگاکەش لایەنی دیکەیەتی هەرکاتێ لایەنیک لەم دوانە کەوتن ، لایەنیەکەی دیکەیی هاوکێشەکەش راستەوخۆ تێکدەچی !

یان بەوشەیەکی دیکە واتای ئازادی مرۆڤ بەزاندنی سنورەکان ویاساکانی کۆمەڵگا نیە کە پێکهاتەی کۆمەڵگاکە دەپاریزیت ، بەڵکو دان بەهیچ ئازادیەکی تاکەکەسیدا نانرێ گەر بێتو سنورەکانی کۆمەڵگا ببەزێنیت و کۆمەڵگا لێکترازێنێ و لەناوی بات ، وەناشبێت هیچ کۆمەڵگایە ئازادی ڕەها بدات بەدەستی تاکەکانەوە چون دەبێتە هۆی ڕوخانی شیەم و قیەمی کۆمەڵگاکە !

تۆماس هۆبس لەسەر جەنگە نەبراوەکانی مرۆڤ لەسەر ئازادی دەڵی : ( هەموو مرۆڤێک لە شەرێکی ئازادیدایە لەگەڵ مرۆڤێکتر ،جەنگەکە شاراوەیە و ئاشکرا نیە ، هەمووی پێکەوە شەری ماف دەکات ، هەندێک دەسدرێژی دەکەنە سەر مافی هەندێکی تر ، تاکو ئەو دەمەی هێزێکی زاڵ دەرەکەوێ هەموو لەسنورێک دەوەستێنی و ناهێلێت کەس مافی کەس بخوات ! )

ئەو هێزە بریتیە لە دامەزراوەی یاسایی هێزبەدەستە  ئەو هێزەیە هەموو کۆمەڵگا راپێچی کۆمەڵی یاسای رەوشتی و ئەخلاقی دەکات سنور بۆ تاکەکان دیاری دەکا بۆ ئەوەی پێکهاتەی کۆمەڵگاکە لێکهەڵنەوەشێتەوە ! ئێمە خاوەنی هێزە زاڵەین کەبریتیە لە یاساکانی ئیسلام و هەموو کەسێک لەسنورێکدا دەوەستێنیت .

هەر لەو یاسا فەلسەفی سادەوە شوێنی ئازادی تاکەکەسی دەزانین لە چوارچێوەی کۆمەڵگادا کە سنوردارە و هەر دەبێت سنورداریش بێت ! گەر وانەبێت ژیان و مرۆڤایەتی بوونی نابێت ! گەر وابێت ئەوا هەموو ناشرینیەکان دەبنە شتانیکی سادە و ئاسایی و مرۆڤ بە ناشرینی و خراپەکاریەکان رادێت ! وەک چۆن لە ئەوروپا بەهەموو ناشرینیەک ڕاهاتون !

ماویەیەتی .....

# ٢٨ _ بە بەڵگەی زانستی هاوڕەگەزبازی خەیاڵێکی ئەفسانەیی پوچە و پەیوەندی بە بۆماوەیی جینی مرۆڤەوە نییە

**زانستە ساختەکراوەکان بۆ حیزێتی=دوودەکی.**

**بۆچی هاوڕەگەزبازەکان ڕقیان لە ئیسلامە؟!**

**چونکە باش دەزانن حوکمیان چیە لە دینی پاک و پیرۆزی ئیسلامدا ئەگەر حوکم بکات .**

**قال الله تعالى:**

**(فَلَمَّا جَاءَ أَمْرُنَا جَعَلْنَا عَالِيَهَا سَافِلَهَا وَأَمْطَرْنَا عَلَيْهَا حِجَارَةً مِّن سِجِّيلٍ مَّنضُودٍ)هود:٨٢.**

**سەرجەم توێژینەوە زانستییەکانی سەردەم ئەوە دەسەلمێنن کە جینەکان مرۆڤ وا پرۆگرام نەکراوە هاوڕەگەزباز بێت و لە فیترەتەوە مەیلی هاوڕەگەزبازی هەبێت ، ئەوانەی هەندێک بەڵگەی ساختەی بە ناو زانستی لەو بارەیەوە بەڵاو دەکەنەوە گوایە زانست شتی وای گوتووە درۆ دەکەن ، تەنیاو تەنیا ئامانجی بۆگەنیان ئەوەیە کۆمەڵگا فاسدو حیز بکەن و ڕەواج بە نێربازی بدەن...!**

**فەسادی ئەخلاقی و هاوڕەگەزبازی فەرمانێکی جیناتی نییەو هیچ پەیوەندی بە هۆرمۆنات و مێشکەوە نییەو دژی فیترەت و خیلقەتی مرۆڤەکانەو دوای لە دایک بوون و پێگەیشتن مرۆڤەکان خۆیان بە لاڕێدا دەڕۆن و ئەو کارە ئەنجام دەدەن...!**

بە پشتیوانی الله هەوڵ دەدەین بەڵگەی زانستی لە بارەی جینات و جمک و هۆرمۆن و مێشک و ویراسەتەوە بێنینەوەو لە هەموو ڕوویەکەوەو بە درۆیان بخەینەوە.

هەندێک لەو بەناو بەڵگە زانستیانە دێنینەوە کە خەڵکیان پێ چەواشە کردووەو دوای ماوەیەک بە ناو لێکۆڵەرانی بە درۆ خراونەتەوە ، یان خۆیان لە لێکۆڵینەوەکانیان پەشیمان بونەتەوە.....!

لێکۆڵینەوەی جمک

یەکەم هەوڵدان بۆ ئەوەی مەیل و ئارەزۆی هاوڕەگەزبازی پەیوەند بکرێت بە جیناتەوە دوکتۆرێکی نەفسی بو بەناوی:

فرانز جوزيف كالمان Franz Josef Kallmann،

ناوبرا بەناو لێکۆڵینەوەیەکی کرد لەم بارەیەوەو ڕایگەیاند:

ئەگەر یەکێک لە دوو منداڵی جمک مەیلی هاوڕەگەزبازی لە جینەکاندا هەبێت دەبێت ئەویتریان هەمان شێوە بێت ، دواتر ڕایگەیاند کە بەڵێ ئەو شتە هەیەو ڕاستە.....! [1].

بەڵام زۆری نەخایەند ئەم ساختەو تەزویرو درۆیە دەرکەوت و دەستبەجێ فەیلەسوف و ئوستازی قانونی و توێژەری پزشکی نەفسی بە ناوی:

إدوارد شتاين Edward Stein

بە درۆی خستەوەو ووتی هیچ بەڵگەیەک نییە لە سەر ئەوەی کە جیناتی دوو منداڵی جمک وەک یەک بن. [2].

**دواتر لێکۆڵینەوەیتر کراو هەندێک بەڵگەی تری ساختەو درۆیان بەڵاو کردەوە بۆ چەواشەکردن ، بەڵام لە نوێترین لێکۆڵینەوەدا سەلمێندرا کە هیچ پەیوەندییەک نییە لە نێوان جینەکانی مرۆڤ و بوونی مەیلی هاوڕەگەزبازی ، وەک لێکۆڵینەوەی دوکتۆر : نیل وایتهید Neil Whitehead**

**ناوبراو زۆر نووسینی لەو بارەیەوە بەڵاو کردەوە وەک:**

**The Journal of Human Sexuality**

**ئەو دەڵێت:**

**"Because of the calculated low genetic fraction, we are safe in saying that people are predominantly not "born that way"" [3].**

**واتە: بە هۆی حیسابی کەمی جیناتی خەڵک لە بنەڕەتدا بە هاوڕەگەزباز لە دایک نابێت.**

**کەواتە ئەوە درۆیە جیناتی مرۆڤ وا سیستماتیک کراوە...**

**زانای ئامارگیری زیستی و پەتا = (ئاهۆ، درم، ئێپێدێمی) بە ناوی:**

**لورنس ماير Lawrence Mayer**

**و زانای دروونناسی بەناوی:**

**بول ماكهوغPaul McHugh**

**لە لێکۆڵینەوەیەکی گشتییدا هەڵسان بە لێکۆڵینەوە لە بارەی هاوڕەگەزبازییەوە لە ساڵی 2016 دا:**

**“Summarizing the studies of twins, we can say that there is no reliable scientific evidence that sexual orientation is determined by a person’s genes” [4].**

**له میانەی لێکۆڵینەوەکان لە سەر منداڵی لفانە=جمک دەتوانین بڵێن: هیچ بەڵگەیەکی زانستی باوەڕپێکراو نییە بڵێت جینات ئارەزۆی جنسی لە تاکەکاندا دروست دەکەن.**

**هەروەها لە لێکۆڵینەوەکەد هاتووە:**

**“The understanding of sexual orientation as an innate, biologically fixed property of human beings—the idea that people are “born that way”—is not supported by scientific evidence.” [4]**

**ئەو تێگەیشتنە کە گوایە لە بنچینەدا هاوڕەگەزبازی فەرمانێکی فیترییەو بیۆلۆجی مرۆڤ وا دروستکراوەو وا لە دایک بووە ، هیچ بەڵگەیەکی زانستی لە سەر نییە.**

**زانستی ژنتێکی= پشتاوپشتیی=میراتی:**

**یەکەم هەوڵدان لەم بارەیەوە زانای ژنتیکی بو بە ناوی:**

**ئەم کابرایە ووتی: لەوانەیە نیشانەیەک Dean Hamerدین هامر کە Xو کرۆمۆسۆمی Xq28هەبێت لە نێوان جیناتی دەکاتە:(الشذوذ الجنسي)[4]،**

بەڵام ناوبراو نەیگووت نیشانەی ئەو جیناتە هۆکاری هاوڕەگەزبازییە ، بەڵکو ووتی: تەنیا ئیحتیمالی هەیە.

دوای ئەو لێکۆڵینەوەی: (دین هامر)ە

و تاقم و هاوکارو هاوڕێکانی George Riceدوکتۆر جورج رایس هەمان لێکۆڵینەوەیان کرد ، بەڵام توێژینەوەیەگی گەورەترو وردتر ، دوای کۆتا لێکۆڵینەوە ڕایانگەیاند:

**“It is unclear why our results are so discrepant from Hamer’s original study. Because our study was larger than that of Hamer et al., we certainly had adequate power to detect a genetic effect as large as was reported in that study. Nonetheless, our data do not support the presence of a gene of large effect influencing sexual orientation at position Xq28.” [4]**

واتە: ڕوون نییە بۆچی لێکۆڵینەوەو دەرنجامەکانی ئێمە بە تەواوی جیاوازە لە لێکۆڵینەوەکانی دوکتۆر هامر ، لێکۆڵینەوەکانی ئێمە فەراوانترو بووە لە لێکۆڵینەوەکانی دوکتۆر ماهر ، بێگومان توانای تەواومان هەیە بۆ دۆزینەوەی کاریگەری جینات ، کە گرنگتر بێت لەو لێکۆڵینەوەیە دوکتۆر ماهر ڕایگەیاند ، لە گەڵ ئەوەشدا ڕوونکردنەوەو لێکۆڵینەوەکانمان پشتیوانی لەوە ناکەن کە جینەکان کارگەریان هەبێت لە سەر ئارەزۆی هاوڕەگەزبازی و جینی Xq28.

(کەواتە جینەکانی مرۆڤ بە شێوەیە پرۆگرام نەکراون مرۆڤ هەوڕەگەزباز بێت ، یان هەر لە فیترەتەوە حەزی هاوڕەگەزبازی هەبێت)

**گەورەترین هەوڵدان بۆ زانین و زانیاری لەم بارەیەوە بۆ دیاریردنی ئەو جیناتانەی کە پەیوەندی هەیە بە هاوڕەگەزبازییەوە لە لایەن ئەنجوومەنی ئەمریکا بۆ عیلمی وەراسی ئەنجامدرا**

**(الجمعية الأمريكية لعلم الوراثة البشرية)بو**

**the American Society of Human Genetics**

**ئەم پشکنینە بۆ زیاتر لە**

**000/23 هەزار کەس ئەنجامدرا ،دواتر ئەنجامی لێکۆڵینەوەکە بەم شێوەی خوارەوە بو:**

**“We did not find evidence of an association between sexual identity and SNPs on the X chromosome in men, women or the samples combined at genome-wide significance.!” [5]**

**واتە: ئێمە هیچ بەڵگەیەکمان دەست نەکەوتووە کە کۆکەرەوە بێت لە نێوان هەوییەتی جنسی و چەند شکڵێکی( النوكليوتيدات تەنیا – لە نێوان پیاوان و ژناندا..... Xلە سەر کرۆمۆسۆم – SNPs**

**ئەو لێکۆڵینەوەیە لە ساڵی 2012 بووە.**

**بەڵام لە ساڵی 2015 هەمان جەمعییەی لێکۆڵینەوە لە زانکۆی کالیفۆرنیا ئەمەی ڕاگەیاند ، هەروەک ڕۆژنامەی تیلگراف ڕوونکردنەوەی دا:**

**“Homosexuality ‘may be triggered by environment after birth’” [6].**

واتە: هاوڕەگەزبازی دەتوانێت دروستبێت لە ژینگەیەک دوای لە دایک بوون.

(مەبەستی ئەوەیە مرۆڤ هاوڕەگەزبازی لە سکی دایکیدا جیناتەکانی بەو شێوەیە سیستماتیک نەکراوە هاوڕەگەزباز بێت)

سەرۆکی Paul McHugh لە ساڵی 2010، دکتور بول ماکهوغ بەشی پزشکی دەروونی لە نەخۆشخانەی جونز هوبکنز Johns Hopkins دا ناوبراو کەسێک بو کە بۆ ماوەی 40 ساڵ گرنگی بە لێکۆڵینەوەی هاوڕەگەزبازیدا ، کەسێکی تەجروبەدارو پسپۆڕ بو ، لە بارەی هاوڕەگەزبازییەوە پرسیاری لێکرا:

ناوبراو ڕاستەوخۆ بەم شێوەیە وڵامی دایەوە:

**“Well, as I have said, there is no gay gene. And there are factors more influential than biology. The best data, of course, [comes from the Framingham Study].” [7]**

واتە: باشە ، وەک پێشتر گوتوومە جیناتی هاوڕەگەزبازی بوونی نییە ، هەندێک هۆکاری کاریگەرتر هەیە لە زانستی جیولۆجیادا. زانیاری زیاتر لەم بارەیەوە لە ( لێکۆڵینەوەی فرامنگهام)دێت

دیسان ئەوەشمان لە بیر نەچێت ئەوەی کۆمەڵەی پزشکی دەروونی ئەمریکا بەڵاوی کردەوەو شاهیدی لە سەر ئەم لاپەڕانە دەدات و ئەوانەش کە بانگەشەی هاوڕەگەزبازی دەکەن:

هاوڕەگەزبازی:

“Although much research has examined the possible genetic, hormonal, developmental, social and cultural influences on sexual orientation, no findings have emerged that permit scientists to conclude that sexual orientation is determined by any particular factor or factors” [8]

واتە: هەرچەند زۆرێک لە لێکۆڵینەوەکان لە بارەی کاریگەری ژنتیکی ، هورمونی ، گەشەکردن ، کۆمەڵایەتی و فەرهەنگی لە بارەی ئاراستەکردنی جنسی مەترەح بووە ،هیچ دۆزینەوەو توێژینەوەیەک بۆ زاناکان دەست نەکەوتووە کە بڵێت بوون و ئاراستەکردنی هاوڕەگەزبازی بە هۆی هۆکارێکی تایبەتە کۆمەڵە هۆکارێکە ، (هێشتا هۆکارەکانی دیاری نەکراوە)

کەواتە ئەو هەموو درۆو دەلەسەیە بە ناوی زانستەوە بەڵاودەکرێتەوە هەمووی درۆیەو ئەوەی هاوڕەگەزباز تەنیا خۆی حەزی لێدەکات و هیچ پەیوەندی بە جیناتەوە نییەو جینات بەو شێوەیە پرۆگرام نەکراوە کە مرۆڤ بە دەستی خۆی نەبێت و حەزی لە نێربازی و مێبازی بێت....

تەنانەت تازەترین لێکۆڵینەوەکان کە ئەم زانایە کردی بە ناوی: آلن ساندرزAlan R. Sanders لە بارەی جینی Xq28دیاریکراو=ئاماژەپێکراو ،

دوکتۆر : لورنس وماکهوغ لەو بارەیەوە لێکۆڵینەوەی کردووەو دەڵێت:

**“Since the effect was small, however, the genetic marker would not be a good predictor of sexual orientation.” [4]**

**واته: بەڵام لەوێدا کاریگەری کەمتر بووە ، ماددەی سەرەکی جینات ئاماژە بەوە ناکات کە مەیل و ئارەزۆی جنسی هەیە.**

**ئەگەر وا دابنێین ئەو جینەش هەیە ، لەوکاتەشدا کاریگەرییەکە زۆر لاواز دەبێت لە بەردەم پەروەردەو ئەو هۆکارە ژینگەیانە کە پەیوەندی هەیە بە هاوڕەگەزبازییەوە**

**زانای Neil Whitehead لەم بارەیەوە دوکتۆر نیل وایتهید زانستی**

**الإحياء والإحصاء دەڵێت:**

**“At best genetics is a minor factor(9)**

**واتە: جیناتەکان تەنیا کاریگەی ناسەرەتایی، دەستی دوو، لە خوار گرینگترین خاڵەوەیان هەیە**

**“في أحسن الحالات الجينات مجرد تأثير ثانوي”**

**لە هەمان لێکۆڵینەوەدا کە ئەنجامی داوە دەڵێت:**

**“The effects of genes on behaviors are very indirect because genes make proteins, not preferences” [3]**

واتە: کاریگەری جیناتەکان لە سەر ڕەفتارو هەڵسوکەوتەکان ڕاستەوخۆ نیە ، لە بەر ئەوە جیناتەکان پرۆتینات دروست دەکەن نەک خیارات(واتە جیناتەکان ناتوانن هەڵبژاردن و فەرمانکردن و تەحەکوم بکەن بە سەر مرۆڤدا)

الهرمونات=هۆرمۆنی توخمیی جنسی:

Amyهۆرمۆنات لە خۆلاسەی توێژینەوەیەکی دوکتۆرە آمي بانکس بەم شێوەیە  Nanette Gartrellو نانیت غارترل  Banks هاتووە:

“Studies of men and women who experienced prenatal defects in hormone metabolism have not found a concurrent increase in homosexual behavior. Overall, the data do not support a causal connection between hormones and human sexual orientation” [10]

واتە: ئەو لێکۆڵینەوەیانە لەم بارەیەوە کراوە لە سەر پیاوان و ژنان ، ئەوانەی کەم و کوڕی بەر لە  منداڵبوونیان هەیە لە هۆرمۆنی: الاستقلاب –الأیض =متابولیسم= مێتابولیزم ، بە گشتی هیچ پەیوەندییەک نییە لە نێوان جیناتەکان و ئارەزۆی هاوڕەگەزبازیدا.

(بە کورتی دەڵێت: ئەوەی دەڵێت جینەکانی مرۆڤ بەو شێوەیە دروستکراوە هاوڕەگەزباز بێت ، درۆیەو ڕاست نییە)

هۆرمۆنی: الاستقلاب –الأیض =متابولیسم= مێتابولیزم ، واتە:

هەڵسوڕاندنی ماددە   (مێتابولیزم، وەرگرتن، سووتاندن و سەفکردنی ماددە لەلایەن ئۆرگانیزمەوە)

الدماغ:مێشک

لێکۆڵینەوەیەکی زۆر لە بارەی جیاوازی  عەسەبی هاوڕەگەزبازو خەڵکی ئاساییدا کراوە  ، یەکەم لێکۆڵینەوە لەم بارەیەوە زانای تایبەت بو ، ئەمەش لە ساڵی  Simon Levayبە(الأعصاب) سایمون لیفاي 1991، دا ، ناوبراو ووتی:

لە نێوان مێشکی هاوڕەگەزبازو خەڵکی ئاساییدا جیاوازی  هەیە ، بە تایبەت جیاوازی ئەندازە لە یەک کۆمەڵە سلولێکی تایبەت لە هەستەی بینینی پێشەوەی  هیپوتالاموس

(INAH3) [11]

وەک هەمیشە ئەم هەواڵە درۆیە بەڵاو کرایەوەو ڕۆژنامەو کەناڵەکان باسیانکرد ، تەنانەت تاکو ئێستاش ئەو کەس و لایەنانە وا هەواڵی ساختەو درۆ لەو بارەیەوە بەڵاو دەکەنەوە بە کاری دەبەن و ئێستاش خەڵکانێکی نەزان وەک مولحیدەکان  ئەو سەرچاوە درۆو ساختەیە بە کار دەبەن ، بەڵام نازانن بە درۆخراوەتەوە ، یان دەزانن و خۆیان و هاوپۆلەکانیان دەگەمژێنن...!!

ئێمە لە بارەی لێکۆڵینەوەکەی: سایمۆن لیفای تەنیا ئەم بەڵگەیە دێننەوە کە خۆی لە لێکۆڵینەوەیەکیتردا دوای چەند ساڵێک ڕایگەیاند ، لە ساڵی:  1994

**“It’s important to stress what I didn’t find. I did not prove that homosexuality is genetic, or find a genetic cause for being gay. I didn’t show that gay men are born that way, the most common mistake people make in interpreting my work.**

**Nor did I locate a gay center in the brain. …Since I looked at adult brains, we don’t know if the differences I found were there at birth, or if they appeared later.” [12]**

**واته: گرنگ ئەوەیە ئەوەی من پێی نەگەیشتووم و دەستم نەکەوتووە بیخەمەڕوو پێتان بڵێم: نەسەلمێنراوە کە هاوڕەگەزبازی شتێکی جیناتییە ، تاکو ئێستا هیچ بەڵگەیەکم دەستنەکەوتووە ، من نەمگوتووە هاوڕەگەزبازەکان بەو شێوەیە سیستماتیک کراون و لە دایک بوون .**

**ناوبراو دەڵێت:**

**ئەوە هەڵەیەکی گەورەیە کە پێشتر زۆربەی خەڵک لە بارەی کارو بۆچوونەکانی من تەفسیریان دەکرد ، من مەڵبەندێکی هاوڕەگەزبازیم لە مێشکدا نەبینیوەتەوە ، لەوکاتەوەی من لێکۆڵینەوە لە سەر مێشکی گەورەکان دەکەم نازانین ئەو جیاوازیانە هی سەردەمی لە دایک بوونە یان دواتر پەیدا بووە....**

**(بە کورتی دەڵێت: مرۆڤ بەو شێوەیە دروست نەکراوە کە مەیلی هاوڕەگەزبازی لە جینەکانیدا هەبێت ، ئەو دەڵێت ئەگەر پێشتر شتێکم لەو بارەیەوە گوتووە ئێستا غەڵەتم کردووەو لێی پاشگەزم)**

**با ئەوەش لە بیر نەکەین گیروگرفت و کێشەو ڕخنەیەکی زۆر لە لێکۆڵینەوە پێشووەکەی (سایمۆن لیفای) کەوتەوەو خەڵکانێکی زۆر لە سەر بۆچوونەکەی ئەو تووشی نەخۆشی ئایدز بوون.**

**کێشەکەی سایمۆن هێشتا کۆتایی پێنەهاتووەو لە ساڵی 1997 مارك بریدلوفMarc Breedlove**

زانای: النفس والأعصاب لە زانکۆی لە دایکبوونی: میتشغان توێژینەوەیەی دژی بۆچوونەکەی سایمۆن لیفاي بەڵاوکردەوە:

**“These findings give us proof for what we theoretically know to be the case-that sexual experience can alter the structure of the brain, just as genes can alter it.” [13]**

واتە: ئەم دەرئەنجامانە دڵنیامان دەکات ئەوەی ئێمە بە تیئۆری دەیزانین لە بارەی ئەزموونی جنسییەوەو چۆن ئیمانی هەیە بتوانن بونیان و بنچینەی مێشک بگۆڕن ، هەر چۆن جینەکان دەگۆڕن

دوبارە لە ساڵی2002 پسپۆڕێکی تایبەتی زانستی دەروونی بە ناوی: لێکۆڵینەوەیەکی بەڵاو کردەوە ، Mitchell Lascoمیتشیل لاسکو لە بارەی چینی پێشەوەی مێشک و دەڵێت:

**“In summary, in contrast with Allen and Gorski, we failed to detect any variation in the size of the AC with either sex or sexual orientation.” [14]**

بە کورتی و بە پێچەوانەی 'آلن' و'غورسکي'، فەشەلمان هێنا لە دەستکەوتنی هەر گۆڕانکارییەک لە قەبارەی چینی پێشەوەی مێشک ، ئیتر هامڕا بێت بۆ جنس یان بۆ مەیل کردنی هاوڕەگەزبازی.

بەڵکو تەنانەت مێشک خۆی بە هۆی هۆکاری زۆری تەجروبەی ژیانەوە دەتوانێت بنجینەی خۆی بگۆڕێت....وە زۆر هۆکاریتر کە

له Norman Doidgeزانای دەروونناس بە ناوی: نورمان دویدج کتێبەکەیدا دیاریکردووە:

ئەو مێشکەی خۆی دەگۆڕێت

الدماغ الذي يغير نفسه

The Brain that Changes Itself [15]

کەواتە بە بەڵگە سەلماندمان فەسادی ئەخلاقی و هاوڕەگەزبازی فەرمانێکی جیناتی نییەو هیچ پەیووەندنی بە هۆرمۆنات و مێشکەوە نییەو دژی فیترەت و خیلقەتی مرۆڤەکانەو دوای لە دایک بوون و پێگەیشتن مرۆڤەکان خۆیان بە لاڕێدا دەڕۆن.....لەم بارەیەوە لێکۆڵینەوەی زانستی لە زۆرێک لە سایتە زنستییەکان کراو لە زانکۆی: کامبردج بە ناوی:

“CHILDREN OF HOMOSEXUALS AND TRANSSEXUALS MORE APT TO BE HOMOSEXUAL” [16]

واتە: منداڵی هاوڕەگەزبازەکان زیاتر دەبنە هاوڕەگەزباز

سەرچاوەکان:

[1] : Franz J. Kallmann, “Comparative Twin Study on the Genetic Aspects of Male Homosexuality”, Journal of Nervous and Mental Disease 115, no. 4 (1952): 283–298.

[2] : Edward Stein, The Mismeasure of Desire: The Science, Theory, and Ethics of Sexual Orientation (New York: Oxford University Press, 1999), 145.

[3] : Neil E. Whitehead, “Neither Genes nor Choice: Same-Sex Attraction Is Mostly a Unique Reaction to Environmental Factors” & Neil E. Whitehead, “Sociological Studies Show Social Factors Produce Adult Same-Sex Attraction“.

[4] : The New Atlantis: “Sexuality and Gender, Findings from the Biological, Psychological, and Social Sciences“. By Lawrence S. Mayer & Paul R. McHugh.

[5] : E.M. Drabant et al., “Genome-Wide Association Study of Sexual Orientation in a Large, Web-based Cohort”, 23andMe, Inc., Mountain View, Calif. (2012).

[6] : “Homosexuality ‘may be triggered by environment after birth’“, The telegraph.

[10] : Banks A, Gartrell N, “Hormones and Sexual Orientation: A Questionable Link“.

## بەشی: دووەم

جیناتەکانم وای لێکردووم هاورەگەزبازبم.. ! ، بەهاورەگەز بازی لەدایک بووم.. ! تەنانەت هەندێک ئاژەڵەکانیش هاورەگەزبازی دەکەن... ! ،دەی مادەم وایە ئاسایە ئێمەش بکەین.. ! بەشێک لە هاورەگەز بازەکان ئەم قسانە دەکەنە پاساو بۆئەوەی بڵێن هیچ چارە نیە و هیچ ڕێگایە نیە جگە هاورەگەزبازی... ! بەتێپەرینی کات ئەم قسانە بوون بە باوەڕێکی چەسپیوو زۆرێک باوەریان پێیان کردووە تەنانەت ئەو کەسانەی بەوشێوەش نین! ..

حەزی هاورەگەزبازی تەنها جیناتێ نیە لە پێکهاتەی ترشەڵۆکی ناوکی ەوە لەدایک دەبێت ناتوانرێت DNAمرۆڤ بە ، DNAمرۆڤدا لاببرێ یان بگۆڕێت بەهۆی ئەو ئازارەی کە توشی ئەبێت لەئەنجامی گۆرینەکەوە ، بۆیە هەندێ سپی و هەندێک بەرەشی لەدایک ئەبێت وە هەندێ تریش لەدایک ئەبێ بە مێی یان نێری یان هاورەگەزباز... ! وە هیچ شتێکی بۆنیە جگە رازی بوونی بەو جیناتەی تێیدایەتی ... کەواتا دەبێت ڕاستی ئەمانە چیبێت .....؟؟ !!!!

ساڵی 2005 تیمیکی لێکۆلینەوە لەزانکۆی کالیفۆرنیا کۆمەڵی هێمای سەروی جیناتیان ئاشکرا کرد کەدەورێکی راستەوخۆی هەیە لە حەزی هەواڵەکەیان بە گەرم و "natureهاورەگەزبازی... ، ڕۆژنامەی " گوری بڵاوکردەوە وەک بڵێیت زێریان دۆزیەتەوە بەدوای خۆیشیدا چەن ڕۆژنامەیە بەناوبانگ هەواڵەکەی بڵاوکردەوە، بەڵام زۆرێک لە لێکۆلەران گومانیان دروست کرد لە دەرەنجامی لێکۆڵینیەوەکە لەو کەسانەش وەک نوسەری بەریتانی "ئێد یۆنگ" کە هەندێک هەڵەی لێکۆلینەوەکەی ئاشکرا کرد و وتی :

( گروپی لێکۆلینەوەکە لە کۆمەڵی سێرچ و لێکۆلینەوە دوورخراونەتەوە کە دەبوو بیانکردایە و لەجیاتی ئەوانە کۆمەڵی

لێکۆڵینەوەی تریان بۆیان هەڵبژردووە بۆئەوەی بگونجێ لەگەڵ مەیلەکانی خۆیان واتا لەگەڵ حەز و مەیلی سەرۆکی تیمی لێکۆلینەوەکە بگونجێ ... ! دوای تەواو بوونی لێکۆلینەوەکان زانای بواری جینات "جۆن گێرلی" رەخنەی لە لێکۆلینەوەکە گرت دوای رەخنکە "سەرۆکی تیمەکە" دانی نا بە ناراستی لێکۆڵینەوەکەدا نا و دانی نا بەوەی لێکۆلینەوەکە نازانستیە و نارێژەیە .... !!

پرسیارێکی بنەرەتی تر بابکەین دەتوانین ئێمە رۆژێک لەرۆژان بگەینە جیناتێکی دیاریکراو بیسەلمێنێ کە هاورەگەز بازی دروشمێکی مرۆڤدا ..؟ وە ئایا دەتوانین بگەین DNAئەخلاقی و جیناتی لە بەوەی مرۆڤ توانای وەستاندنی نیە لەئاستیدا و ناچاری رازی بوونە پێی چون توانای کۆنترۆڵکردنی جیناتی نیە ...؟!!

دەبێ سەرەتا جیاوازی بکەین لەنێوان (جیناتی بۆماوەیی × رەوشتی کرداری )بەڵام بۆئەوەی بزانین لەسەر جینات و کاریگەری نزیک مەودای ئەوا مامۆستای لێکۆلینەوەی خێزانی لەزانکۆی نێبراسکا "دۆگلاس ئەبۆت" وڵامەداتەوە و ئەڵی:( شتێک نیە بەناوی جینی هاورەگەز بازی چون گەران بۆ جیناتی هاورەگەزبازی ئاڵۆزیەکی زۆری تێدایە ئەویش ئەوەیە جیناتەی بەرپرسی رەوشتی مرۆڤ خۆی تەنها دیاریکەری رەوشت و ئەخلاقی مرۆڤ نیە وەک ئەو جینە تایبەتانە نیە کە دەبێتە هۆی نەخۆشیەکی ئەندامەکانی جەستە ، واتا جینات هەیە راستەوخۆ دەبێتە هۆی نەخۆشی بەڵام جینات نیە راستەوخۆ مرۆڤ بکات نێرباز یان هاورەگەزباز )

دۆگلاس ئەبوت دەڵێت :(زۆرێک لەخەلکی وایدەبینن تەنیا جیناتەکانی DNA ی مرۆڤ دەبێتە هۆی دروست بوونی ئەخلاق و رەوشت بەڵام بەوشێوە نیە زۆرجار رەوشتێک و کردارێک دروستەبێت بەهۆی جینات لەگەڵ هۆکار و عاملی ژینگە و سروشت لەگەڵ ئازادای ئارەزووی مرۆڤ ئەمانە پێکەوە دروستیکەن نەک جینات تەنها ...

دەبێتە هۆی  xکاتێ سەردێری ڕۆژنامەکان ئەخوێنینەوە دەڵێ جینی ئەمە زیادەرۆیەکی زۆرە کراوە کە خەڵکی سادە باوەری   Yکرداری پێدەکات چون جیناتەکان راستەوخۆ نابێتە هۆی رەوشت و کردار بەڵکو جینات کۆدەکان دروستەکات  بۆ پرۆتینەکان لەرێگای زنجیرەیەک چالاکی درێژی کیمۆ زیندەیەوە  لەکۆتایی ئەم چالاکیە جینەکە کەمێ کاریگەری دەکاتە سەر رەوشت و ئەخلاق  بەڵام بازدان و دروسبوونی ەوە مرۆڤەکەوە شتێکی تێکەڵ و ئاڵۆز DNAئەخلاقێک بەهۆی جینی و ناڕاستە )

هەرئەمەش گەشتووە پێی تازەترین لێکۆڵینەوەکان لەبواری سەلماندنی جیناتی هاورەگەزبازی ئەمەش لێکۆڵینەوەیەکە کە بەسەرۆکایەتی "ئاندرێ جانا" کراوە دەرەنجامەکانی ساڵی 2017 بڵاوکراوە لە گۆڤاری "ساینس" بەناوبانگ بۆ گەرانە زانستیەکان ، "جانا" پشتی بەستووە لە لێکۆڵینەوەکەیدا بەفەحسی جینۆمی  473000 مرۆڤ لەئەمریکا وبریتانیا و سووید لەکۆتایدا گەشت بەوەی جینی هاورەگەزبازی بوونی نیە وە جیناتی هاورەگەز بازی وەک هەموو سیما ئەخلاقیەکانی تر وایە کۆمەڵی عاملی ژینگە دروستی ئەکا ، ئەو جینەی کاریگەرە لەم عامل وهۆرکارانەدا کاریگەریەکەی 8% تاکو 25% بۆدروستبوونی هاورەگەزبازی  ، رێژەی پاڵنانی کەسەکە بۆ هاوڕەگەزبازی بەهۆی جیناتەکەوە  زۆر زۆر کەمە بەڵام بەشە زۆر گەورەکە ژینگەی چواردەور و بارودۆخە کۆمەڵایەتیانەیە کە مرۆڤی لێووە دروستەبیت یان  تێیدا دەژی...!

دکتۆڕەکان دەڵێن زۆرینە نەخۆشیە ئەندامیەکان و نەخۆشیە ئەخلاقی و رەوشتیەکانی مرۆڤ پێکهێنەریکی جیناتی هەیە بەڵام  بوونی ئەو جینە مانای وانیە  مرۆڤەکە توشی کۆمەڵێ کار و کردەوە و رەوشت بکات کە نەتوانێ نەیکات و کۆنترۆڵی خۆی نەکات ، جین لەوانەیە ئەو مرۆڤە

توشی سەرەتانی سیەکان یان شەکرە یان  ئاڵودەی کحولی ئەکات بەڵام ئەوە مانای وانیە ئیتر دەبێ ئاڵودەی کحول بیت... !!

"دێڤد شێنک " باس لەکاریگەری ژینگە و سروشت دەکات دەڵی هۆکاری گەورەیە بۆ دروست بوونی رەوشت و ئەخلاقی مرۆڤ وە ژینگە لەسەرووی جیناتەوەیە دەڵێ ( سەرەرای جیناتەکان کە نەخشەیەکی کامڵ و تەواون ، جینات وەک دوگمەکان و دوگمەی کۆنترۆڵکردن لە ستۆدیۆی دەنگ تۆمارکردن وایە ، ئێمە بەشێوەیەکی راستەوخۆ سیفاتەکانمان لە جینەوە وەرناگرین بەڵکو ئیمە پەرەسەندن بە سیفاتەکانمان دەکەین بەڕێگای چالاکی دینامێکی بۆئەوەی کارلێکێک دروست بکەین لەنێوان جینەکە و ژینگەی چواردەوری )

لەپەیوەندی نیوان جیناتەکان و ژینگە ...  جیاوازیە جیناتیەکان گرنگە ، بەڵام تەنها جینات خۆی بەس نیە بۆ ئەوەی بزانین کە ئێمە کێین .. ! وە ئەمەش وامان لێکا بلێین بار و دۆخە کۆمەڵایەتیەکان زۆر کاریگەرە بۆ رۆشتن بەئاراستەی هاورەگەزبازی زیاتر لە جینات ... !!

خێزان دەورێکی گەورەی هەیە لەمەدا ، هەنێ لێکۆلینەوەکان ئەلین نەبوونی یەکی لەدایک یان باوک دەبێتە هوکاری بۆ چوون بەرەو هاورەگەزبازی یان دەڵی تەنیا 20% ئەوانەی هاورەگەز بازن لەگەڵ خێزانەکانیان دەژین .. !! لێکۆلینەوەیکی تریش باس لە دەوری باوک دەکات لەرێخستەوەی حەزە جنسیەکانی مناڵەکانی نزیک 84% هاورگەز بازە نێرەکان دانیان بەوەناوە باوکیان گرنگی پێنەداون و پەروەردەی نەکردوون لەمنداڵیدا  ، واتا تورەیی باوک پەیوەندی هەیە بە هاورەگەزبازی نێرینەوە !  چون نێرانیتە زۆر بە ئاشکراتر بانگبێژی بۆ نێربازی و مناڵبازی دەکەن بەراورد بە مێیەکان... !

هەروەک هاتووە لەچەن لێکۆلینەوەیەکی یەک بەدواییەک لەسەر گرنگی جنس لەلای هەردوو رەگەز لەساڵی 2016 دا دەڵی: (لەتەنیشت خێزان هاورێ زۆر دەورێکی گرنگی هەیە بەتایبەتی گەر بێتو کەسەکە لەمنداڵیدا دەستدرێژی سێکسی کرابێتە سەری ، بەڵام قبوڵکردنی کۆمەڵگا بۆ هاورگەز بازی و بانگردنی خەڵک بۆی و ناساندنی بەوەی قەدەریکی حەتمی هەنێ مرۆڤە لە دەزگاکانی راگەیاندن ئەمە گەورەترین دەوری هەیە لە ئاسایی کردنەوەی هاورگەزبازی لای کۆمەڵگا بەرادەیەک کە مامۆستای زانستی کۆمەڵناسی ئانی پارتر کاتی شوێنی هەموو لێکۆڵینەوەکان کەوت لەساڵی 1988کە خەملاندنی بۆ رێژەی هاورەگەز بازی کردبوو لە ئەمریکا بۆی دەرکەوت رێژەکە ئاسای بووە واتا تاساڵی1992 رێژەکە زۆر کەم بووە بەڵام دوای ساڵی 1992 وە بەردەوام دووهێندە دەبێت ئەو ساڵەش ئەوەبوو بانگەشەی راگەیاندن بۆ هاورەگەزبازی دەستی پێکرد..... !!!!!!

جیناتەکانم وای لێکردووم هاورەگەزبازبم.. ! ، بەهاورەگەز بازی لەدایک بووم.. ! تەنانەت هەندێک ئاژەڵەکانیش هاورەگەزبازی دەکەن... ! ،دەی مادەم وایە ئاسایە ئێمەش وابکەین.. !

بەشێک لە هاورەگەز بازەکان ئەم قسانە دەکەنە پاساو بۆئەوەی بڵێن هیچ چارە نیە و هیچ رێگایە نیە جگە هاورەگەزبازی... ! بەتێپەرینی کات ئەم قسانە بوون بە باوەرێکی چەسپیوو زۆرێک باوەریان پێیان کردووە تەنانەت ئەو کەسانەی بەوشێوەش نین! ..

حەزی هاورەگەزبازی تەنها جیناتێ نیە لە پێکهاتەی ترشەلۆکی ناوکی ەوە لەدایک دەبێت ناتوانرێت DNAمرۆڤ بە ، DNAمرۆڤدا لاببرێ یان بگۆرێت بەهۆی ئەو ئازارەی کە توشی ئەبێت لەئەنجامی گۆرینەکەوە ، بۆیە هەندێ سپی و هەندێک بەرەشی لەدایک ئەبێت وە هەندێ تریش لەدایک ئەبێ بە مێی یان نێری یان هاورەگەزباز... ! وە

هیچ شتێکی  بۆنیە جگە رازی بوونی بەو جیناتەی تێیدایەتی ... کەواتا دەبێت ڕاستی ئەمانە چیبێت...؟!!

دروستکردنی لێکۆڵینەوەکان

ساڵی 2005 تیمیکی لێکۆلینەوە لەزانکۆی کالیفۆرنیا کۆمەڵی هێمای سەروی جیناتیان ئاشکرا کرد کەدەورێکی راستەوخۆی هەیە لە حەزی هەواڵەکەیان بە گەرم و  "natureهاورەگەزبازی... ، ڕۆژنامەی " گوری بڵاوکردەوە وەک بڵێیت زێریان دۆزیەتەوە بەدوای خۆیشیدا چەن ڕۆژنامەیە بەناوبانگ هەواڵەکەی بڵاوکردەوە، بەڵام زۆرێک لە لێکۆلەران گومانیان دروست کرد لە دەرەنجامی لێکۆڵینیەوەکە لەو کەسانەش وەک نوسەری بەریتانی "ئێد یۆنگ" کە هەندێک هەڵەی لێکۆلینەوەکەی ئاشکرا کرد و وتی :

( گروپی لێکۆلینەوەکە لە کۆمەڵی سێرچ و لێکۆلینەوە دوورخراونەتەوە کە دەبوو بیانکردایە و لەجیاتی ئەوانە کۆمەڵی لێکۆڵینەوەی تریان بۆیان هەڵبژردووە بۆئەوەی بگونجێ لەگەڵ مەیلەکاننی خۆیان واتا لەگەڵ حەز و مەیلی سەڕۆکی تیمی لێکۆلینەوەکە بگونجێ ... ! دوای تەواو بوونی لێکۆلینەوەکان زانای بواری جینات "جۆن گێرلی" رەخنەی لە لێکۆلینەوەکە گرت دوای رەخنکە "سەرۆکی تیمەکە" دانی نا بە ناراستی لێکۆڵینەوەکەدا نا و دانی نا بەوەی لێکۆلینەوەکە نازانستیە و نارێژەیە .... !!

قورسی لێکۆلینەوەکان

پرسیارێکی بنەرەتی تر بابکەین دەتوانین ئێمە ڕۆژێک لەڕۆژان بگەینە جیناتێکی دیاریکراو بیسەلمێنێ کە هاورەگەز بازی دروشمێکی مرۆڤدا ..؟ وە ئایا دەتوانین بگەین  DNAئەخلاقی و جیناتی لە

بەوەی مرۆڤ توانای وەستاندنی نیە لەئاستیدا و ناچاری ڕازی بوونە پێی چون توانای کۆنترۆڵکردنی جیناتی نیە ...؟!!

دەبێ سەرەتا جیاوازی بکەین لەنێوان (جیناتی بۆماوەیی × رەوشتی کرداری )بەڵام بۆئەوەی بزانین لەسەر جینات و کاریگەری نزیک مەودای ئەوا مامۆستای لێکۆلینەوەی خێزانی لەزانکۆی نێبراسکا "دۆگڵاس ئەبۆت" وڵامەداتەوە و ئەڵی:( شتێک نیە بەناوی جینی هاورەگەز بازی چون گەران بۆ جیناتی هاورەگەزبازی ئاڵۆزیەکی زۆری تێدایە ئەویش ئەوەیە جیناتەی بەرپرسی ڕەوشتی مرۆڤ خۆی تەنها دیاریکەری رەوشت و ئەخلاقی مرۆڤ نیە وەک ئەو جینە تایبەتانە نیە کە دەبێتە هۆی نەخۆشیەکی ئەندامەکانی جەستە ، واتا جینات هەیە ڕاستەوخۆ دەبێتە هۆی نەخۆشی بەڵام جینات نیە ڕاستەوخۆ مرۆڤ بکات نێرباز یان هاورەگەزباز )

دۆگڵاس ئەبوت دەڵێت :(زۆرێک لەخەلکی وایدەبینن تەنیا جیناتەکانی ی مرۆڤ دەبێتە هۆی دروست بوونی ئەخلاق و رەوشت بەڵام DNA بەوشێوە نیە زۆرجار رەوشتێک و کردارێک دروستەبێت بەهۆی جینات لەگەڵ هۆکار و عاملی ژینگە و سروشت لەگەڵ ئازادای ئارەزووی مرۆڤ ئەمانە پێکەوە دروستیکەن نەک جینات تەنها ...

دەبێتە هۆی xکاتێ سەردێری ڕۆژنامەکان ئەخوێنینەوە دەڵێ جینی ئەمە زیادەرۆیەکی زۆرە کراوە کە خەڵکی سادە باوەری Yکرداری پێدەکات چون جیناتەکان راستەوخۆ نابێتە هۆی رەوشت و کردار بەڵکو جینات کۆدەکان دروستەکات بۆ پرۆتینەکان لەرێگای زنجیرەیەک چالاکی درێژی کیمۆ زیندەیەوە لەکۆتایی ئەم چالاکیە جینەکە کەمێ کاریگەری دەکاتە سەر رەوشت و ئەخلاق بەڵام بازدان و دروسبوونی DNAەوە مرۆڤەکەوە شتێکی تێکەڵ و ئاڵۆز ئەخلاقێک بەهۆی جینی و ناڕاستە )

هەرئەمەش گەشتووە پێی تازەترین لێکۆڵینەوەکان لەبواری سەلماندنی جیناتی هاورەگەزبازی ئەمەش لێکۆڵینەوەیەکە کە بەسەرۆکایەتی "ئاندرێ جانا" کراوە دەرەنجامەکانی ساڵی 2017 بڵاوکراوە لە گۆڤاری "ساینس" بەناوبانگ بۆ گەرانە زانستیەکان ، "جانا" پشتی بەستووە لە لێکۆڵینەوەکەیدا بەفەحسی جینۆمی 473000 مرۆڤ لەئەمریکا وبریتانیا و سووید لەکۆتایدا گەشت بەوەی جینی هاورەگەزبازی بوونی نیە وە جیناتی هاورەگەز بازی وەک هەموو سیما ئەخلاقیەکانی تر وایە کۆمەڵی عاملی ژینگە دروستی ئەکا ، ئەو جینەی کاریگەرە لەم عامل وهۆرکارانەدا کاریگەریەکەی 8% تاکو 25% بۆدروستبوونی هاورەگەزبازی ، رێژەی پاڵنانی کەسەکە بۆ هاوڕەگەزبازی بەهۆی جیناتەکەوە زۆر زۆر کەمە بەڵام بەشە زۆر گەورەکە ژینگەی چواردەور و بارودۆخە کۆمەڵایەتیانەیە کە مرۆڤی لێووە دروستەبیت یان تێیدا دەژی...!

عاملی کۆمەڵایتیەکان

ڕۆژەکانی بوون بەهاورەگەزباز

دکتۆڕەکان دەڵین زۆرینە نەخۆشیە ئەندامیەکان و نەخۆشیە ئەخلاقی و رەوشتیەکانی مرۆڤ پێکهێنەریکی جیناتی هەیە بەڵام بوونی ئەو جینە مانای وانیە مرۆڤەکە توشی کۆمەڵێ کار و کردەوە و رەوشت بکات کە نەتوانێ نەیکات و کۆنترۆڵی خۆی نەکات ، جین لەوانەیە ئەو مرۆڤە توشی سەرەتانی سیەکان یان شەکرە یان ئاڵودەی کحولی ئەکات بەڵام ئەوە مانای وانیە ئیتر دەبێ ئاڵودەی کحول بیت... !!

"دێڤد شێنک " باس لەکاریگەری ژینگە و سروشت دەکات دەڵی هۆکاری گەورەیە بۆ دروست بوونی رەوشت و ئەخلاقی مرۆڤ وە

ژینگە لەسەرووی جیناتەوەیە دەڵێ ( سەرەرای جیناتەکان کە نەخشەیەکی کامڵ و تەواون ، جینات وەک دوگمەکان و دوگمەی کۆنترۆڵکردن لە ستۆدیۆی دەنگ تۆمارکردن وایە ، ئێمە بەشێوەیەکی راستەوخۆ سیفاتەکانمان لە جینەوە وەرناگرین بەڵکو ئیمە پەرەسەندن بە سیفاتەکانمان دەکەین بەڕێگای چالاکی دینامێکی بۆئەوەی کارلێکێک دروست بکەین لەنێوان جینەکە و ژینگەی چواردەوری )

لەپەیوەندی نیوان جیناتەکان و ژینگە ... جیاوازیە جیناتیەکان گرنگە ، بەڵام تەنها جینات خۆی بەس نیە بۆ ئەوەی بزانین کە ئێمە کێین .. ! وە ئەمەش وامان لێکا بلێین بار و دۆخە کۆمەڵایەتیەکان زۆر کاریگەرە بۆ رۆشتن بەئاراستەی هاورەگەزبازی زیاتر لە جینات ... !!

خێزان دەورێکی گەورەی هەیە لەمەدا ، هەنێ لێکۆلینەوەکان ئەلین نەبوونی یەکی لەدایک یان باوک دەبێتە هوکاری بۆ چوون بەرەو هاورەگەزبازی یان دەڵی تەنیا 20% ئەوانەی هاورەگەز بازن لەگەڵ خێزانەکانیان دەژین .. !! لێکۆلینەوەیکی تریش باس لە دەوری باوک دەکات لەرێخستەوەی حەزە جنسیەکانی منالەکانی نزیک 84% هاورگەز بازە نێرەکان دانیان بەوەناوە باوکیان گرنگی پێنەداون و پەروەردەی نەکردوون لەمندالیدا ، واتا تورەیی باوک پەیوەندی هەیە بە هاورەگەزبازی نێرینەوە ! چون نێرانیتە زۆر بە ئاشکراتر بانگبێژی بۆ نێربازی و منالبازی دەکەن بەراورد بە مێیەکان... !

هەروەک هاتووە لەچەن لێکۆلینەوەیەکی یەک بەدواییەک لەسەر گرنگی جنس لەلای هەردوو رەگەز لەساڵی 2016 دا دەڵی: (لەتەنیشت خێزان هاورێ زۆر دەورێکی گرنگی هەیە بەتایبەتی گەر بێتو کەسەکە لەمندالیدا دەستدرێژی سێکسی کرابێتە سەری ، بەڵام قبوڵکردنی کۆمەڵگا بۆ هاورگەز بازی و بانگردنی خەڵک بۆی و ناساندنی بەوەی قەدەریکی حەتمی هەنێ مرۆڤە لە دەزگاکانی راگەیاندن ئەمە گەورەترین دەوری هەیە لە ئاسایی کردنەوەی هاورگەزبازی لای

کۆمەڵگا بەرادەیەک کە مامۆستای زانستی کۆمەڵناسی  ئانی پارتر کاتی شوێنی هەموو لێکۆڵینەوەکان کەوت لەساڵی 1988کە خەملاندنی بۆ ڕێژەی هاورەگەز بازی کردبوو لە ئەمریکا بۆی دەرکەوت ڕێژەکە ئاسای بووە واتا تاساڵی1992  ڕێژەکە زۆر کەم بووە بەڵام دوای ساڵی 1992 وە بەردەوام دووهێندە دەبێت ئەو ساڵەش ئەوەبوو بانگەشەی ڕاگەیاندن بۆ هاورەگەزبازی دەستی پێکرد...!!

## بەشی: سێیەم

**بۆچی هاورەگەزبازی حەزێکی دروستکراوە لەلایەن سیستەمی نوێی جیهانی ئاراستەدەکرێت..؟!**

**باپرسیاریکی تر بکەین لەسەر جینات بەڵام ئەمجارە پرسیارەکەمان گرێدراوە بە لاقەکردنی منالآنەوە ، کوا مافی منداڵیکی ئیغتسابکراو...!؟**

**چەندین بەڵگە هەیە کە منالّبازی رەوشتێکی بۆماوەیی جینیە لای هەندێک مرۆڤ هاوشێوەی نێربازی کەدەڵێن هۆکاری جیناتی هەیە ئەویش .. ! ، کەوایا دەتوانین بڵێین "بێدۆفێلیا"(منداڵبازی) شتێکی سروشتیە بەهۆی بوونی عاملێکی جینیەوە کە دەبێتە هۆی حەزی منالّبازی لا هەندێک مرۆڤ دروستبووە...!؟ تاکو ئەم ساتەش "بێدۆفێلیا" وەک جەریمە مامەڵەی لەگەڵەکرێت لەلایەن یاساکانی جیهانەوە وا وێنادەکریت تەعەدای جنسیە بۆسەر ئازادی منداڵ گەر بێتو منداڵەکە خۆشی رازی ببێت بە پەیوەندیە جنسیەکە هەر بە تاوان هەژمارەکرێت .. ! ، بۆیە ڕازی بوونی منالّەکە ڕەوایەتی پێنادا ، ئەمەش مانای وایە جینات نابێتە پاساویک بۆ ئەوەی ئەخلاقێک جوان بکەین ...! چون جینات بەشێوەیەکی تەواوی بەرپرس نیە لە رەوشت و ئەخلاقی مرۆڤ.. ، وەک چۆن بوونی حەزێک کە پەیوەندی بەجیناتەوە هەیە وەک لە "بێدۆفێلیا" نابێتە پاساوێک بۆ کردنی منالّبازی وەک چۆن ئەم جینە نابێتە پاساوێ کەسی منالّباز ئیتر بەرپرسیار نەبێت بەرامبەر کردەوەی منالّبازی لەکۆمەڵگا.. ! ، بەهەمان شێوە چەندین ئەخلاق و رەوشتی تریش ناتوانرێت تەنها بۆجینات هۆکارەکەی بگەرێنینەوە بڵێن وادەم پەیوەندیەکی جینی هەیە ئەوا تاوان نیە وەک بۆنموونە (کوشتن)**

**نمونەیەکی سادەتر وەرەگرین وەک ئالّودەبون بە مادەکحولیەکانەوە...**

**"پەیمانگای نیشتمانی ئەمریکی بۆ ئاڵودەبوونی مادەکحولیەکان" دەڵێت :**

**( ئاڵودەبوونی بە کحول سیمایەکی ئەخلاقیە کە پەیوەندی هەیە بە جیناتەوە لەگەڵ ئەوەشدا پەیوەندی بە سروشتی ژینگەی چواردەوری مرۆڤەکەوە هەیە ، واتا چواردەوری مرۆڤ وەک کۆمەڵگا و هاوڕێ و خێزان کاریگەری هەیە لەسەر خواردنەوەی کحول )   سەرەرای ئەوی حەزێکی جیناتی هەیە لەبەشێک مرۆڤ بۆ کحول خواردنەوە بەڵام دکتۆری دەروونی بۆ پاراستنی ژیانی نەخۆشی کەسەکی ئاڵوودەبوو دوورکەوتنەوە دا دەنێت لە مادەکحولیەکە نەک تەنها ئەوەش بەڵکو داوای لێکا چی پاڵنەرێکی هەیە بۆ کحول خواردنەوە واز لەوانەش بێنێت ! .. ! ناڵێنت لەبەرەوەی تۆ جیناتت هەڵگری ئەم رەوشتەیە قەینا بخۆرەوە ! لێرەوە دەزانین کۆمەڵگا  رەوشت و ئەخلاقەکان ڕەتەکاتەوە  هەرچەن پێکهێنەرێکی جینیاتیشی هەبێت بەهەر ڕێژەیەکیش بێت.. !   کۆمەڵگا ئەو رەوشتە رەتەکاتەوە و پەکی دەخات لەڕێگای لەناودانی ئەو هۆکارانەی دەبێتە هۆی رەوشتەکە (خواردنەوە) چ لە چواردەومان و ژینگەکەمان ..  چون رێسا ئەخلاقیەکانی کۆمەڵگا لەسەر جینات تەنها نەوەستاوە... !**

**ئەی چی لەسەر ئاژەڵەکان ...؟**

**هەندێک هاورەگەز باز ئەڵێن هاورەگەزبازی بوونی هەیە لەنێوان ئاژەڵەکاندا ، دەڵێ مادەم ئەوان دەیەکەن کەواتا ئاساییە با ئێمەش بیکەین بەڵام ئەوەی ئەوان نایبینن هاورەگەزبازی ئاژەڵ لەئەنجامی پاڵنەری حەز و ویستی جنسیەوە بۆ هەمان جنسی خۆی نیە.. !! وەک چۆن هەندێک مرۆڤ حەزیان لەرەگەزی خۆیانە ، بەڵکو بۆ هەندێ مەبەستی ترە زانایانی ئاژەڵ باسی دەکەن**

**"سێزار ئادێس" مامۆستای زانستی دەرونزانی لەزانکۆی ساوپاولۆ دەڵی :**

(کاتێ دوو نێر یەک دەبینن پەیام زاڵ بوونیان بەو رێگایە دەرەبرن نەک بۆ حەزی جنسی )

هەندیکی تر لەهۆکارەکانی دروستبوونی جنس لای ئاژەڵەکان دەربرینی نێرەکەیە بە زاڵبوونی بەسەر نێرێکی تر و دەربرینی باڵادەستیەتی بەسەر زەویەکی دیاریکراودا و نواندنی خۆیەتی بەرامبەر ئەو مێیانەی بەدوای بەهێزدا دەگەرێن ، هەندێ جار هەستی بۆنی ئاژەڵەکە تێکەچی کە بۆنی ئاژەڵ بەرپرسە لە وەرگرتنی نامە جنسیەکان لەلایەن ئاژەڵەکانی ترەوە بۆ جیاکردنەوەی مێ لەنێر...

"دکتۆر ئەنتۆنیو باردۆ" مامۆستای رەوشتی ئاژەڵی لەزانکۆی ناڤاری ئیسپانی ئەمە شیدەکاتەوە و دەڵی : ( بەراستی هاورەگەز بازی لەنێوان ئاژەڵەکاندا بوونی نیە .. بەهۆی مانەوە و زۆربون ...حەزی جنسی ئاژەڵ هەمووکات بۆ رەگەزی بەرامبەرە ، بەمشێوازەش ناکرێ هیچ حەزیکی هاورگەزی هەبێت لەنێوان ئاژەڵاندا )

لەگەڵ ئەوەشدا کاردانەوەی هەندێک حەزی ئاژەڵ بەتایبەتی زاڵ بوون و باڵادەستی... ئاژەڵەکە دەبا بەرەو هەندێک رەوشتی وەک هاورەگەزبازی بەڵام ئەم رەوشتە ناتوانرێت پێی بوترێت هاورەگەزبازی ئاژەڵان. چون لەبەرجنس نیە !

ئێستاش نموونەیەکی نامۆ باسەکەین ئایا حەزی جنسی خۆی بەتەنها دیاریکەری ئەوشێوازە جنسیە ئاژەڵەکان دەیکەن ؟ یان بارو دۆخە کۆمەڵایەتیەکان دەور و کاریگەری خۆی هەیە لە حەزی جنسی ؟

کۆمەڵی زانا هاتن هەندێک مەیمونیان جیاکردەوە ل لە دایکەکانیان گەورەیان کردن بێ دایک ، کاتێ گەورەبوون مەیموونی مێیان پێیان دا ، مەیمونەکان شۆک بوون و حەپەسابوون هەوڵیان دەدا لەگەڵیان جوتبن بەڵام نەیان دەتوانی ، ئەم تێستە سەلماندنی کە ئەخلاقی جنسی بەشێکی گەورەی لەکاتی پەروەدە و گەورەبووندا دروستەبێت ، پەروەردەکردن لە منداڵیەوە زۆر زۆر گرنگە تەنانەت لای ئاژەڵیش ! حەزی جنسی شتێکی نەگۆر و چەسپاو نیە نەگۆریت ، گەر بشلێین ئاژەڵەکان بەهەمان حەز و ویستی مرۆڤ هاورەگەز بازی دەکەن ئایا ئەمە دەبێتە هۆی ئەوەی بڵین کە هاورەگەزبازی لای مرۆڤ شتێکی ئاسایی و فیتریە ؟

زانایان لەگەڵ ئەم قسەیا نین لەبەر چەن خاڵێک تێیدا ...

غەریزە و حەزەکانی ئاژەڵ نابێتە قیاس و پێوەرێک بۆ غەریزەکانی مرۆڤ ناکرێت بڵین ئەوەی ئاژەڵ ئەیکات سروشتیە.. ! بونموونە هەندێک ئاژەڵ هەندێکی تری ئاژەڵی هەمان رەگەزی خۆی ئەخوا ئایا ئەمە دەکرێ لەسەر مرۆڤ تەتبیق بکرێ و مرۆڤ لە گۆشتی براکەی بخوات ؟ وەک چۆن پشیلە پشیلە بچوکەکان دەکوژێت گەر بێتو بێچووی خۆشی بێت ئەوەش کردارێکی غەریزیە لای پشیلە بەهۆی هەندێک گۆڕانکاری سایکۆلۆجی و ئەندامیەوە ئایا دەکرێ ئەم رەوشتە بۆ مرۆڤ بگوازینەوە ؟! ئەم کۆمەڵە رەوشتە گەر بێتۆ نقلی بکەین بۆ مرۆڤ ئەوا رۆژئاوا زۆر رقی لیەتی و جەنگی دژ ئەکات ..! هەندێک ئاژەڵ زینای مەحرەم ئەکات هەندێکی تر دەسدرێژی ئەکا و زۆربەیان فرەژنیان هەیە ئایا دەکرێ بلین ئەوانە فیترەتیکی سروشتین چون ئاژەڵەکان خاوەنین ؟ ئەی باشە بۆچی رۆژئاوا بۆچی شوێنی فرەژنی ئاژەڵەکان ناکەون هەروەک هاوڕەگەزبازیەکە ..؟! یاساکانی ڕۆژئاوا سنورداری فرەژنی ئەکات سەرەرای ئەوەی ئەوە رەوشتێکە کە ئاژەڵ دەیکات وەک هاورەگەزبازی جگە ئەوەش فرەژنی هەر خۆی

کردارێکی مرۆڤیە و مرۆڤ خۆی فرەژنی ئەنجامداوە بەدرێژایی مێژوو ... !!!!

هەڵەکە لەکوییدایە...؟!

ئەمە حاڵەکەیە کەواتا کۆمەڵی لێکولینەوە کە حەزی هاورەگەز بازی و جینات پێکەوە ناتوانێ گرێ بدات! لەهەوڵدایە بەردەوام بتوانێ گرێیبدات ..!!

راگەیاندنێکی درۆ کە ناونیشانەکان دەگۆرێت و کۆمەڵە ژمارەیەک دەتەقێنرێ بەبێ سەرژمێری ورد و رێک !! بەبێ ئەوەی بڵێن کۆمەڵی هۆکاری کۆمەڵایەتی کاریگەری هەیە لەسەر حەزی هاورەگەزبازی .. !

کۆماڵی ئاژەڵ دەکرێتە بەڵگە بۆ کردنی بۆئەوەی جوانتر نیشانی بەن و رەوایەتی پێبەن چیتر ماوە بیلین بۆ رەوایەتی دان بەو کارە ..؟ ! چیترماوە بۆ قەناعەت هێنان بەمرۆڤی مۆدێرن... !

سیستەمی نوێی جیهانی هەوڵەدات حەزی هاورەگەزبازی بەئارەزووی ئازادی مرۆڤەکە خۆی دروست بێت !! هیچ شتێک و هیچ عواملێکی تر بەکار نەهێنیت !

بەکار هێنانی پاساوی وشەی جینات پاساو نیە بۆ رەوایەتیدان بەم کارانە چون بەم شێوازە دەکەونە ناتەواوی هەڵەیەکی گەورەوە ئەوکات دەبێ رێگاش بە بێدۆفیلیا ! هەردوو بارەکە کەسەکە بەرپرسیارە لەکردنی ئەو رەوشت و ئەخلاقە وە جیناتیکی کیمیای رەها دیاری نەکردووە ئەم رەوشتانە !! مرۆڤ بەردەوام بەرپرسە لەرێکخستنی خۆی و رێنیشاندان و ئاراستەکردنی ئەخلاقەکانی خۆی... ! هەروەها

بەرپرسیاری ئەخلاقیەتی بەرامبەر کومەڵگا هەیە و بەرامبەر ئەو زاتەی کە باشە و چاکەی فێرکردووە بەرامبەری پەروەردگاری خۆی کە دەفەرموێت :

"بل الانسان على نفسه بصيرة  و لو القى معاذيره"

# ٣٣ _ چۆن پارچە کاغەزێک (دۆلار) جیهانی کۆنترۆڵ کرد؟

**چۆن دەجال دەست دەگرێ بەسەر وڵاتەکاندا ...؟**

**چۆن پارچە کاغەزێک (دۆلار) جیهانی کۆنترۆڵ کرد..؟**

**سیناریۆکانی داهاتوو چین بۆ لەناودانی ئابووری جیهان..؟**

کاتێک وڵاتێک قەرزەکان دەبات توانای دانەوەی ئەم قەرزانەی نیە سەدا سەد بۆیە زیاتر نغرۆی فەساد و خراپەکاری دەبێ بۆنموونە وڵاتی مالاوی ئەفریقا لەهەشتاکاندا لەلێواری کەوتندا بوو داوای یارمەتی کرد لەنەختێنەی نێوو دەوڵەتی ، نەختێنە یارمەتی دا بەکۆمەڵی مەرج یەکێ لەوانە ئەوەبوو کەنابێت دەوڵەتی مالاوی پەینی کشتوکاڵی بدا بە جوتیاران ، جوتیارەکانیش بۆخۆیان نەیان توانی بیکرن لەکۆتایدا برسێتیەکی زۆر زۆر بڵاوبووەوە بووە هۆی مردنێکی زۆر لەو وڵاتە یەکێکی تر لەو مەرجە سەیرانە سەپێنراوە سەر وڵاتی ئوردندا ئەویش پرۆژەیەکی هەبوو ئوردن بۆ دانانی بەنداویک لەسەر رووباری ئووردن ، داوای قەرزیکرد لە نەختێنە بۆ بەنداوەکە ، قەرزەکەیان پێدا بەمەرجی ئەوەی ئیسرائیل دەبێ رازی بێت لەدروستکردنی بەنداوەکە ئووردن مەرجەکەی قبووڵ نەکرد و قەرزەکەیان پێ نەدا !!

پێشتر لە ستۆریەکدا وتمان پلانی 2030 سعوودیە چیە ؟ کرانەوەی سعوودیە بۆ خو و رەوشتی ئیمپریالیزمی ! هەمان شت کە خرتچۆف و ستالین تورە کردبوو ! سەرسام بوون بە سەقافەت رۆژئاوا ! جل و بەرگی ئیمپریالیزمی ! لەکۆتایشدا بەهۆی زاڵ بوونی دۆلارەوە خرچۆف نەک تەنها سەقافەتی ئیمپریالیزمی بەسەر وڵاتەکەی سەپا بەڵکو سیستەمی ئیمپریالیزمیشی بەسەر ڕووسا جی بەجێ بوو ! بۆیە ڕۆژئاوا سەقافەت و خو رەوشتی خۆی زاڵ دەکات بەهۆی هێزی سەربازی و ئابووری و ئیعلامەوە ! دەیکاتە مەرجیش بۆ

خۆشگوزەرانی وڵات ! گەر دەتەوێ نەوتەکەت بڕوات دەبێ بکرێیتەوە بەرووی ڕۆژئاوا! بۆیە " نیوم " و چەندین پرۆژەی دیکە دێتەبوون !

" نیوم "پرۆژەکانی بن سلمانە بۆ ساڵی 2030 شارێکی گەورە و چەندین شتی ترە کە شارستانیەتی سعوودیەی پێ دەگۆرێت

کەواتە هێشتە لات وایەکۆنترۆڵی ئەم بانکانە لەلای حکومەتەکانە !! نەختێنەی نێوودەوڵەتی لە 188 وڵاتی ئەندام پێکهاتووە ئەم وڵاتانە مافی دەنگدانیان هەیە بەڵام بەشیان کەمە ! بۆنموونە ئەمریکا لە 17.6% بەشی لە نەختێنەی نێودەوڵەتی ، بۆیە تاکە وڵاتە توانای بەکار هێنانی ڤیتۆی هەیە لەنەختێنەی نێوودەوڵەتیدا ( پێشتر باسمان کردووە دەسەڵاتی بانکی ئەمریکی لەلای کێیە ) ! کاتێ وڵاتێکی داوای قەرز دەکات ئەوان مەرجی زۆر قورسی بۆدانین زۆرجار مەرجەکان زۆر قورسن وەک پێدانی کانزانکان وڵاتەکەی بەکۆمپانیا بیانێکان و دەسهەڵگرتنی دەوڵەت لەدەعمی کاڵاکان بۆ هاونیشتمانەکانی لەکۆتایدا قەرزەکە چونکە ریبای لەسەرە چەن هێندە زیادەکات و دەسەڵاتی خراپ و گەندەڵیش کانزاکان وڵاتی بەدیاری دەدات بەو کۆمپانیانە ، قەرزەکانیش لەوەبەرهێنان بۆگیرفانی خۆی خەرجدەکات پارەکانیش دەخاتە بانەکەکان سویسرا و بانکی فیدارڵی ئەمریکیەوە ، لەئەنجامی ئەمەشدا فەقیری و بێکاریەکی زۆر بڵاوەدەکات لەکۆتایشدا وڵاتەکە ئیفلاسدەکات و هەرئەمەش ڕوویدا لەوڵاتی ئەرجەنتین !

ئەرجەنتین لەماوەی جەنگی جیهانی یەکەم و پێشتریش لانکەیەک بوو بۆ ئاوارە ئەورووپیەکان و دەوڵەمەندترین وڵاتی ئەمریکای لاتینی بوو زۆرترین گەشەی ئابووری بەرێژەی 6% بوو لەساڵی 1914 دا یەکێک بوو لەوڵاتە دەوڵەمەندەکانی جیهان ئابووریەکەی زیاتر بوو لەفەرنسا ئەڵمانیا و ئیتاڵیا هەتاوەکوو ئەوکاتە ئینقلابی سەربازی تێیدا ڕوویدا لەلایەن جەنەراڵ خۆرخی فیدڵ لەساڵی 1975 دا ئەمریکا پشتیوانی کرد وەک چۆن پشتیوانی هەموو ئینقلابێک دەکات

لەبەرژەوەندی خۆی لەم کودەتا 300 هەزار کەس مرد و تێکچوون توشی وڵات بوو ئابووری لەلێواری کەوتن بوو دواتر ئەرجەنتین بەرە بەرە بەرەو تیاچون چوو بەهۆی قەرزکردنی لە نەختێنە "کێس هارمان" نوسەر و ڕۆژنامە نوسی بەریتانی کتێبێکی هەیە بەناونیشانی ( ئەرجەنتین شۆرشێک لەلێواری قەیرانێکی جیهانیدا) لەم کتێبە روونی دەکاتەوە چۆن ئەرجەنتین ئیفلاسی کرد بەهۆی کوودەتایەک بە پشتیوانی ئەمریکا خۆرخی ئەو مەرجانەی بەجێ گەیاند نەختێنە داینابوو کە سامانەکانی وڵاتی دایە دەس کۆمپانیا بیانیەکان و باجی لەسەر کۆمپانیاکان هەڵگرت بۆ هاتنە ناوەوە هەتا وای لێهات ڕێژەی هەڵاوسانی ئەرجەنین لەساڵی 1989 گەشتە 1000% ، قەرزی دەرەکی ئەرجەنتین لە 8 ملیار دۆلارەوە بازیدا بۆ 43 ملیار دۆلار

لەساڵی 1999 دا "فێرناندۆ دیلار" سەرۆکایەتی گرتە دەست لەوکاتە ئەرجەنتین نغرۆ بوو لە قەرزی دەرەکی بەبری114 ملیار دۆلار ئەم سەرۆکەش دوبارە دەستی کرد بە قەرز وەرگرتن لە نەختێنە ساڵی 2000 قەرزەکان گەشت بە 147 ملیار دۆلار ، کۆتا شتێک بیکات ئەم سەرۆکە چی بێت ؟! ڕۆشت داوای قەرزی تری کرد لە نەختێنە بە بری 37 ملیار پاشان لەساڵی 2001 و خۆی و وەزیری دارایی بە فرۆکەیە تایبەت ڕایان کرد لەتاو ئیفلاسی ، یەک مانگ دواتر راگەینرا ئەرجەنتین ئیفلاسی هێناوە و توانای داناوەی قەرزەکانی نیە ئەرجەنتین لە دەوڵەمەندترین وڵاتەوە بۆ گەندڵ و فەقیرترین وڵات ، ئێستا حاڵی حازر تۆ سەیری ئەم پۆستە دەکەیت ئەرجەنتین یەکێکە لەو وڵاتانە خاوەنی زۆرترین قەرزە لەنەختێنە نێودەوڵەتی هەمان شتیش بەسەر یۆنان هات لەساڵی 2020 کە ئیفلاس بوونی خۆی ڕاگەیاند و توانای دانەوەی قەرزاکانی نیە کە90 ملیار دۆلارە دەئەوەندە چووەتە سەری ! هەموو ئەمانە بەهۆی ریباوە بوو ئەو قەرزەی ئەمرۆ ملیاری دۆلار ئەبیەی دووساڵ تر دەبێ دەملیار دۆلار بدەیەوە ، بۆچی ئەم قەرزانە وڵات توشی کاول بوون دەکات ؟؟ ئەی ئەم هەموو قەرزانە بۆکوێ دەروا ؟؟

**وڵامەکە لەلای "پێنی لۆپی کۆچیانۆیە" ئەویش مامۆستای ئابووری زانکۆ و سەرۆکی ئابووری بانکی نێودەڵەتی بوو لە ساڵی 2020 بەڵام لە پوستەکەی کشاوە ، چونکە سێرچ و بەحسێکی چل پەرەیی کرد لەسەر ئەو وڵاتانە قەرز دەکەن چەن پارە دێتە ژوورەوە و چەن دەڕواتە دەرەوە بەحسەکەی زۆر توشی شۆکی کرد کەزانی ئەو سەرۆکانە لەوکاتە ئەو پارە وەردەگرن وەک قەرز بانکەکان لەسویسرا و لۆکسم بۆرگ و هۆڵەندا هێندەی پارە قەرزەکە دەچێتە سەری**

**ئەم بانکانە مافیاکان و گەندەڵەکان و سەرۆکەکان پارەکانیان تێیدا دادەنێن کەواتا قەرزدەکەن و لەبانکەکانی ئەوروپا دای دەنێن و هەتا ئەوروپا ئاوەدانبێەوە !!! لەسەر حسابی وڵاتانی دیکەی جیهان ! پینیلۆپی ئەم داتایانە پیشانی ئەو بەرپرسانەی بانکی نێودەوڵەتیدا بۆئەوەی پیشانی گەلەکانی بدەن سەرۆکەکانیان کێین ! بەڵام بەحسەکەی ڕەتکراوە و بڵاونەکراوە بۆیە دەسی لەکارکێشاوە بەڵام ئێستا ئەم بەحسە بەردەستە لەزانکۆی" کۆپن هاگنی دانیمارکی " کەواتا بۆچی ئەم بانکانە ئەم پارە ملیارانە دەدەنە ئەم سەرۆکانە دەزانن گەندەڵن و دەیدزن وڵامەکەی لەکتێبێ ( دانپیانانە بکوژەکانی ئابووریدا ) هەیە لەلایەن" جۆم بێرکسەوە" نوسراوە کەباسی ئەوە دەکات چۆن ئەمریکا و ڕێخراوە بانکی و ئابووریەکانی کۆنترۆڵی گەلان دەکەن و داهاتوویان تێکدەدەن بەتایبەتی وڵاتە هەژار و گەندەڵەکان جۆن دەڵێ پیلانەکە ئەوەیە یەکەم قەناعەت پێکردنی وڵاتەکەیە بەبردنی قەرزیکی گەورە ! لەبانکی نێودەوڵەتی یان نەختێنە دواتر سەپاندنی مەرجە توندەکان لەسەری دواتر خنکاندنی وڵاتەکە لەقەرز و ڕیباکانی کە ساڵ لەدوای ساڵ زیادەکات زۆر بەزۆری داهاتی وڵات بۆ قەرزەکە دەروات و هیجی نامێنی بۆ پرۆژە و شتەکانی کە دوایش ئیفلاس دەکات وڵاتەکە ئیتر ئاسانە کۆنترۆڵکردنی و ئاراستەکردنی بەهەرشێوەیەک بتەوێت !!**

**100ساڵ پێش ئێستا لینین لەکتێبەکەیدا بەناوی ( ئیمپریالیزم کۆتا قۆناغی سەرمایەداری ) پێنج سیفاتی ئابووری ئیمپریالیزمی خستوەتە روو ئەوانیش :**

**1- دروستکردنی کۆمپانیا قۆرخاکارەکان لەلایەن سەرانی ئیمپریالیزم و دەسگرتنیان بەسەر بازاری جیهاندا**

**2 - دەسگرتنی سەرمایەدارەکان بەسەر پیشەسازی و بانکەکاندا و دروستبوونی سەرمایەکانیان لەسەر پیشەسازی و بانک وەک وتمان لەڕێگای دەسەڵاتدارانی جێنیشی خۆیان !**

**3 - بەدەست هێنانی پارە بەهۆی هەناردەکردنی کاڵاکانەوە بۆ وڵاتانی داگیرکراو و بردنی داهاتەکانیان لەرێگای دەسەڵاتدارەکانیان**

**4 - دابەشکردنی ئابووری جیهان لەنێوان کۆمپانیا قۆرغکارەکان ، دابەشکردنی خێر و بێری وڵاتانی داگیرکراو**

**5 - دابەشکردنی زەویەکانی جیهان و دووبارە ڕێخستنەوەیان گەڕانەوەیان بۆ ژێر هەیمەنەی خاوەن نفوزەکانیان ، خاڵی پێنجەم ئابووری نیە بەتەواوی بەڵکو سیاسەتی جەنگیە بۆ دابەشکردنەوەی جیهان ...**

**بەپێی تێروانینی لینین بێت ئێمە لەکۆتا قۆناغی پیلانگێری ئیمپریالیزمی داین ئێستا !!**

# ٣٤ _ چۆن دەجال لەڕێگای سعوودیەوە توانی دەست بەسەر جیهاندا بگرێت؟

# چۆن سعوودیە بوو بەفریادڕەسی سیستەمی دەجال؟

دەتوانی دۆلار لەهەموو جێگایە ببینی ! بووە بە بەهای جیهانی مۆدێرن ! بەڕادەیە بووە ئارامی دەروونی بۆ کۆمەڵگای مۆدێرن ! هێمای دەوڵەمەندی و بەهێزی !دۆلار نیشانەی ئیمپریالیزمی ئەمریکی ، نیکسونی سەرۆکی ئەمریکا دەڵی هێزی دراو هێزی ئابووری وڵات دیاری دەکات ، کاتێ دۆلار دەپژمێت ! جیهان سەرمای دەبێت !

دۆلار پێویستی نیە بەڵکو حەزە ، کاتێ خۆپیشاندانێک دەکرێ ئاڵاکان دەسوتێنریت ! پەنجەرەکان دەشکێ ! کەسەکان دەکوژرێ ! پاسەپۆرت و کارتی نیشتمانیەکان دەسوتێنریت بەڵام نابینی کەسێک دۆلاری بسوتێنی!

لەکاتی ڕاگەیاندنی سەربەخۆی ئەمریکا لەساڵی 1776 دا لەوکاتەدا بەریتانیەکان ڕەتیانکردەوە واز لە ئەو زەویانە بێنن لەئەمریکا داگیرکرابوو بۆیە ئەمریکا توشی شەڕ هات و پێویستیەکی زۆری بەپارە هەبوو بۆدابین کردنی خەرجی شەڕ سەرکردەکانی ئەمریکا دراوی کاغەزیان داهێنا بەشێوەی سەرەکی نەبوو لەوکاتەدا ، ساڵی 1787 دا ئەمریکا جەنگەکەی بردەوە و جۆرج واشنتۆن بوو بە یەکەمین سەرۆکی ئەمریکا وێنەکەی لەسەر دراوی کاغەزی یەک دۆلاری هەیە ، جۆرج وشنتۆن ئەلێکساندەر هامیلتۆنی کردە بەڕێوبەری خەزێنەی ئەمریکا وێنەی ئەم کەسەش لەسەر دراوی کاغەزی دەدۆلاری هەیە هامیلتۆن دەیویست بانکێکی ناوەندی فیدارڵی دروستکات بروای وابوو ئەمە دەبێتە هۆی گەشەی پیشەسازی و بازرگانی بەڵام تۆماس جێفرسۆنی وەزیر ئەم بیرۆکەی ڕەتکردەوە

وێنەی جێفرسۆن لەسەر دراوی کاغەزی دوو دۆلاری هەیە جێفرسۆن لای وابوو ئەم بانکە پێویست نیە چون پێی وابوو ئەمریکا خاکەکەی کشتوکاڵیە جێفرسۆن پێی وابوو ئەم بانکە وڵاتەکە بەرەو تەمەڵی و سستی دەبا ، جێفرسۆن زۆر لەوە دەترسا کۆمەڵێ سەرمایەداری چاوچنۆکی خراپەکار ببنە خاوەنی بانکی ناوەندی لەساڵی 1791 دا ئەوەی کە جێفرسۆن لێی دەترسا ڕوویدا ! بۆیە بانکی ناوەندی ئەمریکا لەژێر دەوڵەت نیە بەڵکو لەلایەن کۆمپانیاکان و خاوەن پشکەکانەوە بەڕێیووە دەبرێت پێشتریش باسمان لەوەکردبوو کێین ئەم کۆمپانیایانە !!

دۆلاری ئەمریکی  لەساڵی 1792 پشتی پێ بەسترا وەک دراوێکی فەرمی  ئەمریکا ئەوکاتە سێ جۆر دراوی  کانزایی هەبوو ئاڵتون و زیو و مس بەم شێوازە ئەم سێجۆرە هەتا ساڵی 1862 بەردەوام بوو و بەهۆی هەڵگیرسانی جەنگی نێوخۆ لەنێوان باکوو و باشوور و پێویستی حکومەتی ناوەندی بە زێر وزیووەکان دراوە کانزەیەکان بەتەواوی گۆرا بەکاغەز لەوکاتەدا دۆلار تەنها وەک کاغەزی متمانە بوو لەنێوان حکومەت و خەڵکدا ، لەواقعدا بەهای نەبوو ، بەڵام ئەو دراوانەی هێمای ئاڵتونی لەسەر کرابوون دەتوانی بەهێندەی نرخەکەی ئاڵتون بەدەست بێنێت ( هێمایەکی ئاڵتون لەسەر دۆلارەکە بوو ) دواتر نرخی دراوی کاغەزی بەرامبەر ئاڵتون دەکرا بۆ ڕاگترنی سەنگەکەی لەوکاتەشدا کۆنگرێسی ئەمریکی فەرزی کرد لەسەر خەڵک مامەڵە بەدۆلاروە واتا نێوان خەڵک و حوکومەت بە دۆلاڕ بوو مامەڵەکان ...

لەساڵی 1879 دوای دروست بوونی هەڵاواسانێکی گەورە لە ئەمەریکا دۆلاری ئەمریکی بەشێکی زۆری بەهاکەی لەدەستدا دووبارە دۆلار بەئاڵتون  بەرامبەرکراوە و خەڵکی دەیتوانی دۆلارەکان بگۆرنەوە ئاڵتون هەرکات بیانویستایە بۆیە هەڵاوسانەکە کەم بووەوە ..

لەساڵی 1929دا قەیرانێکی ئابووری زۆر گەورە ڕوویدا ئەمەش وای لە ڕۆزفلت کرد دۆلار بە زێڕ هەڵوەشێنێتەوە بەم شێوازە بەردەوام بوو لەداکەوتن و بەرزبوونەوەی بەهای دۆلار هەتا رێکەوتنی بریتن ۆودس پێش جەنگی جیهانی یەکەم جەنگێکی دراوی هەبوو لەنێو وڵاتانی ئەوروپا بەڵام دوای جەنگەکە هەموویان نرخیان لەدەست دا جگە دۆلار چون دووربوو لە ناوجەرگەی جەنگەکەوە بنەکەی لە ئەمریکا بوو پێش ساڵێک لە کۆتای جەنگی جیهانی دووهەم ئەمریکا پلانی سیستەمێکی ئابووری جیهانی دانا کەتێیدا دولار و ئەمریکا لەسەرەوەی هەرەمەکە بن ! ئەمەشی لەرێگەی بریتن ۆدسەوە ئەنجامدا لەساڵی 1944 کە 44 وڵات بەشدار بوو تێیدا لەوکەشدا ئەو وڵاتانە ئەیان ناڵاند بەدەست نەهامەتیەکان جەنگی جیهانی دووەمەوە ،( پێشتر ئێمە باسمان کردبوو چۆن لۆبیەکانی پیلانگێری رۆژئاوا پیلانی ئەم جەنگەیان دانابوو ) وتمان بۆ دووهۆکاربوو :

یەکەم لاوازکردنی ئەوروپا و سۆڤیەت بوو لەڕووی سەربازی و ئابووریەوە و سیاسیەوە

لەڕووی ئابوویەوە داکەوتنی دراوەکانیان بوو (وەک فرانکی فەرەنسی ..هتد) بەهێزبوونی دۆلار بەهۆی ئەوەی ئەوروپا لەماوەی ئەو دووجەنگە هەموو پێداوستیەکانی لەئەمڕیکا دەکری بەمەش دۆلار زاڵتر بوو تەبعەن هۆکاری تر

دووەم : بەهێزبوونی ئەمریکا لەڕووی سەربازی و ئابووری و سیاسیەوە

لەڕێگا بەهێزەکان بۆ زاڵبوونی وڵاتێ سیستەمی ئابووریە ، بۆئەمریکاش دۆلار باشترین چەک بوو کردی بە براگەورەی جیهان

لەرێگای ئەم کۆنگرەوە ئەمریکا قەناعەتی بەو 44 وڵاتەکرد کە ئەمریکا بەهێزترینە لەرووی سەربازی و ئابووریەووە وە هەروەها هێمنترین وڵاتە بەهۆی هەڵکەوتەی جوگرافی و تەماح تێنەبرینی کەس بۆ داگیرکردنی ، پێشنیاری ئەوەی کرد بۆ وڵاتەکان دراووەکەیان بەرامبەری دۆلار بکەن چون دۆلا جێگیرە بەمەش دۆلار بوو بە مەرجەعی سەرەکی بۆ دیاریکردنی گۆرینەوەی دراوەکان بۆنموونە دینار بگۆڕیتە تومەن هەردووکیان بەرامبەر دۆلار دەکرێن بۆ زانینی بەهاکەیان پاشان دەگوڕدرێنەوە ، بیرکەنەوە ئەمریکا خۆی تەنها سێ چارەکی زێری یەدەگی جیهانی هەبوو لەوکاتە ( چونکە هەموو وڵاتانی کۆنگرە بریتن ودس ڕازی بوون زێری یەدەگیان بدەنە ئەمریکا ئەویش کاغەزی سەوزیا پێدا ) بەڵام ئەمریکا پەیمانی بەوڵاتانی بریتن ۆودس دابوو بەدۆلار کاریان دەکرد کە زەمانەتی ئەوە دەکات هەرکات ویستیان بەنرخێکی جێگر دۆلارەکەیان بۆدەکاتەوە بە زێر نرخەکەش 35$ بۆ هەر ئۆنسەیە زێر واتا 28گرام ، یانی هەرکەس 35دۆلار ببا بۆ بانکی ناوەندی ئەمریکا 28 گرام زێری پێدەدەرێت، ئەمریکا خۆی ئیلتزام کرد و پەیمانیدا بە پشتگیری لە هەر دۆلارێک بە زێر چ ناوەوەی وڵاتی خۆی بێ دۆلاڕەکە چ دەرەوەی ، ئەمەش نرخی دراوەکانی دیکەی بەرامبەر دۆلار جێگیرکرد .

ئەمریکا دیسان پەیمانی بە وڵاتەکانی کۆنگرەی بریتن ۆدس دا کە دۆلار هەتا کاتێ دروست دەکات کە زێری هەبێت بەرامبەری ، واتا کەزێر نەما دولار چاپ ناکات , لێرەشەوە دۆلار بوو بە تاکە دراوێ کە بەزێر بەرامبەر بکرێت و دراوەکانی دیکە هەموویان شکستیان هێنا چونکە توشی هەڵاوسان دەهاتن ! ، یەکەمین وڵاتانێکیش کەوتنە گومانەوە و ڕەخنەیان هەبوو لەم پلانە ئەمڕیکیە بۆ کۆنترۆڵی ئابووری جیهان ئەوروپابوو ، ئەمریکیەکان بەڵێنی پانزە ملیار دۆلاریان بەستالین دابوو بۆ ئاوەدانکردنەوەی وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی ئەوروپا کە لە ژێر دەستیدا بوون گەربێتو بێدەنگ بێت لەسەر بوونی دۆلار بە دراوێکی جیهانی ، ستالین ڕازیبوو ، ئەوروپیەکانیش جگە ئەمریکا هیچیان بۆ نەماوە و لێرەشەوە دۆلار بوو بە جیهانی وڵاتانیش لەباتی

زێر دەستیان دایە کۆکردنەوەی دۆلاری ئەمریکی لە گەنجینەکانیان چون هەرکاتیک بیانەوی دەتوانن بیگۆرنەوە بە زێر بەپێی ڕێکەوتنامەی بریتن ۆودس لێرەشەوە ولآتان دۆلاریان وەک یەدەگی ئاڵۆگۆری دەرەکی هەڵدەگرد بۆماوەی یانزە ساڵ ئەم پیلانە ئەمریکی بەردەوام بوو هەتا جەنگی ڤێتنام و نیکسۆن شۆک

لەساڵی **1955**دائەمریکا دەستی کرد بەجەنگی ڤێتنام پێی وابوو بەماوەیەکی کورت دەباتەوە کۆتایی دێت بەڵام بیست ساڵی خایاند ئەمریکا توشی داڕمانێکی زۆر گەورە کرد لەئابووریەکەیدا ، بۆیە پێویستی بە دۆلارێکی زۆر زیاتر بوو بۆ خەرجی شەڕەکەی لەگەڵ ڤیتنام ، چونکە ئەمریکا پەیمانی دابوو کە دۆلار هەتا کاتێک چاپدەکات زێر هەبی بەرامبەری بکات چونکە زێری دوونیا مەحدوود و سنورداره و ئەمریکاش دۆلاری دەوێ بۆ خەرجی جەنگی ڤێتنام بۆیە ئەمریکا سنورەکانی بەزاند و دۆلاری زیادەی چاپدەکرد بەرامبەری زێری نەدەکرد چون هەموو زێرەکان بەرامبەر دۆلار کرابوو پێشتر و زێر نەمابووەوە بۆیە بەنهێنی بۆ خەرجی شەڕەکەی چاپی دۆلاری دەکرد ئەمەش بووە هۆی داڕمانێکی گەورەی جیهانی و بووە هۆی کۆمەڵە ڕووداووێک کە جیهانیان گۆڕی ...

لە سەرەوە باسی ئەوەمان کرد لەڕێکەوتنامەی "بریتن ۆودس" ولآتان ڕازی بوون بەکردنی دۆلار بەدراوی جیهانی لەبەرامبەر پێدانی زێڕدا ، ئەمە واتا ئەوەی جیهان زێرە یەدەگەکانی خۆی بەئەمریکا دەدا بۆچی ؟ بۆپێدانی کاغەزێکی سەوز هیچ بەهایەکی نیە ! یەکەم ولآتیش هەستی بەمەکرد فەرەنسا بوو لێرەشەوە قەیرانەکەسەری هەڵدا کاتێک

"چارڵ دیگرڵ " سەرۆکی فەرەنسا لەساڵی **1970**دا داوای کرد هەموو دۆلارەکان لەبانکی ناوەندنی فەرەنسی کە**191**ملیۆن دۆلار بوو بکرێتەوە بەزێر تەبعەن بەپێی ڕێکەوتنی " بریتن ووۆدس " ئەمە شتێکی ئاسایە بەڵام ئەمریکا رەتی کردەوە چونکە ئەو برە زێرەی لەبەردەستدا نەبوو بەهوێ جەنگی ڤێتنامەوە هەمووی سەرفکردبوو

تەنانەت ئەوەندە مایەپووچ بوو دۆلاری چاپ دەکرد بەبێ ئەوەی بەرامبەری زێری بکات بۆیە وڵاتانی دیکەش متمانەکەیان بەدۆلار لەدەستدا و داوایان کرد ئەمریکا راستگۆبێ لەگەڵ پەیمانەکەی ( کە بریتیبوو لەگۆرینەوەی دۆلار بەزێر هەرکاتی وڵاتەکان ویستیان )

بۆیە دۆلار بوو بەکێشەیە بۆ ئەو وڵاتانەی کریبوویان و دەستی کرد بە دابەزین و لەدەستدانی بەهاکەی و ئەمەش بووە هۆی قەیرانیکی ئابووری بۆ ئەمریکا ، هەروەها زۆرینەی خەڵکی ئەمریکاش متمانەیان بە دۆلار نەما چوونە پێش بانەکەکان بۆ گۆرینەوەی دۆلار بەزێر ئەمەش بووە هۆی هەم هەمەو و ئەزمەیەک ، لەساڵی 1971 " نیکسۆن" سەرۆکی ئەمریکا بریاریکی دا هەرکەس قاڵبێکی زێری هەبێت لەماڵەوە دەساڵ زیندانی دەکرێ ، ئەم هەنگاوە بۆ برینی پێی هەرکەسێ بوو بیەوی دۆلار بکاتەوە زێر ، کورتهێنانەکانی ئەمریکا تا دێت زیاتر دەبوو بۆگۆرینی دۆلار بۆ زێر بەهۆی جەنگی ڤێتنامەوە هەتا کۆتا سات وای لە "رێتچار نێکسۆن " کرد بەیانامەیەکی مێژوویی بڵاوکاتەوە لەساڵی 1973 دا کەئەمەبوو :

وەزیری گەنجینە "کۆناڵیم" بینی پێم وت بەشێوەیەکی کاتی بوەستی لە گۆرینی دۆلار بۆ زێر ئەمەش دەبێتە هۆی جێگری دۆلار ...

واتا دۆلاری هیچ وڵات و کەسێک ناکەینەوە بە زێر !!!

بەبڕیاریکی تاک لایەنانە ئەمریکا هەموو بریارەکانی گۆڕینەوەی دۆلاری بۆ زێری هەڵوەشاندەوە ئەمە کاردانەوەیەکی گەورەی بەدوای خۆی جێهێشت لەجیهاندا کە بە " نیکسون شۆک" ناسرا بۆچی شۆک ؟ چوون وڵاتەکان دەیان زانی کاغەز هیچە و بێ بەهایە بەڵام بەهۆی بەهێز ئەمریکاوە متمانەیان پێکرد کاغەزیان بەسەر زێردا هەڵبژارد

لێرەوە ئاشکرابوو کاغەز هەر کاغەزە ! بەڵام ماڵ وێرانیەکە بۆ ئەو وڵاتانە بوو هەموو یەدەگی زێریان خستە پێش ئەمریکا و گۆڕیانەوە بە دۆلار و ناشتوانن وازی لێبێنن چونکە هەموو ئەوەی هەیانە دۆلارە !

دواتر نرخی زێر ئازاد بوو و جێگیری نەما و خواست و خستنە ڕوو نرخی زێری دیاری دەکرد نەک دۆلار ! کاغەزەکانیش بوون بە وەهمێک لەلای وڵاتەکان و هیج نرخێکیان نەما بەناچاری تەنها حوکمەتەکان کاریان پێکرد ! بۆیە لەساڵی 1973 بەدواوە چل هێندە نرخی دۆلار دابەزی لەکاتێ نرخی زێر زۆر بەرزەوە بوو ، لێرەدا ئەمریکا و ڕۆژئاوا شکستیان هێنا و داتەپی ئابووریان بۆیە ئەمریکا پیلانێکی شەیتانی دیکەی بەکار هێنا بۆ پاڵپشتکردنی دۆلار ئەویش ئاڵوتنێک بوو بەڕەنگێکی دیکە بەڕەنگی ڕەش! نەوت ! دروستکردنی پترۆ دۆلار ! بۆئەمەش" هێنری کێسنجەری " وەزیری دەرەوەی ئەمریکا لە ساڵی 1974 سەردانی مەلیک فەیسەڵی پاشای سعوودیەی کرد بەهۆی ئەوەی گەورەترین وڵاتی بەرهەم هێنی پترۆڵ سعوودیەیە !! کێسنجەر گەڕاوە بۆ ئەمریکا بەڕێکەوتنێکی مێژوویی کە لەدووخاڵی سەرەکی پێک هاتبوو :

یەکەم : سعوودیە پترۆڵەکەی بە دۆلار تەنها دەفرۆشێت ، واتا هەر وڵاتێ دەیەوێ پترۆڵ بکرێ لە سعوودیە دەبێ دۆلاری پێبا و هەیبی و سعوودیە قەناعەت بە وڵاتانی ئۆپێک بکات بەفرۆشتنی پترۆڵیان تەنها بەدۆلار لێرەشەوە دەستەواژەی پترۆ دۆلار سەریهەڵدا (نەوت بەدۆلار !)

خاڵی دووهەم : ئەو دۆلارانەی سعوودیە وەریدەگری لەوڵاتان لەبەرامبەر نەوتەکەی لە بانکی ناوەندی ئەمریکا هەڵیدەگرێ بۆ بووژانەوەی ئابووری ئەمریکا ! ، لەبەرامبەردا سعوودیە چی دەسەکەوی ؟ پاراستن و پشتیوانی ئەمریکا لەکێ ؟ لەبنەماڵەی ئال سعوود بۆ مانەوەیان لەدەسەڵات !!

پێچەوانەی سیستەمی دۆلار بەئاڵتون کە ئەمریکا ناچار بوو بە پەیداکردنی ئاڵتون بۆهەر دۆلاری چاپیکات پترۆدۆلار رەوایەتی داوە ئەمریکا چەن دۆلار چاپدەکات بیکات چون سعوودیە سامانێکی نەزانراوی نەوت لەژێر خاکەکەیدایە بەسە بۆئەوەی ئەمریکا و دۆلارەکەی بکاتە فیرعەونێک بەسەرووی جیهانەوە !!! لێرشەوە دەپرسن باشە بۆچی وڵاتانی بەرهەمهێنی نەوت وازناهێنن لەفرۆشتنی نەوت بە دۆلار و گۆرینی بە دراوێکی دیکە لەوڵامدا دەڵێین : ئوستول و کەشتیە جەنگیەکانی ئەمریکا لە دەریاکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستن چونکە ئەوانە بۆ سەفرە و سیاحە نەهاتون بۆیە هێزی سەربازیە هێزی ئابووری ڕادەگرێ ...

بۆنموونە کاتێ "مەلیک فەیسەڵ" بریاری دا بە کەمکردنەوەی نەوت و پترۆڵ بۆ ئەمریکا لە ساڵی 1975 دا ئیغتیال کرا لەلایەن کوڕە مامەکەیەوە ، ئەوەش بووە وانەیەک بۆ هەموو وڵاتانی ئۆپیک کە دۆلار هەر تاکە دراوی فرۆشتنی نەوتە لێرەشەوە پێویست نەما دۆلار بەرامبەر بە ئاڵتون چون سعوودیە و ئال سعوود وەک فریاد ڕەس باڵی پیلانگێری ڕۆژئاوا و ئیبلیسیان ڕاگرت لە کەوتنێکی دیکە ! دۆلاریان کردە بتێک مرۆڤایەتی بیپەرستێ ! تەنانەت چین و ڕووسیا و وڵاتانی دژکاری سیستەمی ئابووری ئەمریکاشیان ناچار کرد سەر دانەوێنن بۆ دۆلا و بانکی ناوەندی ئەمریکا !!!! بۆیە ئاڵتون داکەوت و دۆلار بەرزبووە ! !! ئال سعوود لەهێنری کێسنجەر و سەرۆکی ئەمریکا دڵسۆزتر بوو بۆ پیلاگێری ڕۆژئاوا و رۆتچێلد و ڕۆکفلیر بۆ داگیرکردنی ئابووری جیهان !

هەمووی بەلایەک ! ئەوانەش بەلایە تر دەڵێن ئال سعوود و سەرانی دەسەڵاتداری ڕۆژهەڵاتی ناوین کاربەدەستی موسڵمانن !! ئەوەیە سەردەمی دەجال و کۆتا زەمان کاتێک کە درۆزن راستگۆیە و ڕاستگۆش درۆزن !! بەهەرحاڵ..

کاتێ سەدام ڕازی نەبوو نەوتی عێراق بەدۆلار بفرۆشرێ و ویستی نەوت بە یۆرۆ بفرۆشێ لەساڵی 2000 دا ئەمریکا بریاریدا حکومەتەکەی برۆخێنیت بە بیانوی چەکی کۆمەڵکوژ لەکاتێکدا نەشیان دۆزیەوە !!! ، هەمان شتیش بەقەزافی کرا کاتێ ویستی دراوێکی ئەفریقی دروستکا بۆ فرۆشتنی پترۆڵی لیبیا هەمووشمان دەزانین چی لەقەزافیکرا هەمان شتیش بەئێران دەکرێ کە دەیەوێ نەوتەکەی بە دراوی چینی بفرۆشێ بۆ ڕووخانی پترۆ دۆلار !!!

کۆمەڵە دەسەڵات داریک و سەرمایەدارێک دەیانەوێ سیستەمی ئابووری ئەمریکی ببێتە سیسەمی ئابووری جیهانی بۆ ئەوەی دۆلار بکەن بەخوایەک هەموو تاکێک سەجدەی بۆببا هەتا لەپێناوی چنگ خستنی دۆلار خەڵکی هەموو شتێک بکات ! ئامانجی هەموو گۆی زەوی چیە ؟ خۆشگوزەرانیە ! خۆشگوزەرانیش بەدۆلارە ! بەکاغەزێکە ! ئەم کاغەزەش ئاگاداربە لای ئیبلیسە ! خۆی نەخشی کردووە و هێماشی بۆ داناوە ! هەر خۆشی دەزانی بەکێی دەدات و بەکێی نادات !

# ٣٥ _ مرۆڤ وێلی خۆشبەختیە

◈ئینسان بۆ گەیشتن بە خۆشبەختی و ئاسوودەیی سەر بە هەموو کون و کەلەبەرێکدا دەکات, ئەنواع و ئەشکال تەمرین و خولی گەشەکردنی بەشەری و یۆگا و مێگا تاقی دەکاتەوە, تاوەکو ئیش گەیشتە تورەگە...

لە ناو تورەگەیەک خۆت گرێ بدە بۆ ماوەی سەعاتێک , بزانە چەند ئاسودە دەبیت, بەڵام چۆن ئەم تەمرینە دەکەی؟!!

◈لە دوای ڤیدیۆکانی پۆڕ.ن , زۆرترین بابەت کە بینەری زۆربێ ئەوانەن کە باسی بەختەوەری و خۆشبەختی دەکەن, چونکە زۆربەی خەڵکی جیهان لە نەقسی بەختەوەری و خۆشبەختی دەژین...

◈ئەمەش کاسبیەکی باشی ڕەخساندووە بۆ کۆمەڵێک کەس کە خۆیان وەک (چارەساز) ناساندووە و پارەیەکی باش بە خەڵکی بەردەدەنەوە مقابلی ئەوەی بەختەوەریان دەکەن , هەندێک لەو تاجیرانە لە ڕێگای دینەوە و بە ناو ڕوقیە و موقیە و نوشتە و جن و قسەی بریق و باقی بەناو دینی ئاسودەیی دەفرۆشن و هەندێکی تریش لە ڕێگەی غەیری دینی , لە ڕێی یۆگا و مێگا و تورەگە و تەنمیە و خول و مول و جەلسەی میدیتەیشن و بەرزکردنەوەی خود نائاگا و یاسای ڕاکێشان و ووزەی شاراوە ئاسودەیی دەفرۆشن, لە هەردوو حاڵەت کڕیار زۆرن , چونکە خەڵکانێکی زۆر لە دیندار و بێ دین عەوداڵی ئاسودەیی و خۆشبەختین...

◈بەڵام لە ڕاستیدا چارەسەکان وەکو بەنج, هەمووی کاتین و بۆ ماوەیەک ئیش دەکەن و دواتر دیسان مرۆڤەکە دادەوەشێتەوە و وەحدەی ئاسودەیی و خۆشبەختی نامێنێ و بە دوای عیلاجێکی تر دەگەڕێت...

◈لە ڕاستیدا ئەگەر لەو خەیاڵات و قسەی کتێبانە بێینە دەرەوە و بێینە واقع دەبینی شتێک نیە بە ناوی بەختەوەری و خۆشبەختی, هەر خۆی ئەم دونیایە بە شێوەیەک دیزاین کراوە کە پڕە لە خەم و خەفەت , تا عاقڵتر بی خەفەتت زیاترە , مرۆڤی عاقڵ یان ئەوانەی بیردەکەنەوە هەست بەوە دەکەن , بۆیە زۆربەی ئەوانەی عاقڵن و زۆربیردەکەنەوە حەز دەکەن لەم دونیایە دەرچن..

◈لە مقابلدا دڵخۆشترین کەس گێلترین کەسە لەم دونیایە (دوور لە ڕوی خوێنەر) , تەقەی سەری دێ و چێژ لە هەموو شتێ دەبینێ , مەسەلەن کاتێ پڵنگێک بە دوای ئاسکێک دەکەوێ ئەگەر بیگرێ یان نەیگرێ کەسە عاقڵەکە پێی ناخۆشە , ئەگەر بیگرێ دەڵێ ئاسکەکە مرد و ژیانی کۆتایی هات و ئەگەر نەیگرێ پڵینگەکە و بێچووەکانی بە برسێتی سەردەنێنەوە , بەڵام گێلەکە لە هەردوو حاڵەت هەر چێژ دەبینێ و دونیا شامی شەریفە , هەزارەها نمونەی تر ڕۆژانە دەبیستین و دەبینین عاقڵەکە پێی ناخۆشە و گێلەکەش چێژی لێ دەبینێ..

ئەو هەموو تەعەدا و زوڵم و کوشتن و بڕین و دزی و فێڵ و چەواشەکاری و ناعەدالەتیەی لەو دونیایە دەیبینین و دەیبیستین کاریگەری نەرێنێ لە دەرونمان دروست دەکات و بە چونە ناو تورەگە حەل نابێ..

✧جگە لەمەش کۆمەڵێ پرسیاری جەوهەری لە مێشکی کەسە عاقڵەکە دێ و دەچێ کە (من چیم و بۆچی هاتوومەتە دونیا و بۆ کوێ دەچم و بۆچی من مرۆڤم و مشک نیم و چ ئیشێکیان بە منە کە

دروستیان کردووم و لە مقابلی چی ئەو عەقڵە و ئەو هەموو خەدەماتەم پێشکەش کراوە و زۆر پرسیاری تر) , ئەم پرسیارانەش دیسان ناخ و دەرون قەلەق دەکەن دەکەن و بە چونە ناو تورەگە حەل نابێ..

**حەل چییە؟**

لە ڕاستیدا دونیا وەکو تونێلێک وایە کۆتاییەکەی دیار نیە , وە لە ناو ئەو تونێلەش انواع و اشکال ناعەدالەتی و زوڵم و ستەم هەیە. بۆ ئەوەی ئاسوودە بیت , دەبێ کەسێک گرەنتی دوو خاڵت بداتێ و لەو دوو خاڵە دڵنیات بکاتەوە:

١_ دەبێ دڵنیات بکاتەوە لە کۆتایی ئەو تونێلە چی هەیە و ئەو خەڵکە لە ناو ئەو تونێلە بەرەو چ ئاڕاستەیەک دەڕۆن.

٢_ دەبێ دڵنیات بکاتەوە مەحکەمەیەکی گەورە لە کۆتایی تونێلەکە هەیە و حسابی هەموو زوڵم و ناعەدالەتی و دزی و گەندەڵیەکان دەکرێت.

هەریەک لەم دوو خاڵەت نەبوو بە حەیاتی ئاسوودە نابی , نەک تورەگە, بچیە ناو شەش بەتانی و شەش خولی میدیتەیشن ببینی هەر ئاسودە و دڵنیا نیت.

دیقەت بدە ( أَلَا بِذِكْرِ اللَّهِ تَطْمَئِنُّ الْقُلُوبُ ) چەند گەورەیە!

بەڵام زۆرینە لێی بێئاگایە.

